ژياننامەی

# بديع الزمان
# سەعيدی نورسيی






ئامادەکردنی
حبيب محمد سعيد



سۆز
کتێبخانەی

بسم الله الرحمن الرحيم

ژیان نامەی

# بدیع الزمان

## سەعیدی نوورسیی

# ژیاننامەی

# بدیع الزمان

# سەعیدی نوورسیی

حبیب محمد سعید

سـۆز
کتێبخـانەی

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب بەکوردی: | ژیان‌نامەی بدیع الزمان سەعیدی نوورسیی |
| ناوی ئامادەکـــار: | حبیب محمد سعید |
| چاپ و بڵاوکردنەوەی: | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر |
| خــــــەت: | نـەوزاد کۆیـی |
| بــــــەرگ: | خەباب حبیب ، امین مخلص |
| نۆرە و ساڵی چــاپ: | ۲۰۱۲ز–دووەم ۱٤۳۲ک |
| تــیـــــراژ: | ۲۰۰۰ دانە |

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی
کوردستان (۲۳۱۰) ساڵی(۲۰۰۸) ز پێدراوە

نووسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەی و ڕاگەیاندن
هەولێر ـ شەقامی دادگا ـ ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

Mob: 00964 750 460 51 22
Tel: +964 750 25 18 138
tafseeroffice@yahoo.com

کتێبخانەی سۆز
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی ـ شەقامی صابوونکەران ـ
بازاڕی گۆیژە

# پێشکەش

## پێشکەش بێت :

* بەو موسڵمانە بەرێزانەی، کە لە سەر رێبازی قورئان و سوننەت بناغەی ئیمان دائەرێژن تا دینەکەیان بگەیەنن، بە مرۆڤایەتیی و، لە سەرگەردانیی قیامەت رزگاریان بێت ..

* بەو مرۆڤە وردانەی، کە بە راستیی بە شوێن رێبازی بەختەوەریی ئادەمیزاددا ئەگەرێن تا دەستیان بکەوێ و بە پاکیی شوێنی بکەون و لە سزای دۆزەخ رزگار بن ..

# پێشەکی

ألحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على سيد المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين .

چەند ساڵێك لەمەوبەر و لە ساڵی ١٩٨٨ ز دا، کە بەرامبەرە لەگەڵ ١٤٠٩ ی کۆچییدا ، چمکێك لە ژیانی مامۆستا سەعیدی نوورسییمان ، بە زمانی کوردیی خستە بەردەستی خوێنەرانی ئازیز ، بەو هیوایەی، کە شتێك لە رەنج و تەقالا و هەوڵ و کۆشش و غیرەت و جیهاد و ، سزا و ئازاری ژیانی ئەو بەرێزە کۆڵنەدەرە شارەزا بین .. وا ئێستەش نیازمان وەهایە ـ بە پشتیوانیی خوای گەورە ـ جارێکی تر بەو باسەدا بچینەوە و ، هەندێ بابەتی بۆ زیاد بکەین ، بەو هیوایەی، کە باسەکە رێك و پێكتر ببێ ، هەرچەندە ئێمە شیاوی ئەو کارە مەزنە نین ، بەلاّم وەك پێشیینە وتوویانە : ( دیاریی شوان یا شنگە ، یا هاڵەکووك ) داوا ئەکەین لە خوێنەری ئازیز چاوپۆشیی لە کەم وکورتییمان بکات و لە دوعای خێر بێ بەشمان نەکات ، چونکە هەرچەندە کار و هەڵس و کەوتمان ناتەواو و پڕ لەکە بن، إنشاءالله لەگەڵ دینە پاکەکەمان‌دا فێڵ ناکەین و ، خوای گەورەش هەموو لایەکمان لە لادان و سەرگەردانیی بپارێزێ ..

لە راستییدا مامۆستا سەعیدی نوورسیی وەك زانایەکی پایەبەرزی جیهانی ئیسلامییە و ، مایەی فەخر و شانازییە بۆ هەموو موسڵمانێك و ، بە نووسینەکانی و مێژووی ژیانی پڕ فەر و بەرەکەت و ، بە ئیمان و بە تەقوای کەڵك بە هەموو موسڵمانێك ئەگەیەنن ، هەروەها زانایەکی ناوداری خاکی کوردانە و، پێویستە ئێمەی کوردزوبان لە هەموو موسڵمانێکی تر زیاتر کەڵك لە مامۆستای ئازیز وەربگرین ، چونکە هەق وابوو ئێمە پێش هەموو گەلێکی تر رۆڵی گرنگی ئەم بەرێزە، و خزمەتی ناوازەی شارەزا بین و ، دوای ئەوەش بە گەلانی تری موسڵمان و گەلانی جیهانی بناسێنین ..

بەڵام بە داخەوە گەلی کورد هێشتا ئەم پیاوەی نەناسیوە و ، مافی خۆی پێ نەداوە و ، وەك پێویستیش کەڵکی لە بەرهەمەکانی وەرنەگرتووە .. هەتا لەناو تورکیاش‌دا کوردەکان ئەوەندەی تورکەکان نەیان‌ناسیوە و شەیدای ڕێبازەکەی نەبوون، هەر ئەم خاڵە بۆتە هۆی ئەوەی، کە کوردستانی تورکیا لە ڕۆشنبیرییدا دوا بکەوێ و تێگەیشتنی دینییشی کەمتر بێ و ، درەنگ‌تریش واز لە شوێن کەوتنی مرۆڤە بێ کەڵکەکان بهێنێ ..

گەلی کوردی عێراقیش ، چەندین ساڵە پەیامەکانی نووری بە عەرەبیی و بە کوردیی پێشکەش کراون ، بەڵام، چونکە لە پەراوێزی کاری ئیسلامییدا ژیاوە ، بە پێی پێویست کەڵکی لەو سەرچاوە زوڵاڵە وەرنەگرتووە و ، بگرە سڵی لێ کردۆتەوە و ، ترساوە ئەگەر دوای بیروبۆچوونی ( بدیع الزمان ) بکەوێت ، نەخشەی کاری ئیسلامی لێ تێك بچێت !!

بۆیە ئێمەش ، وێڕای ناتەواویی و کەم وکوریی زۆرمان ، هاوار ئەکەینە دڵسۆزانی دینەکەمان و پێیان ئەڵێین :

مەردی خوا بن ئەمەیە ڕێباز .. ئەمەیە مایەی سەربەرزیی موسڵمانان ..

ئەمەیە ئەو نەخشەیەی، کە بەرزیی و بڵندیی بۆ دنیا و قیامەتی موسڵمانان ئەگێڕێتەوە

مەردی خوا بن ئیتر بەسیەتی کەم ئاسنی سارد بکوتن .. هەندێ کار و بۆچوون هەن بە کەڵکی شوێن کەوتن نایەن و ، هەتا دانیشن ڕانەکەتان دوور ئەکەوێتەوە .. نەخشەی کاری خزمەت‌کردنی قورئان و ئیمان بەم پیاوە مەردە سپێرراوە .. ئەویش پاڵەوانانە تەمەنی تەرخان کردووە بۆ ئەنجام‌دانی ئەو خزمەتە و، دەستی لە هەموو خۆشییەکی ژیان هەڵ گرتووە ، تا خوا ڕازیی بکات و ، خزمەتەکە بە ڕێك و پێك ترین شێوە پێشکەش بە مرۆڤەکان بکات ، بەو هیوایەی ئادەمیزادێك لە گڕ و بڵێسەی دۆزەخ ڕزگار بێت .. هەروەها قوتابییە دلێرەکانی بەوپەڕی غیرەتەوە

قۆڵیان لێ هەڵماڵیی و بوونە کۆمەکیی مامۆستای بەغیرەت و، شان بە شانی ئەو، بەبێ وچان و ، بەبێ سڵکردنەوە لە هیچ هەرەشە و گورەشەیەکی ناحەزانی ئیمان، دەستیان دایە خزمەتی پەیامەکانی نوور ، تا ئیمان بە دانیشتوانی هەموو گوند و شارێکی ولاتەکەیان بگەیەنن .. دوای کۆچی دوایی مامۆستاش هەر بەو غیرەتەوە قۆڵیان لێ هەڵماڵیی تا ئەو هیدایەتە خواییە بە گەلە جۆر بەجۆرەکانی جیهان بگەیەنن .. لە هەموو ولاتێکدا خوای گەورە کەسانی لێ هاتوویشی گەیاندووە تا پەیامەکان وەربگێرنە سەر زمانەکەیان، بەڵام هێشتا وەك پێویست مامۆستا و پەیامەکانی نەناسراون و ، مرۆڤایەتیی کەڵکی لەم قوتابخانە مەزنەی وەر نەگرتووە، بۆیە مرۆڤەکان سەرگەردان بوون و، گیرۆدەی ژیان و گوزەرانێکی تاڵ بوون و ، شوێن هەر ڕێبازێك ئەکەون ، لە ڕێبازی پێشوو زیاتر مایەی نیگەرانیی و نارەحەتییە بۆیان .. چونکە ئەو ڕێبازانە دوور لە هیدایەتی قورئانەوە نەخشەیان بۆ کێشراوە، بەڵام بۆ دڵخۆشیی موسڵمانان و ، پڕبوونی دڵیان لە متمانە بۆ شوێنکەوتنی قورئان ، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بەڵێنی پێ داون، کە خوای گەورە بۆ هەموو چەرخ و سەردەمێك کەسانێکی لێهاتووی خاوەن تەقوای هەڵگری زانستی ڕاستەقینەی قورئان ئەنێرێت ، هەتا کاروباری دینی خوا نوێ بکەنەوە و ، ببنە چاوساغی خواناسان و لە شەوەزەنگی نەفامیی و ، قوڕ و لیتەی سەرگەردانیی دەربازیان بکەن ، کە فەرموویە :

« إن الله يبعثُ لهذهِ الأُمَّةِ على رأسِ كُلِّ مائةِ سنةٍ مَن يجدِّدُ لها أمر دينِها » .
رواه أبوداود والحاكم وصححه ، والبيهقي .

هیوادارم خوای گەورە تەوفیقی هەڵگرانی بانگەوازەکەی بدات ، تا بە ڕێك و پێکیی و بە پێی نەخشەی ئیمامە پایەدارەکان دینی خوا بڵاو بکەنەوە ، بە ئاواتی ئەوەی ژیانێکی ئاسوودە بۆ مرۆڤ لەم دنیادا بەدیی بێت و ، دڵسۆزانی ڕێی خواناسییش سەربەرزی قیامەت بن . ئامین .

نووسەر

سلێمانی ـ ماميارە ٢٤ / ٨ / ١٤٢٧ ك ١٧ / ٩ / ٢٠٠٦ ز

## بەشی یەکەم

# لەدایك بوون و پێگەیشتنی

***یەکەم : لە دایک بوونی***

موسڵمانەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا یەکجار لاواز بوو بـوون، و لـە هـەموو بوارێکی ژیاندا خەریك بوو، بەجێ ئەمان و ، دوژمنانی دەرەوەش ، واتە گەلانی خۆرئاوا ، چاویان بریببووە خاك و ئاو و بەروبوومی وڵاتانیان و ، دەمێکیش بوو، لە هەلێك ئەگەران تا دەوڵەتی عوثمانیی بە لاواز ببینن و ، بە هەموویانەوە ئـەو نەرەشێرە بخەن و وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی بە سەر خۆیاندا دابەش بکەن ..

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا موسڵمانان هێز و پێزێکی ئەوتۆیان نەمابوو .. ناوچەکانیان لە خوێندن و نووسین بێ بەش بوون، و گـەلانی تـریش رۆژ بـە رۆژ بەرەو پێشەوە ئەچوون .. موسڵمانە دڵسۆزەکان ئەیانزانیی جیهانی ئیسلامیی روو بە رووی چ مەترسییەکی مێژوویی بۆتەوە ، بۆیە بەوپـەری دڵسـۆزییەوە چـاویان بریببووە ئاسمان و ، لە خوا پارانەوە تا رابەرێکی دڵسۆزی دەست و دەم پاکیان بۆ پێ بگەیەنێ ، تا بە بیری تیژی و هەستی پاکی جیهانی ئیسلامیی لە لافاویی بێ باوەریی و ئیلحاد و خوانەناسـیی رزگـار بکـات و لـە داو و تەڵەکـەی دوژمنـە سەرسەختەکان دەربازیان بکات ..

بەڵێ خوای بەسۆز و شەفەقەت هاتە هانای موسڵمانان و ، بۆ بەرزکردنـەوەی ئاڵای تەوحید دوعاکەی گیرا کردن .. ئەوەبوو لە دامێنی کێوە گەردن کەشەکانی کوردستانی تورکیادا [1] ، کە هەمیشە بە بەفر داپۆشراون و لووتیان لە ئاسمانی شین گیر کردووە ، لەگەڵ بەرەبەیاندا ، لـەناو بنەماڵەیـەکی کوردزوبـانی خوانـاسدا کۆرپەیەك هاتە دنیاوە

بـەڵێ ، ئـازیزان ! لـە گونـدی (( نـوورس )) ، کـە دێهـاتێکی پەخشـداریی (( ئیسپاریت )) ی سەر بە قەزای (( خیزان )) ی سەر بە پارێزگای (( بەدلیس )) ە، لە ساڵی ( ١٢٩٤ ) ك ، بەرامبـەر بـە ( ١٨٧٧ ) ز دا ، مامۆسـتا سـەعیدی نوورسیی هاتە دنیاوە [2]

ئەم کۆرپە ئازیزە لە خێزانێکی ژیان و گوزەران مام ناوەندییدا لە دایك بـوو ، کە خەریکی کشتوکاڵ و پەروەردەکردنی ئاژەڵ بوون ..

باوکی ناوی میرزا بوو، و لەبەر تەقوا و خواناسیی نازناوی صۆفی میرزای لـێ نرا بوو .. بە کشتوکاڵ و ئاژەڵ داریی ماڵ و منداڵی بەخێو ئەکرد و ، بـە هـیچ شێوەیەك لە حەرام نزیك نەئەکەوتەوە ..

دایکیشی ناوی نووریە بوو، و ئەویش یەکجار خواناس بوو ، بە رادەیەك، کە هەتا دەستنوێژی نەبوایە شیری بە منداڵەکانی نەئەدا .. دیارە ئەمەش یەکێ بوو، لەو نیعمەتە زۆرانەی، کە خوا بە مامۆستا سەعیدی بەخشیی بوو .

---

[1] لە سەردەمی خەلافەتی دەوڵەتی عوثمانیی پایەداردا ناوچەی کوردەواریی، کە لە خۆرهەڵاتی تورکیادا بوو، بە (( کوردستان )) ناو ئەبرا ، کەچیی، کە دەوڵەتی عوثمانیی ڕووخا و سەردەمی کۆماریی هاتە بەرەوە ، وشەی کورد و کوردستان یاساغ بوون و ، کوردستان ناو نرا (( ویلایەتەکانی خۆرهەڵات )) .

[2] كليات رسائل النور ، المجلد التاسع ، سيرة ذاتية تأليف بديع الزمان سعيدالنورسي : ٣٥ ، سعيد النورسي ، رجل القدر في حياة أمة ، تأليف أورخان محمد علي : ٨ .

لە بنەرەتدا خێزانەکەیان لە ویلایەتی ئیسپارتەوە هاتووە ، کە پارێزگایەکە لە خۆرئاوای تورکیاوە و ، بە رەچەڵەکیش ئەگەڕێنەوە سەر ئال و بەیت .. لە سەری باوکیەوە بە سەردارمان ئیمام حەسەن و ، لە سەری دایکیشیەوە ئەگاتەوە بە سەردارمان ئیمام حوسەین خوا لێیان رازیی بێ .

کاتێك، کە ئەم کوڕپە خۆشەویستە هاتە دنیاوە ، دوو خوشکی هەبوون بە ناوی ( دریـة ) و ( خانم ) و ، برایەکیشی هەبوو بە ناوی ( عبـدالله ) . پاشان دوای لەدایك بوونی ئەو ( محمد ) و ( عبدالمجید ) و ( مرجان ) یش لە دایك بوون .[٣]

کۆرپەی بەختەوەر بەرە بەرە گەورە ئەبوو و ، سەرنجی دەوروبەری ئەدا رەوشتی جوان و رێك و پێك لە خێزانی خواناسەوە فێر ئەبوو ، وەك رەوشتی هەموو منداڵێك زۆر حەزی لە پرسیارکردن بوو، بۆ شارەزابوونی هەر شتێ، کە بە جوانیی لێی تێ نەگات ، دایك و باوکیشی بە ئارامیێکی زۆرەوە وەڵامی پرسیارەکانیان ئەدایەوە

شەوێکیان سەعید لە گوندەکەدا دەنگ و هەرایەکی زۆر بەرزی بەرگوێ کەوت .. دانیشتوان هەوڵیان ئەدا بە هەموو شێوەیەك گاڵە و هاوار بە دەف و تەنەکە لێدان بەرپا بکەن، ئەویش رای کرد بۆ لای دایکی تا بزانێ ئەم گاڵە و هاوارە بۆ چیی بەرپا ئەکرێت، دایکی دەستی بۆ مانگ راکێشا، کە گیرا بوو، و وتی : ئەژدیها مانگی قووت داوە و ، دانیشتوانیش ئەو هەرایە بۆ ترساندنی ئەژدیهاکە و رزگارکردنی مانگ بەرپا ئەکەن .

سەعیدە بچکۆل بەم وەڵامە دڵی ئاوی نەخواردەوە ، چونکە مانگ دیار بوو ، ئەگەرچیی بە کزییش بوایە ، بۆیە بە رەخنەوە دەری بریی، کە مانگ هێشتا

[٣] سيرة ذاتية : ٣٥ ـ ٣٦ ، رجل القدر : ٨

دیارە .. دایکیشی ناچار بوو بڵێ : ئەژدیهای ئاسمان وەك شوشە روونە و ئێمە ئەتوانین مانگ لەناو سکیا ببینین ..

بەڵێ سەعید بێ دەنگ بوو، بەڵام قەناعەتی نەکرد و ، ئەمە هەر لە دڵیا بوو، تا رۆژێك هاتە بەرەوە و دەستی دایە وەرگرتنی زانست و ، تێ گەیشت، کە ئەوە راستییەکی زانستییە ، بەڵام کەوتۆتە دەست عەوام و کراوە بە باسێکی پڕوپووچ، وەك لە لەمعەی چواردەهەمدا باسی کردووە

هەر بە منداڵیی پێی خۆش بوو، لەگەڵ پیاواندا دابنیشێ و گوێ لە وت و وێژیان بگرێت .[٤] بە تایبەتیی کۆری خوێندەوارانی گوندەکەی، کە لە شەوە دوور و درێژەکانی زستاندا لە ماڵی باوکیدا کۆ ئەبوونەوە، هەر بەو منداڵییە هەموو جارێك پرسیارێکی خنجیلانە بە بیریدا ئەهات ، کە دوایی خۆی ئەیگێرایەوە و ئەی وت :

( جارێکیان لە کاتی منداڵییمدا ، لە ئەندێشەی خۆمم پرسیی :

« کام لەم دوانەت بەلاوە باشترە ؟ بەسەربردنی تەمەنێکی پڕ بەختەوەریی، کە هەزار هەزار ساڵ بخایەنێ ، لەگەڵ دەسەڵات داریی و خۆشیی دنیادا بەڵام بە نەمان و نەبوون ( العدم ) کۆتایی پێ بێت .. یان بە هەمیشەیی بژینیتەوە لەگەڵ ژیانێکی ئاسایی سەخت و پڕ لە مەینەتیدا ؟ » .

---

[٤] خوا پێداو بوو، وا تەمەنی منداڵیی و یاریکردن و خۆخلافاندنی نەبوو، بەڵکو ڕاستەوخۆ پیاوانە بیری ئەکردەوە، هەتا ئەوەبوو، لە تەمەنی منداڵییدا بڕوانامەی زانایەتیی وەرگرت و ، هاوشانیی گەورەترین زانای ئەکرد، وەك بڵێی کاری زۆر گەورە و گرنگ وا لە ئەستۆیدا و ، درەنگیەتی تا فریای ئەنجام دانی بکەوێت .. جا چونکە خەم و خەفەتی هیدایەتی جیهانی ئیسلامیی ، بگرە مرۆڤایەتیی بە تێکڕا، لەسەر شانی بوو ، پێویست بوو، بەبێ وەستان و بەبێ خەریك بوون، بە کاری دنیاوە ، هەوڵ بدات ، چونکە هەتا شەپۆلی ئیلحاد زۆر و بە گوڕم ئەبوو ، پلەی ئیمانیی و تێ گەیشتنی ئەمیش لە زیادکردن دا بوو ..

سەیرم کرد حەز لە دووهەم ئەکات و بێزاریی لە یەکەم دەرئەبڕێت و ئـەڵێت :
« من ( نەبوون ) م ناوێت، بەڵکو مانەوەم ئەوێ با لە دۆزەخیش‌دا بێت » ! ) .[٥]

هەر بەو منداڵییە بیری لە ژیان و مردن کردۆتەوە ، سەرنجی بوون، و نـەبوونی داوە، کە ئەو بابەتە گرفتی فەیلەسووفەکان بووە، لە هەمان کات‌دا ئەوەشمان بۆ دەرئەکەوێ، کە حەزکردن لە مانەوەی هــەتا هــەتایی و ، ژیــان بەســەربردن بــە نەمریی لە قووڵایی دڵ و دەروونی مرۆڤ‌دا رەگی داکوتاوە و ، گرنگترین ئاوات و ئارەزووی دڵیەتی، بۆیە هەر بیروباوەڕێك بتوانێ ئەو گرێیەی بۆ بکاتــەوە ئـەوە شیاوی شوێن کەوتنە ..

بەڵێ ، مامۆستا هەر بە منداڵیی حەزی لە سەربەرزیی و جوامێریی بوو، و بە هیچ شێوەیەك چارەی ستەم و زوڵم و سەرشۆڕیی و ژێرچەپۆکیی نەئەویست ..

ئەم رەوشتە موسڵمانانە رۆژ بە رۆژ تیایــدا بــەهێز ئـەبوو ، بــە هــۆی ئـەو هێـزە مەعنەوییەوە، کە لە ئیسلامی بێ گەردی وەرئەگرت ، تا، کە بووە پیاوی ناو پیاوان ، بەڵکو سەرکردەی پیاوان ، ئەم رەوشتە لە هەموو هــەڵس و کەوتێکیــدا رەنگــی ئەدایەوە ، بە تایبەت کاتی بە یەك‌گەیشتنی بە کاربەدەست و لێ پرسراوان ..

---

[٥] کلیات الرسائل النور ، المجلد الرابع ، الشعاعات : ٢٧٧ ـ ٢٨٧ ، سیرة ذاتیة : ٤٠

## دووهەم : خوێندن و پێگەیشتنی

مامۆستا نوورسیی، کە باسی دەرس خوێندنی خۆی ئەکات ، سوێند ئەخوات، کە یەکەم دەرسێك کاری کردبێتە سەر رۆحی و هەمیشە هەر لە یادی بوو بێت ئامۆژگارییەکانی دایکی خوا لێ خۆش بوویەتی، کە وەك تۆو لە قولایی فیترەتیا جێگیر بوون و ، لە ماوەی هەشتا ساڵی تەمەنیا لای هەشتا هەزار کەس دەرسی خوێندووە و ، لەلای یەقینە، کە هەموو ئەو دەرسانە لەسەر ئەو تۆوانە بینا کراون، بەو مانایە کە دەرس و ئامۆژگارییەکانی دایکی لە ساڵی یەکەمی تەمەنیا کاریگەریی تەواویان لە سەر رۆحی و فیترەتی هەبووە و ، تۆوی بنچینەیی ئەو حەقیقەتە مەزنانە بوون، کە دوایی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا بۆی دەرئەکەوتن .[٦]

مەلا عەبدولڵای برا گەورەی چەند ساڵێك لەوە و پێش لە دەرەوەی گوندی نوورس دەستی دابوویە زانستە شەرعییەکان و مەگەر لە رۆژانی جومعەدا بگەرایەتەوە ماڵەوە

سەعیدە بچکۆلیش لە ساڵی ١٨٨٥ ز دا سەرەتای خوێندنی لە قوتابخانەی گوندی ( طاغ ) ، کە لە نوورسەوە نزیك بوو ، لەسەر دەستی مامۆستا موحەممەد ئەفەندیی دەست پێکرد .. هەر کە کاکە مەلای لە جومعەدا ئەگەرایەوە ماڵەوە لای ئەویش هەندێ دەرسی ئەخوێند .. بەڵام ئەوەبوو لەو حوجرەیە زۆر نەمایەوە، بەڵکو لەگەڵ قوتابییەکدا شەریان کرد و ئەویش خوێندنی بەجێ هێشت و گەرایەوە ماڵ و ، تەنها دەرسی حەفتانەی لای مەلا عەبدولڵا ئەخوێند .. ئا لەم کاتەدا مامۆستا نوورسیی لە حاڵەتێکی رۆحیی وەهادا بووە، کە بە مەلا عەبدولڵای برای زۆر دڵ خۆش ئەبێت و ، بە چاوی رێزەوە تەماشای ئەکات ، وا بە

---

[٦] اللمعات : ٣٠٩

هەوڵ و کۆششی خۆی پێشی هاوەڵانی گوندەکەی داوەتەوە و ، بۆتە خاوەنی کۆمەڵە زانستێك و ، ئەوانیش خوێندن و نووسین نازانن، هەر ئەمەش بوو پاڵی پێوە نا هەتا دەست بەرداری خوێندن نەبێت ..[٧]

دوای ماوەیەکی کەم چوو بۆ خوێندن بۆ گوندی ( پیرمس ) تا لە ژێر چاودێریی مامۆستا نوور موحەممەددا دەرس بخوێنێ . پاشان چوو بۆ ( مراعی شیخان ) و ، پاشانیش بۆ گوندی ( نوورشین ) و ، دواتریش بۆ گوندی ( خیزان ) ..

ئەوەبوو لە گوندی پیرمس قوتابیی لاسار وازیان لێ نەهێنا .. چوار قوتابیی لە دژی سەعیدە بچکۆل یەکیان گرت و شەریان پێ ئەفرۆشت . لە ئەنجامدا ناچار بوو لای مامۆستا نوور موحەممەد شکات بکات و بڵێت :

ـ مامۆستا گیان ! تکات لێ ئەکەم بەو چوار قوتابییە بڵێی، کە بە هەر چواریان گەلە کۆمەم لێ نەکەن ، بەڵکو با دوو دوو بێن بە گژمدا

مامۆستا ئەم وتە ئازایانەی ئەم قوتابییە بچکۆلەی پێ خۆش بوو ، بۆیە پێی وت :

ـ تۆ قوتابیی خۆمی ! لەبەر ئەمە رێگا نادەم هیچ کەس رێت پێ بگرێت . ئیتر لەو رۆژەوە ( سەعیدە بچکۆل ) ناو نرا بە ( قوتابیی مامۆستا ) .[٨]

دوای ماوەیەك رۆیشت بۆ نوورشین بۆ لای مەلا عەبدوڵلای برای .

جا هەر چەندە سەعیدە بچکۆل لە قوتابخانەی پیرمسدا زۆر نەمایەوە ، بەڵام ئەم ماوە کەمە بەس بوو، تا سەرنجی مامۆستاکەی راکێشێ و بەوپەری رێز و سەرسورمانەوە سەیری بکا ، چونکە لە راستییدا لە هەموو لایەنێکەوە

---

[٧] سيرة ذاتية : ٤٣

[٨] سيرة ذاتية : ٤٣ ـ ٤٤ ، رجل القدر : ١٠

قوتابییەکی ناوازە بوو .. لە رەوشتیا ، لە ئازایەتییا ، لە زیرەکیی و زانینیدا بۆیە مامۆستاکەی بریاری دا سەرێك لە دایك و باوکی ئەم منالە ، کە لە هەموو شتێكدا سەیر و جیاوازە ، بدات و پرسیاریان لیّ بکات ئەم منالەیان چۆن پەروەردە کردووە و چۆن بەم شێوەیە پێیان گەیاندووە ؟

ماوەی نێوان قوتابخانە و دێی (( نوورس )) پێویستیی بە شەش حەوت سەعات رێگا بریین بوو، بە پیّ و بە ناو چیا سەختەکاندا ، بەلام سەعیدی بچووك بە رادەیەك کاری کردبووە سەر دلّی مامۆستا ، بریاری دا ئەم هەموو ماندوێتییە بخاتە بەر خۆی و چەند پیاوێکی گوندەکەی و ، بە پیّ خۆیان بگەیەننە (( نوورس ))

گەیشتنە بەرەوە و مالّی صۆفی میرزایان دۆزییەوە، کە دایان لە دەرگا ، دایکی سەعید هاتە دەرەوە و هەوالّی دانیّ، کە کاتی ئەوەیە باوکیشی لە کێلگەوە بگەرێتەوە، دوای ئەوە حەسیرێکی لە ژێر سێبەری دارێکی بەر مالّەکەیاندا بۆ میوانەکانی راخست، مامۆستا پرسیی :

ـ ئەم منالّەتان چۆن پیّ گەیاندووە ؟

دایکی وەلامی دایەوە :

ـ کاتیّ سەعید لە سکما بوو، هیچ کاتێکم بەبیّ دەست نوێژ بەسەر نەبردووە ، کاتێکیش هاتە دنیاوە بەبیّ دەست نوێژ شیرم نەداوەتیّ .

دوای کەمیّ صۆفی میرزا دەرکەوت و دوو مانگا و دوو گاجووت لە بەریەوە ، بەرەو مالّ گەرایەوە مامۆستا نوور موحەممەد و هاوەلانی واقیان ور ما، کە دییان وا دەمی ئاژەلّەکان بەستراوە

باوکی سەعید بەخێرهاتنێکی گەرمی میوانەکانی کرد و ئەوانیش بە دیتنی ئەو دیمەنە سەیرە خۆیان پێ نەگیرا ، پرسیاریان کرد، کە بۆچ دەمی ئاژەڵەکانی بەستووە ؟ پێی وتن :

ـ کێڵگەکەم کەمێ دوورە ، جا ناچار ئەبم لە هات و چۆدا بەلای کێڵگەی دراوسێکانما تێپەڕ ببم ، بۆیە دەمی ئەم ئاژەڵانە ئەبەستم تا لە گژ و گیا و رووەکی ئەو کێڵگانە نەخۆن، چونکە نامەوێ پارووێەکی حەرام بێتە ماڵەکەمەوە .

مامۆستا نوور موحەممەد و هاورێیانی بە چاو و گوێی خۆیان شێوەی پەروەردە و پێگەیاندنی سەعیدیان بینی و بیست و ، تێ گەیشتن، کە سەعید لە نێو ئیمان و رەوشت بەرزیی و شەرمی خوادا گەورە بووە، و دایك و باوکێ بەو پلەیە خۆیان لە حەرام بپارێزن و مل کەچی فەرمانی شەریعەت بن شایانی ئەوەن خوای پەروەردگار رۆڵەی وا زیرەك و رەوشت بەرزیان پێ ببەخشێ .

میوانەکان ئەو شەوەیان بە خۆشیی بردە سەر و بۆ بەیانیی گەرانەوە دوا

یاسای قوتابخانەکانی ئەو رۆژەی کوردستان بە جۆرێك بوو، کە هەر زانایەك بروانامەی وەرگرتایە مافی ئەدرایێ قوتابخانە بکاتەوە ، جا ئەوەی کە قوتابخانەکەی دامەزراند بوو، ئەگەر دەسەڵاتی بوایە ئەوا خەرجی قوتابییەکان لە ئەستۆیا ئەبوو، ئەگەر نا بە زەکات و دەست گرۆیی موسڵمانان کاروباری قوتابییان جێبەجێ ئەکرا ، بۆیە قوتابییانی قوتابخانە دینییەکان بە دێهاتەکانا بلاوەیان ئەکرد بۆ کۆکردنەوەی زەکات بەشی خەرج و مەسرەفیان، بەلام سەعیدی بچووك و تازە پێگەیشتوو ئامادە نەبوو زەکات و خێر و صەدەقە وەربگرێ ، بۆیە، کە هاوەڵە قوتابییەکانی بە دێهاتەکانا بلاوەیان کرد بۆ کۆکردنەوەی زەکات و صەدەقە ، ئەو نەچوو لەگەڵیانا ، ئەمە کارێکی جوانی کردە سەر دڵ و دەروونی دانیشتوان و بە چاوێکی رێزەوە سەیریان ئەکرد ، لەبەر ئەوە لە نێوان خۆیانا هەندێ پارەیان بۆ کۆ

کردەوە و پێشکەشیان کرد ، کەچیی ئەوەیشی هەر وەرنەگرت ، تـا ناچـار بـوون بیدەن بە مەلا عەبدوڵڵای برای تا بۆی خەرج بکات .[٩]

---

[٩] ئەمە یاسای سەرانسەری ژیانی بوو، کە هیچ دیارییەکی بەبێ بەرامبەر لە کەس وەرنەئەگرت، مامۆستا لە مەکتووبی دووهەم‌دا هۆیە شەرعییەکانی ئەم کارەی بە شەش خاڵ روون کردۆتەوە، هەروەها مامۆستا لە شوێنێکی تردا باسی ئەو ڕەفتارە جوانەی ئەکات کە هەر لە منداڵییەوە دیـاریی و پێشکەشـیی وەرنـەگرتووە ، هەرچـەندە دەوڵەمەند نەبووە، و پێویستیشی بە یارمەتیی هەبووە .. خۆیشی و دۆستانیشی سەریان لەو کارەی سوڕ ئـەما، سەرەنجام لە دوای ماوەیەکی زۆر حیکمەتی ئەو کارەی بۆ دەرکەوت ..

مامۆستا بڕیار ئەدا جلەکانی بەری و کەل و پەلە پێویستەکانی بفرۆشێت تا بە نرخەکەیان ئەو کتێبانەی خۆی بکڕێتەوە، کە براکانی نووسیویانەتەوە ، تا بە هیچ شـێوەیەك کـەڵك و قـازانجی دنیـایی تێکـەڵ بـە ئیخلاصـی پەیامەکانی نوور نەبێت و ، سەرەنجام پەیامەکان تووشی زیان نەبن، ئەمە ئەکاتە پەند و ئامۆژگاریی بۆ قوتابیان تا ئەوانیش پەیامەکان بۆ هیچ کەڵك و قازانجێك بە کار نەهێنن

هۆیەکی تری گرنگیش بە لای مامۆستاوە ئەوەیە نەوەکو ئەو صەدەقە و کۆمەکییە بۆ ئەو کەسە حەڵاڵ نەبێت، کە پێی ئەدرێت ، چونکە ئەگەر خێرۆمەندەکە بە نیەتی پیاوچاکیی و صاڵحییەوە ئەو یارمەتییە بـدات و ، ئـەو کەسەش صالح نەبێت ئەوا بۆی حەرامە

هەروەها هۆیەکی زۆر وردیش باس ئەکات :

دۆستێکی بازرگانی سەردانی ئەکات و بایی سیی قرش چای بۆ ئەهێنێ ، بەڵام مامۆستا لێـی وەرناگرێـت . ئەویش ئەپاڕێتەوە تا دەست بە ڕوویەوە نەنێت ، چونکە بە تایبەت لە ئەستەنبووڵەوە بۆ ئەوی هێناوە، مامۆستا ئەوسا وەری ئەگرێت ، بەڵام نرخەکەی بە دوو قات بە کاکی بازرگان ئەدات، ئەویش وەك دڵی لە خۆی دابێنێ ، لە حیکمەتی ئەو کارەی پرسیار ئەکات .

مامۆستاش بۆی ڕوون ئەکاتەوە تا ئەو دەرسەی کاکی بازرگان وەری ئەگرێت، کە لە نرخـی ئـەڵماس دایـە ، دانەبەزێتە ئاستی پارچەی شووشە شکاو، واتە مامۆستا دەست لە کەڵکی خۆی هەڵ ئەگرێت ، تا براکەی کەڵکی دەرسە ئیمانییەکەی لە دەست دەر نەچێت .

ئەمەش دەری ئەخات، کە دەرسی ڕاستەقینە ئەو دەرسەیە، کە نەبەسترێ بە بەرژەوەندییە دنیاییەکانەوە و ، ئەو کاتە ئەو دەرسەش لە نرخ و بەهای ئەڵماسدایە

بەڵام ئەو مامۆستایەی، کە لەسەر خێر و صەدەقە بژیت و ، هەردەم خەریکی ڕازیکردنی دڵی دەوڵەمەندەکان نەبێت و ، ناچاریش نەبێت لەبەر دەمیان‌دا خۆی زەلیل بکات و ، دەست لە پایەداریی و سەربەرزیی زانایان هەڵ

## سێهەم : خەوی پیرۆز و مژدەی ئازیز

ماوەیەك لە نوورشین ئەمێنێتەوە ، پاشان ئەچێت بۆ خیزان، دوای ئەوە واز لە خوێندن ئەهێنێت و ئەگەرێتەوە ماڵەوە لای دایك و باوکی تا زستانی سەخت و بەفر و باران بەسەر بچێت ..

لەو ماوەیەدا، کە لە ماڵەوە بوو خەوێکی بینیی، کە تا کۆتایی ژیانی هەر لە یادی بوو .

لە خەویدا دیتی وا قیامەت هەستاوە و ، هەموو دروست کراوان سەر لە نوێ گیانیان بە بەردا کراوەتەوە، خێرا ئەوە هات بە دڵیدا چۆن بە خزمەتی پێغەمبەری مەزن ﷺ بگات .. پاشان ئەوەی هاتەوە یاد، کە وا چاکە لە سەرەتای پردی سیرات‌دا بووەستێ و چاوەروان بکات ، چونکە هەموو کەسێکی بەسەردا تێ ئەپەڕێ، بە پەلە خۆی گەیاندە ئەوێ .. ئەوەبوو هەموو پێغەمبەران بە لایدا تێ پەڕین ئەویش بە خزمەتی یەك بە یەکیان گەیشت و ، دەستی ماچ کردن .. کە بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت خۆی دا بەسەر هەردوو دەستیدا و ماچی کردن و ، داوای زانستی لێکرد .. پێغەمبەریش ﷺ مژدەی پێدا، کە زانستی قورئانی پێشکەش ئەکرێت ، بەو مەرجەی سوئال لە هیچ کەس نەکات، کە فەرمووی :

«سَيُوهَبْ لَكَ عِلْمُ القُرآنِ مَا لَمْ تَسْأَلْ أَحَداً » . [10]

---

بگرێت و ، دەست بداتە ڕیاییکردن، ئەو کاتە بەهای دەرسەکەی دائەبەزێتە ئاستی پارچەی شووشەشکاو . ( سەیری الملاحق ـ بارلا : ٥٧ بکە ) .

[10] وشەی ( سؤال ) ی عەرەبیی دوو واتای هەیە : یەکەمیان : پرسیار و دووهەمیان : سواڵ کردن، مامۆستا بە درێژایی تەمەنی ئەم مەرجەی بە هەردوو واتاکەی بردە سەر، ئەوەبوو، کە لەگەڵ زانایان دا ئەکەوتە گفتوگۆ هەرگیز پرسیاری نەئەکرد ، بەڵکو تەنها وەڵامی ئەوانی ئەدایەوە، چونکە ئەترسا مەرجەکەی و دڵی ئەوانیش

مامۆستاش لەو خەوەیدا بەڵێنی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا، کە پرسیار لە هیچ زانایەك نەکات، مامۆستا دەربارەی زانستی زانایان روونی ئەکاتەوە و ئـەڵێت : **"من ئینکاریی زانستی زانا بەرێزەکان ناکەم، ئیتر بۆ تاقییکردنـەوەیان پێویست ناکات پرسـیاریان لێبکرێـت، بـەڵام ئەگـەر کەسـێك گومـان لـە زانستی من ئەکات ئەوا هەر پرسیارێکی بوێت ئەتوانێ بیکات و ، منیش وەڵامی ئەدەمەوە"** ( تأريخ الحياة ) .

ئەم خەوە ورەی سەعیدە بچکۆلی بەرز کردەوە و تاسەمەندیی خوێندن لـەلای سەری هەڵدایەوە، و بۆ ئەمە ماوەی لە باوکی خواست تا بچێت بۆ بەخشـداریی ئەرواس ، تا لە خزمەتی مامۆستا مەلا موحەممەد ئەفەندییدا بخوێنێ .

کە چووە ئەوێ مامۆستا موحەممەد مامۆستا سەعیدی بە بچووك زانیی بۆیـە خۆی دەرسی پێ نەوت ، بەڵکو دایە دەست یەکێ لـە قوتابیـەکانی و ، ئەمـەش بەلای مامۆستا سەعیدەوە زۆر گران بوو، چونکە ئاستی زانسـتی ئەوەنـدە بـەرز نەبوو سەعید کەڵکی لێ وەربگرێ .

مـاوەیەکی کەمی لە ئەرواس بەسەر برد و ، پاشان بـەرەو قوتابخانـەی ( مـیر حەسەن وەلیی ) کەوتە رێ، لەوێش، کە دیتی وا بایەخ بە قوتابیی نوێ نادرێ ، وازی لە حەوت کتێبی دەرس خوێنـدن هێنـا و دەسـتی دایـە خوێنـدنی کتێبـی هەشتەم، پاشان بۆ پشوودان بۆ ماوەی مانگێك سـەردانی شارۆچـکەی وسـطان

---

بشکێنێ بە پرسیارێ، کە وەڵامەکەی نەزانن، دیارە بە واتای دووهەمیش هیچ شتێکی لە سەرانسەری ژیانیدا بێ بەرامبەر لە هیچ کەسێك وەرنەگرتووە و بە سەربەرزیی ژیاوە ..

( گواش ) ی کرد .. پاشان لەگەڵ مەلا موحەممەدی هاوڕێی بەرەو ( بایەزید ) ڕۆیشتن، کە قەزایەکە سەر بە پارێزگای (ئاگری) و ئەکەوێتە سەر سنووری

هەتا ئەو کاتە مامۆستا نوورسیی تەنها زانستی نەحو و صەرفی خوێند بوو ، کە گەیشتبووە ( إظهار ) ئیتر لە بایەزید خوێندنی راستەقینەی دەست پێ کرد ..

ئا لەم کاتەدا سەرەرای زیرەکییەکی بێ وێنە ، یان هێزێکی مەعنەویی حاڵەتێکی سەیر لە مامۆستا دەرکەوت ، کە لە سنووری ئامادەیی و لێهاتنی ئەو بەدەر بوو .. ئەوەبوو بە ساڵ دوو ساڵێك سەرەتای نەحو و صەرفی خوێند ، پاشان لە ماوەی سێ مانگدا نزیکەی پەنجا کتێبی خوێند و ، بە چاکییش لێیان تێ گەیشت و ، بروانامەشی لەسەریان وەرگرت کە سەرەتا بە ( مەلا جامیی ) [12] دەستی پێ کرد .. ئەمەش لەژێر چاودێریی مامۆستا مەلا موحەممەد جەلالیی .. لە هەر یەکێ لەو کتێبانە دەرس و دوو دەرسی ئەخوێند و ، هەندێکیش دە دەرس .. ئیتر کتێبێکی تەواو نەئەکرد و دەستی ئەدایە کتێبێکی تر . کاتێکیش، کە مامۆستاکەی پرسیاری لێ کرد بۆچ بەم شێوەیە دەرس ئەخوێنێ ، وەڵامی دایەوە، کە توانای نیە ئەم هەمووە کتێبانە بخوێنێ و لێیشیان تێ بگات ، چونکە ئەم کتێبانە وەك سندووقی گەوهەر وەهان و کلیلەکەی لای مامۆستاکانە ، جا

---

[11] سيرة ذاتية : ٤٥ ، رجل القدر : ١٢

[12] مەلا جامیی ناوی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی جامییە موفەسسیرێکی بەڕێزە و ، جام لە ولاتی ( ما وراء النهر ) لە ساڵی ( ٨١٧ ) ی کۆچییدا لە دایك بووە و ، لە ساڵی ٨٩٨ ی کۆچیی لە هەرات کۆچی دوایی کردووە، نزیکەی(١٠٠) صەد کتێبی داناوە، مەبەست لە کتێبی ( مەلا جامیی ) ئەو کتێبەیەتی، کە دەربارەی نەحو نووسیویەتی، کە پێی شەرحی ( كافية ) ی ئیبن حاجەبی کردووە و ، بریتییە لە کورتەیەکی جوانی هەموو شەرحەکانی کافیە و ، خۆیشی چەند شتێکی بۆ زیاد کردووە و ناویشی ناوە : ( الفوائد الضيائية ) کە ئەمڕۆ ئەخوێنرێ . ( كشف الظنون : ٢ / ١٣٧٢ ، والأعلام : ٣ / ٢٩٦ ) . ( سيرة ذاتية : ٤٦ ، رجل القدر : ٢٢ ) .

تكای لێكرد ئاگاداری بكەن، كە ئەم سندووقە چيی تيايە ، واتە باسی چيی ئەكات ، تا ئەو كتێبەی كە لەگەڵ تەبيعەتيا ئەگونجێ هەڵی ببژێرێ ..

لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا هەموو رۆژێك نزيكەی دوو صەد لاپەرە ، بگرە زياتريش لە مەتنی كتێبە شەرعييەكانی ئەخوێند ، وەك ( جمع الجوامع ) [13] و ( شرح المواقف ) [14] و ، ( إبن حجر ) [15] لەگەڵ تێ گەيشتنی تەواو و بەبێ يارمەتيی هيچ كەسيش، خۆ لە هەر بوارێك دا و لە هەر زانستێك دا پرسياری لێ بكرايە زۆر بە چاكيی وەڵامی ئەدايەوە .. ئەوەندە سەرگەرمی خوێندنەوە و ديراسە بوو، پەيوەنديی لەگەڵ ژيانی كۆمەڵايەتييدا پچرا

زۆر بە كەميی قسەی ئەكرد .. زۆربەی كاتی لەسەر مەرقەدی شێخ ئەحمەدی خانيی [16] بەسەر ئەبرد ، بە تايبەت بە شەودا ، بە مەرجێ خەڵك بە رۆژدا ناوێرن بچنە ناويەوە

---

[13] جمع الجوامع في أصول الفقه : دانانی تاج الدين عبدالوهاب السبكي يە ( ٧٢٧ ـ ٧٧١ ك ) كە كورتەيەكی بەناوبانگە و لە نزيكەی صەد سەرچاوە كۆی كردۆتەوە . شەرح و پەراوێزی زۆری لەسەرە و ، هی وايش هەيە بە شيعر هۆنيويەتەوە وەك ( الطوخي ) و ( الغزي ) و ( السيوطي ) كە ناوی ناوە ( الكوكب الساطع ) . ( كشف الظنون : ٥٩٥ ، والأعلام : ٤ / ١٨ ) . ( رجل القدر ٢٣ ، سيرة ذاتية : ٤٦ )

[14] المواقف في علم الكلام : دانراوی ( عضد الدين الإيجي ) كە لە ( ٧٥٦ ك ) دا كۆچی دوايی كردووە ، كتێبێكی پايەدارە و چەندين زانای پايەداريش وەك ( جرجاني ) و ( كرماني ) و ( إبري ) شەرحيان كردووە . ( سيرة ذاتية : ٤٦ ، و رجل القدر : ٢٣ ) .

[15] مەبەست لە كتێبی ( تحفة المحتاج في شرح المنهاج ) ە كە دانراوی ئيبن حەجەری هەيثەميی مەككييە و شەرحی ( منهاج الطالبين ) ی ئيمام نەوەويی شافيعييە .. ( سيرة ذاتية : ٤٦ ، رجل القدر : ٢٢ )

[16] ئەحمەدی خانيی : لە ( خان ) ی سەر بە ويلايەتی هەكاريی باشووری خۆرهەڵاتی توركيا ، لە ساڵی ١٦٥٠ ز لە دايك بووە، لەو دێهاتانەی نزيك خۆی زانستە ئيسلامييەكانی خوێند ، تا بووە زانايەكی پايەدار .. چەندين دانراو و ديوانی هەيە و وەك نەوبەهار و مەم و زين، بە كورديی و فارسيی و عەرەبيی و توركيی شيعری داناوە، لە ساڵی ١٧٠٦ ز دا كۆچی دوايی كردووە و لە بايەزيد نێژراوە . ( سيرة ذاتية : ٤٧ ) .

دوای ئەوە بریاری دا بچێت بۆ شاری بەغداد و سەردانی زانایانی بکات .. ئەوەبوو جل و بەرگی دەروێشانی لەبەر کرد و ، بە پێ شاخ و چەم و دۆڵی بە شەو و بە رۆژ ئەبریی و ، بە وێنەی زاهیدان دەستی دایە وەرزشی رۆحیی ، تا ئەوەبوو لاشەی رۆژ بە رۆژ لاوازتر ئەبوو ، بە رادەیەك ئیتر بەرگەی ئەو وەرزشەی نەئەگرت، چونکە لە ماوەی سێ رۆژدا یەك پارچە نانی ئەخوارد ، بەو هیوایەی بگاتە حاڵەتی حەکیمەکان و زیرەکیی دەستگیر ببێ، بەم حاڵەوە بۆ ئەوەی تووشی حەرام و گومان لێ کراو نەبێت جاری وا ئەبوو گژ و گیای ئەخوارد ، هەتا گەیشتە بەدلیس .[17]

بەڵێ بە تەواوکردنی سێ مانگ خوێندن ، مامۆستا زانیاریی تەواو کرد و لای مامۆستا موحەممەد جەلالیی بروانامەی عالمیی وەرگرت .

ئەوەبوو دوای گەشتەکەی بەرەو بەغدا رێی گۆریی و لای دایە بەدلیس و ، چووەوە خزمەتی مامۆستای پێشووی موحەممەد ئەمین ئەفەندیی و لەوێ دوو رۆژ مایەوە و ئامادەی دەرسەکانی مامۆستا ئەبوو، جا کاتێ مامۆستاکەی داوای لێ کرد جل و بەرگی زانایان لەبەر بکات ، ئەم خۆی بە شیاو نەزانیی ، بۆیە وتی : من هێشتا باڵق نەبووم ، بۆیە خۆم بە شیاو نازانم جل و بەرگی زانایان لەبەر بکەم، من چۆن ئەبمە زانا هێشتا منداڵم ؟ [18]

هەروەها دوایی خۆی باسی جل و بەرگ لەبەرنەکردنی ئەکات، کە کاتێك تەمەنی چواردە ساڵان بووە ئیجازەی زانستیی وەرگرتووە ، بەڵام هیچ مامۆستایەك لە خۆی رانەبینیوە مێزەرەی مەلایانەی لەسەر ببەستێ و جبەی

---

[17] سيرة ذاتية : ٤٧

[18] سيرة ذاتية : ٤٧ ـ ٤٨ ، رجل القدر : ١٣ ـ ١٤

لەبەر بکات ، وەك عادەتی تەواوکردنی زانست ، چونکە جبە و مێزەرەی زانایان لەگەڵ تەمەنی ئەودا نەئەگونجا

لە راستییدا ـ وەك خۆی باسی ئەکات ـ زاناکان بوو بوونە دوو دەستە : هەندێکیان مونافەسەیان ئەکرد و هەندێکیشیان تەسلیم بوو بوون ، بۆیە هیچیان خۆی بە مامۆستای لە قەڵەم نەئەدا تا ئیجازەی پێ بدات ، سەرەرای ئەوەش ژمارەیەك لە گەورە ئەولیاکان دنیایان بەجێ هێشتبوو ، ئیتر هیچ کەس لە خۆی رانەئەبینی جبەی لەبەر بکات و مێزەرەشی لەسەر ببەستێ .[١٩]

دوای سەردانەکەی بەدلیس مامۆستا چوو بۆ شاری شیروان بۆ لای مەلا عبدوڵڵای برای، کە لەوێ خەریکی خوێندن بوو، و چەند مانگێکیش بوو یەکتریان نەبینی بوو، لەوێ بە یەکتر شاد بوونەوە و ، پاشان کاکە مەلای لێی پرسیی :

ـ دوای دوایین بە یەك گەیشتنمان « شرح الشمسية » م [٢٠] تەواو کردووە ، ئەی تۆ ئێستا چیی ئەخوێنی ؟

ـ هەشتا کتێبم خوێندووە

ـ چیی ؟

ـ بەڵێ هەشتا کتێبم خوێندووە ، چونکە زیاد لە کتێبەکانی خوێندن کتێبی تریشم خوێندووە

ـ کەواتە تاقییت ئەکەمەوە

ئامادەم بۆ تاقیی کردنەوە .. چیت پێ خۆشە بپرسە

[١٩] الملاحق : ملحق قسطموني : ١٤٠

[٢٠] شرح الشمسية کتێبێکە لە ( منطق ) دا

مەلا عەبدوڵلاّ تاقییکردنەوەیەکی وردی مامۆستا نوورسیی کرد و ، کە گوێی لە وەڵامە راستەکانی بوو، بە تەواوەتیی سەرسام بوو .. ئەو برا بچکۆلەیەی، کە هەشت مانگ لەوەو بەر قوتابیی خۆی بوو ئێستا زانایەکی بەرزی لێ هاتووی تەواو ئاگاداری لێ دەرچووە، سەیر لەوەدا بوو، کە مەلا عەبدوڵلاّ داوای لێکرد لەمەولا کاکی بکا بە قوتابیی خۆی .[21]

هەر لەو ماوەیەش‌دا بوو، کە گفت و گۆیەك لە نێوانیاندا رووی دا ، کە مامۆستا نوورسیی دوای پەنجا ساڵ ئەیگێرێتەوە و ئەڵێت :

کاکی خوا لێ خۆش بووم یەکێك بوو، لە موریدە تایبەتییەکانی شێخی ( ضیاء الدین ـ قدس سره ) ،[22] کە یەکێکە لە ئەولیا پیاوچاکەکان، جا صۆفیانی تەریقەت خۆش ویستنی مورشیدەکەیان زیاد لە پێویست و موبالەغە کردن لە گومان باشییدا پێی ، بە شتێکی ئاسایی ئەزانن ، بەڵکو بەو زیادەڕەویی و موبالەغەیە رازیین . لەبەر ئەوە رۆژێکیان کاکم پێی وتم :

ـ شێخی ضیاء الدین زانستێکی یەکجار فراوانی هەیە و، بە وێنەی قوطبی ئەعظەم ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیە، کە لە بوونەوەردا روو ئەدەن !

[21] سيرة ذاتية : ٤٨ ، رجل القدر : ١٤

[22] شێخی ضیاء الدین عبدالرحمن طاغ ، کە بە ( سیدا ) بەناو بانگە .. خەڵکی گوندی ( نوورشین ) ی نزیك مەڵبەندی پارێزگای ( مووش ) ی کوردستانی تورکیایە، لە جیهادی جەنگی جیهانیی یەکەم دا قۆڵێکی لە دەست داوە و ، سوڵتان رەشاد مەدالیایەك و قۆڵێکی دەست کردی خەلاّت کردووە، پاشان لە جیهادی سەربەخۆیی وڵات دا، بۆ ڕاونانی داگیرکەران ، بەشداریی کردووە، لە لاپەڕە ( ١٢٦ ) ی ( أنوار الحقيقة ) وە وەرگیراوە . ـ وەرگێڕ .

پاشان گەلێ نموونەی لەسەر پایە بڵندیی و کارە لەعادەت بەدەرەکانی ئەوی بۆ گێرامەوە ، هەر بۆ ئەوەی منیش هەڵ بنێ تا نیسبەت و پەیوەندیی لەگەڵدا ببەستم ! بەڵام من پێم وت :

ـ برای بەرێزم ! تۆ زیاد لە پێویست ڕۆ ئەچی ! گەر روو بە رووی شێخی ضیاء الدین خۆیشی ببمەوە ، ئەوا لە چەندەها مەسەلەدا بە بەڵگە ئەیبەزێنم و ، تۆش وەك من بە خۆشەویستییەکی راستەقینە خۆشت ناوێت ! چونکە تۆ ئەو ( ضیاء الدین ) ەت خۆش ئەوێ، کە لە زەینتا بە شێوەی قوطب یێکی ئەعظەم و زانا و ئاگادار بە هەموو شتێك لە گەردووندا خەیاڵت پیشانتی ئەدات، کەواتە تۆ بەم ناو نیشانە پەیوەندییت لەگەڵدا بەستووە و ، لەبەر ئەم سیفەتەش خۆشت ئەوێ، خۆ ئەگەر پەردە لە رووی لابدرێت و حەقیقەتی دەربکەوێ ، ئەوا ئەو خۆشەویستییەت بۆی نامێنێ ، یان کەم ئەبێتەوە !

بەڵام ، کاکە گیان من ئەو پیاوچاك و وەلییە موبارەکەم ، بە وێنەی خۆش ویستنەکەی تۆ ، یەکجار خۆش ئەوێ ، بگرە ئەوەندەی، کە شایانی بێ رێزی لێ ئەگرم و بە گەورەی ئەزانم ، چونکە ئەو :

بە پێی رێبازی ئەو حەقیقەتەی، کە لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ هیدایەتی وەرگرتووە ، رابەرێکی مەزنی ئیمان دارانە ، ئیتر پلەی راستەقینەی هەرچییەك بێت، بۆیە من ئامادەم گیانم بکەمە قوربانیی لە پێناوی ئەو خزمەتە ئیمانییەدا، کە ئەو ئەیکات، خۆ ئەگەر پەردە لە رووی پایە و پلەی راستەقینەی لا بدرێت ، ئەوا من پشتی لێ هەڵ ناکەم و ، وازی لێ ناهێنم و ، خۆش ویستنیشیم کەم ناکات ، بگرە زیاتر پەیوەندیی لەگەڵدا پتەو ئەکەم و ، خۆشەویستیی زیاتری بۆ ئەنوێنم و ، لە رادەبەدەریش رێزی لێ ئەگرم .

کەواتە ، کاکی بەرێزم ! من ضياء الدينم بەو جۆرەی، کە هەيە و ، بە شێوەی ڕاستەقينەی خۆی خۆش ئەوێ، بەڵام تۆ ئەو ( ضياء الدين ) ەت خۆش ئـەوێت کە لە ئەندێشەتدايە ![٢٣]

جا لەبەر ئەوەی کاکی خوا لێ خۆش بووم بە ڕاستيی زانايەکی بە ويژدان بوو ، بە بۆچوونەکەی من ڕازيی بوو، و وەری گرت و ، ڕێزيشی لێ نا .[٢٤]

شايانی باسە، کە مامۆستا نوورسيی لە ماوەی حەفتا ساڵدا سەرسامی ئەوە بووە، کە سەعيدی بچکۆلە و کەم تەمەن چۆن توانيويەتی وەڵامی پرسياری ئـەو هەمووە زانا پايەدارانە بداتەوە ، بە مەرجێ ئەو خـاوەنی زانسـتێکی وەهـا زۆر نەبووە، تا لە ئەنجام دا لە يەکێ لە حيکمەتەکانی ئەو کارە تێ ئەگات، کە وەڵام دانەوەی ئەو بەرێزانە بۆتە هۆی ئەوە، کە دوايی پەيامەکانی نووری نووسين هـيچ زانايەك دەستی قەڵەم نەگرێ و دژی پەيامەکانی نوور شت نەنووسێت ، ئەمەش بە سۆزی خوای گەورە تا دوژمنە شارراوەکان و مولحيدەکان و نۆکـەرانيان ڕەخنـەی زانايان نەکەنە بيانوو بۆ سووك سەيرکردنی پەيامەکانيش و زانايانيش، هەتا ئەو زانايانەش، کە پەيامەکان ڕەخنەيان لەسـەريان هـەبوو ، ئـەوانيش بەرهەڵسـتی پەيامەکانيان نەکرد ، سوپاس بۆ خوا [٢٥]

---

[٢٣] چونکە تۆ داوای نرخێکی يەکجار زۆر بۆ خۆشەويستييەکەت ئەکەيت و ، وەها بير ئەکەيتەوە، کە زياتر لە صەد قاتی نرخی خۆت نرخ بۆ خۆشەويستييەکەت دابنرێت، بەڵام لە ڕاستييدا گەورەترين خۆشەويستيی بۆ پايە و پلەی ڕاستەقينەی ئەو هێشتا کەمە . ـ دانەر .

[٢٤] الـملاحق : ١٣٣

[٢٥] الـملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢ / ٣٦١

### چوارەم : چوون بۆ سەعرەد

مامۆستا دوو مانگ لای مەلا عەبدوللای برای مایەوە و ، پاشان چوو بۆ قوتابخانەی مەلا فەتحوللا ئەفەندیی لە سەعرەد، لەوێ مامۆستا پرسیاری لێ کرد:

ـ پار ( سیوطي ) ت [٢٦] ئەخوێند ، ئایا ئەمساڵ ( مەلا جامیی )[٢٧] ئەخوێنی؟

ـ بەڵێ ، جامییشم تەواو کردووە

پرسیاری هەر کتێبێکی لێ ئەکرد مامۆستا نوورسیی وەڵامی ئەدایەوە، کە تەواوی کردووە .. مامۆستا فەتحوللا سەرسام بوو، لەوەی کە، کەسێك لە ماوەیەکی وەها کەمدا چۆن ئەو هەمووە کتێبەی پێ ئەخوێنرێن ، بە رادەیەك، کە ئەو سەرسورمانەی بە گاڵتەوە دەربڕیی و پێی وت :

ـ پار شێت بوویت ، ئایا ئەمساڵیش هەر شێتی ؟

وەڵامی دایەوە : بۆ ئەوەی مرۆڤ تەکەببور و غرووری نەفسی تێك بشکێنێ ، جاری وا ئەبێ حەقیقەت لە کەسانی تر بشارێتەوە ، بەڵام لەبەردەم مامۆستاکەیدا، کە لە باوکی زیاتر رێزی لێ ئەگرێ ، ناچارە راستیی بڵێ، جا ئەگەر بفەرموون من ئامادەم لە هەموو ئەو کتێبانەدا، کە ناوت بردن تاقییم بکەیتەوە ..

مامۆستا فەتحوللا دەستی بە پرسیار کرد .. لە هەر کتێبێکدا پرسیاری ئەکرد بە جوانیی و تێر و تەواویی وەڵامی ئەدایەوە

---

[٢٦] مەبەست لە کتێبی ( البهجة المرضية في شرح ألفية إبن مالك ) ە .

[٢٧] مەبەست لە کتێبی ( الفوائد الضيائية ) ی عەبدوررەحمان جامییە .

شایانی باسە، کە مامۆستا عەلیی سۆرانییش لەم کۆڕەدا ئامادە بوو .. ئەویش بریاری دا لای مامۆستا سەعید دەرس بخوێنێ ، بە مەرجێ ساڵی پار ئەو مامۆستای مامۆستا نوورسیی بوو .

پاشان مەلا فەتحوڵڵا وتی :

ـ چاکە .. زیرەکییەکەت لە رادەبەدەرە ، بەڵام با بزانین هێزی لەبەرکردنت چۆنە ! ئایا ئەتوانیت ، بە دوو جار خوێندنەوە ، چەند دێرێك لە کتێبی ( مقامات الحريري ) لەبەر بکەیت ؟

مامۆستا سەعید کتێبەکەی وەرگرت و یەك جار لاپەرەیەکی لێ خوێندەوە و ، لە بەری کرد و ، لەبەر بۆ مامۆستایشی وتەوە، مامۆستا خۆی پێ نەگیرا لە سەرسامیی دا وتی :

ـ یەك گرتنی زیرەکییەکی لە رادەبەدەر لەگەڵ لێهاتنێکی لە رادەبەدەر بۆ لەبەرکردن لە تاقە کەسێكدا لە هەموو شتێك دەگمەنترە

هەر لەوێ مەلا سەعید دەستی بە لەبەر کردنی کتێبی « جمع الجوامع » [٢٨] کرد ، کە رۆژانە بە رێژەی سەعاتێك یان دوان ، بۆ ماوەی حەفتەیەك ئەی خوێندەوە .. کە مامۆستا فەتحوڵڵا ئەمەی زانیی لەسەر بەرگی کتێبەکەی نووسیی:

( قَدْ جَمَعَ فِي حِفظِهِ جَمْعَ الْجَوامِعِ جَمِيعَهُ فِي جُمُعَةٍ ) .

مامۆستا فەتحوڵڵا ستایشێکی زۆری مامۆستا نوورسیی کرد و بەو زانستە نایاب و زیرەکییە بێ وێنەیەی یەکجار سەرسام بوو .

---

[٢٨] جمع الجوامع : لە ئوصولی فیقهە و ، تاج الدين سەبوکیی شافیعیی ، کە لە ساڵی ٧٧١ ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردووە ، دای ناوە، ئەڵێن : لە صەد کتێبی ئوصولی فیقه کۆی کردۆتەوە .. راڤە و پەراوێزی زۆری هەیە .

كە دەنگ و باسی بلاوەی كرد ، زانايان كۆ بوونەوە و كۆرێكی فراوانيان گرت و مامۆستا فەتحوڵلاش ئامادەی بوو .. مامۆستاكان هەوڵيان ئەدا بە پرسياری قورس تەنگی پێ هەڵ بچنن، هەرچيی پرسياريان لێ ئەكرد وردی دەم و چاوی مەلا فەتحوڵلای مامۆستای ئەبوويەوە و ، وەك سەيری كتێبێك بكات و بيخوێنێتەوە وەلامی ئەدايەوە .. كە زاناكان ئەو ديمەنەيان بينيی شاهێدييان دا، كە ئەم گەنجە گەنجێكی ئاسايی نيە و ، ستايشی زيرەكيی و زانست و پايە و پلەيان كرد

كە دەنگ و باسی مەلای گەنج كەوتە دەم دانيشتوان ، بە وێنەی وەلييەكی پياوچاك رێزيان لێ ئەگرت ، ئەمەش بووە هۆی ئەوە، كە هەندێ زانا و قوتابيی زانستە شەرعييەكان حەسووديی پێ ببەن، جا، كە بە زانست و تاقيكردنەوە بۆيان نەبەزێنرا ، كەوتنە هەوڵی لێ دان و ئازار پێ گەياندنی، كە دانيشتوانی سەعرەد ئەوەيان بيست فريای مامۆستا نوورسيی كەوتن و رزگاريان كرد و خستيانە ژوورێكەوە تا دەستی هێرش كەرەكانی نەگاتێ، بەلام مامۆستا ئەوەندە زانست خوازانی خۆش ئەويستن ، لە ژوورەكە هاتە دەرەوە و ، بڕياری دا ئەگەر قوتابييە نەيارەكانی كوشتوويانە بەرگرييان لێبكات ، تا نەفام و نەزانان ئەوە بە هەل نەزانن .. بۆ ئەمە رووی لە يەكێ لە قوتابييەكان كرد و وتی :

ـ ئێوە من بكوژن ، بەلام شەرەف و پايە و پلەی زانست بپارێزن !

قوتابييەكان لە جێی خۆيان وشك وەستان و ، مامۆستاش گەڕايەوە بێ ئەوەی يەكێ هەڵمەتی بداتێ .. بەم شێوە شيرينە ناكۆكييەكەی نەهێشت ..

لە لايەكی ترەوە هەواڵ گەيشتە پارێزگاری سەعرەد و ، ئەويش كۆمەڵێك چەك بە دەستی ناردنە لای مامۆستا تا پێی رابگەيەنن، كە ئەو دەست درێژييكەرانە لەسەر ئەو دەر ئەكات و ، داواشی لێكرد، كە سەردانی بكات .

بەڵام مامۆستا بە سەرۆکی چەکدارەکانی ڕاگەیاند و وتی :

ـ ئێمە زانست خوازین .. ئەگونجێ ناکۆك ببین و پاشانیش ڕێك بکەوین و ئاشت ببینەوە، جا بە گونجاوی نازانین کەسێك، کە لەسەر مەسلەکمان نەبێت و ، لەسەر ئەوەی، کە لە نێوانـماندا ڕوو ئەدات دەست بخاتە کارمانەوە، هەڵەیش لە منەوە بووە، و تکا ئەکەم، کە عوزری نەهاتنم بە پارێزگار بگەیەنی ..

ئا لەو کاتەدا تەمەنی مامۆستا پانزە ساڵان بوو، و لەبەر ئەوەی، کە ئامادەیی خۆی دەربڕیی، کە هەر پرسیارێکیان پێ خۆشە لەوێ بپرسن و ، ئەم پرسیار لە هیچ کەس ناکات ، خەڵکەکە نازناوی سەعیدی مەشهووریان لێنا

جارێکی تر گەڕایەوە بۆ بەدلیس و ، ئەوەی بەرگوێ کەوت، کە لێك نەگەیشتنێك کەوتۆتە نێوان مامۆستا موحەممەد ئەمین ئەفەندیی و مامۆستاکانی خیزان، ئەویش ئامۆژگاریی خەڵکەکەی کرد، کە با وریا بن و خۆیان لەو غەیبەتە بپارێزن، کە شیاوی موسڵمانان نیە خەڵکەکە چوون لای مامۆستا موحەممەد ئەمین ئەفەندیی شکاتیان لێکرد و ئەویش وتی :

ـ ئەو هێشتا منداڵە و شیاوی ئەوە نیە دەم بخەیتە دەمی .

کە ئەم وتەیە گەیشتەوە لای مامۆستا نوورسیی ، هات بۆ کۆڕی مامۆستا موحەممەد ئەمین و دەستی ماچ کرد و وتی :

ـ گەورەم .. تکا ئەکەم بفەرمووی و تاقییم بکەیتەوە .. من ئامادەم ئەوە بسەلمێنم، کە شیاوم وت و وێژم لەگەڵدا بکەیت ..

مامۆستا ئەمین ئەفەندیی شانزە پرسیاری یەکجار قورسی زانستە جۆرا و جۆرەکانی ئامادە کردن هەتا لە مەلا سەعیدیان بپرسێت، مەلا سەعیدیش بە خێرایی وەڵامی هەر هەموویانی دایەوە

دوای ئەوە مامۆستا نوورسيی چوو بۆ مزگەوتی ( قريشـي ) و ، لەویٚ دەستی بە ئامۆژگاریی و ڕێنموونیی خەڵکیی کرد، دوای ماوەیەك دانیشتوانی شار بوونە دوو دەستە ، کە یەکێکیان پشتگیریی لە مامۆستا نوورسیی ئەکرد و ، ئەوی تریشیان لە مامۆستا ئەمین ئەفەندیی، لێرەدا پاریزگاری شار ترسا ئاژاوە و دووبەرەکیی بکەوێتە نێوان خەڵکەکەوە ، بۆیە بریاری دا مامۆستا نوورسیی رەوانەی شیروان بکریٚ .

لەو تەمەنەدا بایەخی زۆری بە خواپەرستیی و ئەوراد ئەدا ، بۆیە هەر ساردییەك لە خواپەرستییەکەیدا رووی بدایە هەستی پیٚ ئەکرد

خوای گەورە وەهای هێنایە پێش رۆژێکیان نوێژی فەجری لە کیس چوو .. هەر، کە ناحەزەکانی ئەوەیان زانیی ، هەستان لە شاردا پاگاندەیان بلاّو کردەوە، کە مەلا سەعید وازی لە نوێژ هێناوە

کە پرسیاری هۆی ئەوەیان لێکرد، کە بۆچ ئەو هەمووە خەڵکە بە جارێك باسی ئەو قسەیە ئەکات ، وتی : ئەگەر کارێك هیچ بنەمایەکی نەبێت بەو گورجییە لە ناو خەڵكدا بلاّوە ناکات .. هەڵەکە لە منەوەیە، ئەوەتا دوو جار سزا درام لەسەری ، یەکەمیان : گلەیی خوای پاك و بێگەرد و ، ئەوی تریشیان : قسە وتنی خەڵك پێم .. بەلاّم هۆی بنەرەتیی ئەم کارە بریتییە لەوەی، کە ویردێکی شەریفم واز لێهێناوە، کە هەموو شەوێك لەسەر خوێندنی راهاتبووم، جا رۆحی خەڵکەکە هەستی بەم حەقیقەتە کرد ، بەلاّم بە تەواویی لێی نەگەیشتن و ، نەشیان زانیی هەڵەکە چییە ، ئیتر ناوێکی تریان لەو حەقیقەتە نا

دوای ماوەیەك مامۆستا چوو بۆ یەكێ لە شارۆچكەكانی شاری سەعرەد، كە پێی ئەوترا تیللۆ [٢٩]، ئەمەش لە ساڵی ( ١٨٩٤ ز ـ ١٣١١ ك ) دا بوو .

لە تیللۆ دەستی دایە گۆشەگیریی و ئیعتیكاف .. كاتێك، كە شۆربایان بۆ ئەهێنا دەنكەكانی ناو شۆرباكەی دەرئەهێنان و ئەیدان بە مێروولەكان و ، خۆی نانەكەی بە ئاوی شۆرباكە تەر ئەكرد و ئەی خوارد، جا لە دادگای ئەسكی شەهردا، لە سییەكان‌دا پرسیاری هۆی ئەو كارەی لێ ئەكەن، مامۆستاش وەڵامیان ئەداتەوە، كە ئوممەتی مێرووله و هەروەها هەنگیش لە سایەی یاسای كۆمارییدا ئەژین ، جا لەبەر رێزنان لەو گیان‌دارە ژیرانە، كە ئەوەندە ژیانی خۆیان رێك كردووە دەنكەكانی ناو شۆرباكەی پێشكەش ئەكردن .

دواییش بۆی روون كردنەوە، كە خەلیفە راشیدەكان هەم خەلیفە و هەم سەرۆك كۆمار بوون و ، صددیقی ئەكبەریش خوا لێی رازیی بێ سەرۆك كۆماری دە مژدە پێ دراوەكە و هاوەڵانیش بوو ، بەڵام بە راستیی و بە پاكیی و بە سەربەستیی شەرعیی . [٣٠]

لە كاتی گۆشەگیریی و ئیعتیكافەكەیدا دەستی بە لەبەركردنی فەرهەنگی ( القاموس المحیط ) ی فەیرووز ئابادیی كرد هەتا گەیشتە بابی سین . [٣١]

---

[٢٩] تیللۆ : شارۆچكەیەكە هەتا ئێستاش بەردەوام زانای خواناس تیایا پێ ئەگات .. لە شاری سەعرەدەوە حەوت كیلۆمەتر دوورە .

[٣٠] الشعاعات : ٤٢٥

[٣١] سیرة ذاتیة : ٥١ ـ ٥٤ ، رجل القدر : ١٤ ـ ١٧

## پێنجەم : دابران و بێ نازیی

مامۆستا نوورسیی باسی بێ نازیی خۆی ئەکات، کە ویستی خوای گەورە وەها بووە لە خێزانەکەی بپچرێ و دوور بکەوێتەوە و ، لەگەڵ کەس و کاری دا نەژی ..

لەوە ئەچێ لە تەمەنی نۆ ساڵییدا دایکی کۆچی دوایی کردبێ و ، لە وت و وێژ و خۆشەویستیی دایکی بێ بەش بوویێت، هەروەها لە پانزە ساڵییەوە چاوی بە هیچ خوشکێکی نەکەوتووە ، چونکە ئەوانیش هەرسێکیان لەگەڵ دایکی کۆچیان کردووە بۆ جیهانی بەرزەخ ..

خوشکە گەورەکەی ناوی ( درية ) بووە ، کە دایکی عوبەید بووە و پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کۆچی دوایی کردووە و، خوشکە ناوەنجییەکەشی ( خانم ) ی ناو بووە، کە زانایەکی بەرێز بووە و ، لە ساڵی ١٩٤٥ دا لە سەفەری حەج و لە کاتی طەواف دا کۆچی دوایی کردووە و ، خوشکە بچووکەکەشی ناوی مەرجان بووە و لە هەموویان بچووك تر بووە .

لە نێو سێ براشی دەری ئەبرێ کە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ چاوی بە دوانیان نەکەوتووە و لە خۆشیی و خۆشەویستیی ئەوانیش و خوشکەکانیشی بێ بەش بووە .

شایانی باسە، کە برا گەورەکەی، کە ناوی مەلا عەبدوڵلا بووە و ، باوکی ( عبدالرحمن ) ی قوتابیی مامۆستا نوورسیی و کوری مەعنەویی بووە، لە ساڵی ( ١٩١٤ ) ز دا کۆچی دوایی کردووە و ، موحەممەدی برایشی لە ساڵی ( ١٩٥١ ) ز دا و ، مامۆستا ( عبدالمجيد ) یش لە ساڵی ١٩٦٧ ز دا

هەروەها مامۆستا لەبەر ئەوەی، کە ژنی نەهێناوە و منداڵی نەبوون ، دیسان لە سۆز و خۆشەویستیی و گاڵتە و رووخۆشیی ئەوانیش بێ بەش بووە .

لە چوار لاوە بێ ناز کەوتووە ، کەچیی سوپاسی خوا ئەکات، کە لە سێ لایەنەوە ئەو چوار زامەی بۆ دەرمان کردووە :

یەکەم : لە بریی خۆشیی و لەزەتی ژیان لەگەڵ دایکیدا ، خوای گەورە هەزارەها دایکی مەعنەویی پێشکەش کردووە ، کە ئەمانە بە شێوەیەکی زۆر بەرز و نایاب کەڵکیان لە پەیامەکانی نوور وەرگرتووە و ئیمانی خۆیان پێ بەهێز کردووە

دووهەم : لە بریی ئەو خۆشیی و سۆزەی، کە لە دانیشتن و کۆربەستن لەگەڵ هەرسێ خوشکەکەیدا ، رەحمەتی خوایان لێبێ ، خوای بە سۆز و شەفەقەت هەزارەها ئافرەتی گەنجی لە شێوەی خوشکی دینییدا پێ بەخشیی ، تا کەڵك و قازانجێکی زۆری رۆحیی و مەعنەویی ، لە دوعاکانیان و لە خزمەتکردنی پەیامەکانی نوورەوە ، دەستگیر ببێ ..

سێهەم : لە بریی لە دەستچوونی ئەو کۆمەکییە ماددیی و مەعنەوییە و، ئەو سۆز و خۆشەویستیی و دڵ پێ سووتانەی، کە لە هەردوو برا رەحمەتییەکەوە ، مەلا عەبدوڵلا و موحەممەد ، پێی ئەگەیشتن ، خوای گەورە و بالا دەست صەدان هەزار برای راستەقینەی قوربانییدەری خزمەت گوزاری پەیامەکانی نووری پێ بەخشیی ، کە بەوپەری سۆز و ئیخلاص و لێبرانەوە کۆمەکییان ئەکرد و ، ئامادە بوون دەست مایەی دنیایی و قیامەتیی خۆیان لەو پێناوەدا ببەخشن .

چوارەم : لە بریی بێ بەشبوونی لەو سۆز و خۆشەویستییەی، کە لە بوونی منداڵدا دەستگیر ئەبێ ، چونکە مامۆستا منداڵی نەبووە ، خوای گەورە صەدان هەزار منداڵی پاك و بێ تاوانی پێ بەخشیوە ، کە ئەوانە لە ئایندەدا کەڵك لە پەیامەکانی نوور وەرئەگرن .

بەم شێوەیە خوای پاك و بێ گەرد ئەو سۆز و بەزەییانەی گۆڕین بۆ صەدەها هەزار ئەوەندە [٣٢]

[٣٢] سیرة ذاتیة : ٣٦ ـ ٣٧

دەربارەی ژن نەهێنانی مامۆستاش هەندێ دۆست و خۆشەویست پرسیار ئەکەن، کە چۆن ئەو سوننەتە پیرۆزەی پشت گوێ خستووە، جا مامۆستا خۆی چەند هۆیەك بۆ ئەو کارەی ئەخاتە بەردەم خوشك و برای موسڵمانی :

یەکەم : مامۆستا موسڵمانان ئاگادار ئەکات، کە نەخشەیەکی کافرانەی پیس بە دەستی کافر و مولحیدان دژی قورئان کێشراوە، و ئەوپەری مەترسیی بۆ موسڵمانان هەیە ، بۆیە بریاری داوە دەست لە دنیا بشوات و خۆی بۆ خزمەتی حەقیقەتەکانی قورئان یەك لایی بکاتەوە، بریاری دا ، نەك دەست لە خۆشیی و بەختەوەریی دنیا هەڵ بگرێت ، بەڵکو دەست لە خۆشیی و بەختەوەریی قیامەتیش هەڵ بگرێت ، تا بتوانێت بە شێوەیەکی رێك و پێك خزمەتی قورئان بکات، هەتا دەری ئەبرێت، کە ئەگەر دە حۆرییشی پێ بدەن ، لە پێناوی ئەنجام دانی ئەو خزمەتە پاك و بێگەردەدا ، ناچارە دەستیان لێ هەڵ بگرێت، چونکە ئەو رێکخراوە مولحیدانە بەوپەری بێ ویژدانییەوە هێرش ئەکەنە سەر ئیسلام، بۆ ئەمە پێویستە ئەوپەری هەوڵ و کۆشش بکرێت و ، لەو پێناوەدا موسڵمانان هەموو شتێك بکەنە قوربانیی و ، بەوپەری ئیخلاصەوە نیەتی کار بۆ خوا بهێنن.

دووهەم : ژن هێنان سوننەتێکە ، بەڵام لەم زەمانەدا زۆرێك لە زانایان بۆ دابین کردنی ژیان و گوزەرانی ماڵ و منداڵیان خۆیان تووشی چەند حەرامێك کردووە . جا بۆ خۆپاراستن لەو حەرامانە و ، بۆ ئەوەش بتوانێت فەرز و واجبەکان بەجێ بهێنێ ، بریاری دا واز لەو سوننەتە بهێنێ .

سێهەم : ئەو ئایەت و فەرموودانەی، کە موسڵمانان هەڵ ئەنێن بۆ ژن هێنان بە شێوەی واجب و هەمیشەیی نین ، بەڵکو سوننەت و موستەحەبن و ، پێویستە مەرجەکان بێنە دیی . ئەگینا لە مێژووی ئیسلام دا هەزاران پیاوچاك کەناریان

گرتووە و ، بە گۆشەگیریی خواپەرستییان کردووە ، هەتا بتوانن پلە ئیمانییەکان بپرن و بگەنە کەمالات .

مامۆستاش ئاوات ئەخوازێت، کە ئەوەندەی زەررەیەك لە فەرمایشتە راستگۆییەکەی صددیقی ئەکبەری خوا لێی رازیی بێت دەست بکەوێت ، کە ئاواتی خواستووە لاشەی ئەوەندە گەورە ببێت هەتا ببێتە پڕ بە پڕی جەهەننەم و جێی هیچ ئیماندارێکی تێدا نەبێتەوە

چوارەم : فەرمان نەدراوە، کە قوتابیان ژن نەهێنن ، بەلام قوتابیی پلە بەرزەکان پێویستە ئەوەندەش پابەندی دنیا نەبێت ، تا بتوانێت بگاتە ئیخلاصی تەواو و ، خزمەتی شیاو پێشکەش بکات، بەلام ئەگەر موسڵمانێك ئافرەتی دامەزراو و کۆمەکیکەری دەست کەوت ئەوا جێی خۆیەتی ژن بهێنێ ، تا هاوسەرەکەشی یارمەتیی بدات، زۆر جاریش ئەبێت، کە هاوسەرەکەی پێشی بداتەوە ، چونکە ئافرەتان شەفەقەتیان زیاترە، ئەو کاتە ئەو ماڵە پیرۆزانە ئەبنە قوتابخانەی نووریی بۆ گەیاندنی ئیمان و پەروەردەکردن .[٣٣]

هەروەها هەندێك لە دۆستان لەوە سەرسامن، کە مامۆستا نوورسیی ریشی نەهێڵاوەتەوە، جا ئەو خۆشەویستانە وا چاکە پەلە نەکەن ، تامامۆستا بە جوانیی تێیان بگەیەنێت .

دیارە هێشتنەوەی ریش سوننەتێکی پێغەمبەرە و وا چاکە هەموو موسڵمانێك پەیرەویی بکات ، بەلام مامۆستا نوورسیی هەر بە منداڵیی ریشی نەهێڵاوەتەوە و، پیاوانی دەوروبەریشی لە صەدا نەوەدیان ریشیان تاشیوە، دوژمنانیش زۆر جار هەڵمەتیان ئەدا و ریشی هەندێك لە دۆستانیان ئەتاشیی ، ئیتر مامۆستا لە

---

[٣٣] سیرة ذاتیة : ٤٩٣ ـ ٤٩٥ .

حيكمەتی ريش نەهێشتنەوەی خۆی تێگەيشت و ، دەری ئەبرێ، كە ئەگەر ريشی بهێلايەتەوە پەيامەكانی نوور تووشی زيانێكی زۆر ئەبوون، چونكە مامۆستا بەرگەی نەئەگرت و ئەمرد

هەندێ لە زانايان وتوويانە : ريش تاشين جائيز نيە ، مەبەستيان ئەوەيە دوای هێشتنەوەی نەتاشرێ ، چونكە ئەو كاتە تاشيينی حەرامە ، بەلآم نەهێشتنەوەی تەركی سوننەتە، مامۆستا لە خوا داوا ئەكات، كە لە ماوەی بيست ساڵ دا چيی سزا و ئازاريان چەشتووە بيكاتە، كەفارەتی بەجێنەهێنانی ئەو سوننەتە بەرۆژە.[٣٤]

هەروەها خوشكی بەرێز شاهێدە يۆكسێل باس ئەكات :

لە كاتی مەحكەمەدا حاكم ئەم پرسيارانەی ئاراستەی مامۆستا كردن :

ـ كارت چيە ؟

ـ رزگاركردنی ئيمان ، چونكە ئيمانی براكانم ئاگری تێ بەر بووە

ـ بۆچی ريشت نەهێلاوەتەوە ؟

ـ بۆ ئەوەی ئێوە نەی تاشن .

ـ بۆچی وازت لە سوننەتی ژنهێنان هێناوە ؟

ـ ئەوانەی ئەم سوننەتەيان بەجێهێناوە ، وازيان لە فەرزەكان هێناوە [٣٥]

بچووكترين برای مامۆستا نوورسيی مامۆستا عەبدولمەجيد بووە ، كە زۆرێك لە پەيامەكانی وەرگێراونەتە سەر زمانی عەرەبيی ، بەلآم لەو كاتەدا لە چوارچێوەيەكی تەسكدا بلآو كراونەتەوە . هەروەها پەيامە عەرەبييەكانيشی ،

[٣٤] الملاحق ـ ملحق أميرداغ : ١ / ٢٥٠

[٣٥] صۆن شاهيدلەر ٣ / ٤١٢ ، نقلاً عن سيرة ذاتية : ٤٩٦

وەك ( إشارات الإعجاز ) و ( المثنوي العربي النوري ) ، وەرگێڕاونەتە سەر زمانی توركیی، مامۆستای زمانی عەرەبیی بووە، و پاشان بۆتە موفتیی و ، پاشان بۆتە مامۆستای زانستە ئیسلامییەكان لە پەیمانگای ئیمام و خەتیب و ، پەیمانگای ئیسلامیی لە قۆنیا، لە تەمەنی هەشتا و سێ ساڵیی و ، لە ساڵی ١٩٦٧ ز دا كۆچی دوایی كردووە

عوبەیدی خوشكەزایشی یەكێ بووە لە قوتابییە لێهاتووەكانی و پێكەوە بەشداریی جەنگی جیهانیی یەكەمیان كردووە و ، لە نزیك مامۆستادا ، بەر لەوەی، كە مامۆستا نوورسیی بە دیل بگیرێ شەهید ئەبێت و ، مامۆستاش، كە بە دیل ئەگیرێت سێ مانگ رێگا دوور ئەخرێتەوە و ، بێ ئەوەش، كە شوێنی ناشتنی بزانێ خەوی پێوە ئەبینێ و، بۆیشی دەرئەكەوێ، كە پلەی شەهیدیی وەرگرتووە.[٣٦]

عەبدورەحمانی[٣٧] برازاشی، كە قوتابییەكی چابوك و بەغیرەت بووە و، خزمەتی كاری مامۆستای كردووە ، لە ساڵی ١٩٢٠ ز لێی دوور ئەكەوێتەوە .. بەمە هەندێ بێ ئاگایی و گومان و شتی پرو پووچی دنیا سەری لێ هەڵ ئەدەن و ، وای بە چاك ئەزانێ داوای كۆمەكیی لە مامەی بكات ، تا بەڵكو فریای بكەوێ و لەو نەخۆشییانە رزگاری بكات ، چونكە متمانەی بە خواناسیی مامەی زۆر بوو. ئەوەبوو قورئانی پیرۆز فریای كەوت و ، بە هیممەت و بەرەكەتی پەیامی حەشری،

---

[٣٦] كليات رسائل النور ، المكتوبات ، الجلد الثاني : ٧

[٣٧] عەبدوڕڕەحمان كوڕی مەلا عەبدوڵلای برا گەورەی مامۆستا بووە و ، لە ساڵی ١٩٠٣ دا لە گوندی نوورس لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٢٨ كۆچی دوایی ئەكات و لە گوندی ( ذو الفضل ) لە نزیك شاری ئەنقەرە ئەی نێژن . لە ساڵی ١٩١٨ وە هەتا ساڵی ١٩٢٢ لە خزمەتی مامۆستا نوورسییدا ئەبێت و ، بۆ بڵاوكردنەوەی نووسینەكانی یارمەتیی ئەدات .

سێ مانگ بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات ، گەیاندە دەستی، بە هۆی بەرەکەتی قورئانەوە پەیامەکە دەوری خۆی بینیی و لەو چلك و چەپەڵییە و لە بێ ئاگـایی رزگاری کرد ، بگرە پێی گەیشتە پلەیەك لە پلەی ویلایەت ئەچوو، کە ئەوەبوو ئەو نامەیەی، کە بۆ مامۆستا نوورسیی نووسیی بوو، سێ کەراماتی تیـا بـوو، کـە یەکێکیان ئەوەبوو هەواڵی کۆچی دوایی خۆی دەرخستبوو .[٣٨]

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد، کە مامۆستا نوورسیی لە هەردوو سەری دایکی و باوکیەوە ئەچێتەوە سەر ئال و بەیت .. بەڵێ شاهێدی زۆر ئەوەیان گێراوەتەوە، کە مامۆستا نوورسیی لە کۆڕە تایبەتییەکانیدا ئەوەی دەربریوە، کە نەسەبی لـە سەری باوکیەوە بە ئیمام حەسەن و لە سەری دایکیشیەوە بە ئیمام حوسەین خـوا لێیان رازیی بێ ئەگات ، بەلاّم لەبەر لە دەست نەدانی ئیخلاص و ، لەبەر ئەوەش کە لەبەر چاوی خەڵکییدا نەبێتە خاوەنی پلەیەکی مەعنەویی ، لە پەیامەکانیدا ئەوەی راستەوخۆ دەرنەبریوە ، ئەگەرچیی ئاماژەی بۆ کردووە

بۆ نموونە : لە یەکێ لە کۆڕەکانیدا ئەڵێت : (( براکەم ! ئەو کەسەی کە نەسـەبی بە عەلیی سەردارمان خوا لێی رازیی بێ ئەگاتەوە ، مـنم ، چونکە هـەر شـتێکم دەست کەوتووە لە رێی ئەوەوە بۆم هاتووە ... )) (ضۆن شاهێدلەر : ١ / ٢٤٠ ) .

هەروەها بۆ نموونە ئەڵێت : (( صاڵحی برام ! تـۆ بـە راسـتیی سـەییدی ـ لـە ئـەهلی بەیتی ـ و ، نوورییەش هەروەها سەییدە و ، میـرزاش هـەر سـەییدە )). ( صۆن شاهێدلەر : ٣ / ٢٠١ )

---

[٣٨] الـمکتوبات : ٤٦١ ، کلیات رسائل النور ، الـمجلد السابع ، الـملاحق ـ بارلا : ٢٩

**هەروەها بۆ نموونە ئەڵێت : (( من سەییدم ـ لە ئەهلی بەیتم ـ ، بەڵام ئاگادار بە ئەوە بۆ کەس باس نەکەیت .. دایکم حوسەینییە و ، باوکیشم حەسەنیی)).** ( صۆن شاهێدلەر : ٣ / ٢٣٨ ) .

سەرەرای ئەمانەش هەر یەکە لە لێکۆڵەران نەجمەددین شاهین ئەر و ، عەبدولقادر بادللیی و ، موحەممەد مەلا زاهید مەلا زوگوردیی دوای وردەکاریی و بە دوادا گەران گەیشتوونەتە ئەو رایە کە نەسەب و نەژادی مامۆستا نوورسیی بەم شێوەیە :

باوکی : ناوی صۆفی میرزای کوری عەلیی کوری خضری کوری میرزا خالیدی کوری میرزا رەشانە ، لە عەشرەتی ئیسپاریت .

دایکیشی : ناوی نووریەی کچی مەلا طاهیرە لە گوندی ( بلکان ) کە لە گوندی نوورس‌ەوە سێ سەعات دوورە و ، لە عەشرەتی ( خاکیف ) ە ، کە هەردوو عەشرەتەکەیان ئەچنەوە سەر هۆزە کوردەکانی هەکاریی ..

بەڵێ مامۆستا هیچ پلەیەکی مەعنەویی بۆ خۆی نەئەویست ، بەڵام چ خەڵك و چ کاربەدەستانیش بروایان وەها بوو، کە پلەی بەرزی لای خوا هەیە ..

ئەوەبوو خەبیرەکانی دادگای دەنیزلیی دەربارەی قوتابیانی نوور دەریان بریی بوو ، بە پێی بیروبۆچوونی هەندێکیان ، کە ئەگەر سەعید نوورسیی رای بگەیەنێ ( مەهدیی ) یە ، ئەوا هەر هەموو قوتابیانی بە سنگێکی فراوانەوە تەصدیقی ئەکەن، بەڵام مامۆستا ، بۆ لە دەست نەدانی ئیخلاص ، خۆی لەوە بە دوور ئەگرێت ، ئەگەرچیی دەری بریوە، کە مەهدیی ئاخرزەمان لە ئالی بەیتە و، خۆیشی بە کوری مەعنەویی ئیمام عەلیی لە قەڵەم داوە ، چونکە دەرسی حەقیقەتی لێوە وەرگرتووە و ، یەکێ لە ماناکانی ئالی موحەممەدیش ﷺ قوتابیە راستەقینەکانی نوور ئەگرێتەوە، ئیتر بەو بۆنەوە خۆی لە ئال و بەیت ئەژمێرێ ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم زەمانە زەمانەی کەسێتیی مەعنەوییە و ، لە رێبازی

پەيامەكانی نووريش‌دا بە هيچ شێوەيەك ڕێ بە حەزكردن لە ئەنانيەت و خۆخۆش ويستن و چاوگێران بۆ پايە و پلەی بەرز و ناوبانگ دەركردن نادرێ ، چونكە ئەوانە هەموويان دژی ئيخلاصن ..

شايانی باسە، كە مامۆستا ، وەك خۆی دەری ئەبرێ ، بە هيچ شـێوەيەك لـە خۆی رازيی نەبووە و ، هەوڵی پايە و پلەی نەداوە ، هەتا ئەگەر پلەی قيامـەتيی بەرزيشی پێشـكەش بكرێـت ، لەبـەر لەدەسـتـنـەدانی ئـيخلاص بـۆ خزمـەتی پەيامەكان ، ناچارە دەستيان لێ هەڵ بگرێت ..

كە ئەمەی سەرەوە ئەدات بە گوێی خەبيرەكان‌دا بێ دەنگ ئەبن .[٣٩]

---

[٣٩] الملاحق : ٣١٦ ، سيرة ذاتية : ٣٦ ـ ٤٠

### شەشەم : وت و ویژ لەگەڵ موصطفا پاشادا

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم رەحمەتی خوای لێبێ پلەی پاشایەتیی بە هەندێ لە سەرۆك عەشرەتە کوردەکان بەخشیی بوو، چونکە ئەوانە پیاوانی عەشرەتەکانیان بە دوایانەوە بوون، و چەکداری لێ هاتوو بوون بۆ بەرگریی لە وڵاتی ئیسلام، و پاراستنی سنووری تورکیا لە خۆرهەڵاتەوە تا سوپای رووس سنوور نەبەزێنێ و ، دانیشتوانیش لە هەڵمەتی چەکدارانەی ئەرمەنیەکان بپارێزن. لە هەمان کاتدا ئەو سەرۆکانە لە دەوڵەت یاخیی نەئەبوون ، بۆیە سوڵتان وای بە چاك ئەزانیی، کە ئەوانە بلاوێنێ و دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات .

بەڵام یەکێ لەو سەرۆك عەشرەتانە ، کە ناوی موصطەفا پاشای سەرۆك عەشرەتی میران بوو ، یەکجار زاڵم و مەغروور بوو ، بە رادەیەك، کە دانیشتوانی جەزیرەی ئیبن عومەر و دەوروبەری بە دەست زوڵم و ستەمیەوە گیریان خواردبوو .

شەوێکیان مەلا سەعید لە خەویدا بە خزمەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی ـ قدس سره ـ گەیشت ، کە یەکجار خۆشی ئەویست، لە خەویدا فەرمانی بەسەردا دا :

ـ مەلا سەعید ! .. بچۆ بۆ لای موصطەفا پاشای سەرۆك عەشرەتی « میران » و فەرمانی بەسەردا بدە بۆ وەرگتنی هیدایەت و ، وازهێنان لە زوڵم و ، بەجێ هێنانی نوێژ .. ئامۆژگارییشی بکە تا فەرمان بە چاکە بکات، جا ئەگەر بە گوێی نەکردی بی کوژە

بەیانیی زوو مامۆستا خۆی ئامادەی سەفەر کرد و بەرەو ( جەزیرە ) کەوتە رێ، کە گەیشت موصطەفا پاشا لەوێ نەبوو، هەواڵی زانیی وا لەسەر کێلگەکەی لەسەر بانێکی نزیك، کە رۆیشت چووە چادرەکەیەوە و لەوێش نەبوو.. دانیشت و چاوەروان بوو، پاشا بگەرێتەوە

دوای کەمێك پاشا گەرایەوە .. هەر هەموو بەرزە پێ لەبەر پاشا هەستان جگە لە مەلا بچکۆلە، پاشا چاوی لێ بوو وا مەلا سەعید لەبەری هەڵ نەسا

کە دانیشت ، پرسیاری لە یەکێ لە سەرۆك عەشرەتەکان کرد، کە فەتاح ئاغا بوو، ئەم مەلا گەنجە کێیە ؟ وتی : مەلا سەعیدی مەشهوورە، پاشا پیشی نەخواردەوە .. بەلاّم هەر چۆن بوو، خۆی گرت و ، سەیری مامۆستای کرد و لێی پرسیی :

ـ بۆچیی هاتوویت بۆ ئێرە ؟

مامۆستاش بەوپەری دامەزراویی و متمانەوە وتی :

ـ هاتووم بانگت بکەم بۆسەر هیدایەت .. جا یا ئەوەتا دەست لە زوڵم هەڵ ئەگریی و ، دەست بە نوێژ ئەکەیت ، یان ئەت کوژم !

پاشا ئەوەندەی تر توورە بوو ، چونکە تا ئەو رۆژە کەس نەی وێراوە بەو شێوازە قسەی لەگەڵدا بکات، بە توورەییەوە پرسیی :

ـ ئەی ئەگەر وەهام نەکرد، کە تۆ ئەڵێیت ؟

بە هەمان متمانە و دامەزراوییەوە وتی :

ـ ئەت کوژم !

کوڕی پاشا ورتەی لێ نەئەهات .. کەس نەی ئەوێرا دوولێوە بکات .. هەر هەموو بیریان لەوە ئەکردەوە، کە تازە ئەم مەلا گەنجە تیاچوو و ، لە دەستی پاشا دەربازبوونی نیە .. پاشایش بروای نەئەکرد شتی وەهای پێ وترا بێ .. کێ ئەوێرێ؟ هەر چۆن بوو خۆی گرت .. بەلاّم نەی توانی لە چادرەکەدا دابنیشێ .. ناچار چووە دەرەوە ، هەندێ ئەمسەر و ئەوسەری کرد و توورەییەکەی کەم بوویەوە، و گەرایەوە ژوورەوە

پرسیارەکانی دووبارە کردنەوە :

ـ بۆچیی هاتوویت بۆ ئێرە ؟

ـ لە پێشەوە هۆی هاتنم بۆت باس کرد

پاشا دەستی بۆ شمشێرەکەی مامۆستا درێژ کرد کە بە کۆڵەکەی چادرەکەوە هەڵی واسیی بوو، و بە گاڵتە پێکردنێکەوە لێی پرسیی :

ـ گوایا بەم شمشێرە ژەنگاوییە ئەمکوژیی ؟

مامۆستا بە توندیی وەڵامی دایەوە :

ـ شمشێر نابرێت .. بەڵکو دەست ئەبرێت ..

موصطەفا پاشا جارێکی تر بەوپەری توورەییەوە لە چادرەکە چووە دەرەوە هێشتا دەستی لە هیچ زانایەکی دین نەوەشاند بوو، کەچیی وا مەلای گەنج خەریکە ناچاری بکات دەستی لێ بوەشێنێ و دەستی بە خوێنی سوور بکات .. ئەم مەلا گەنجەش مەلایەکی ئاسایی نەبوو ، بەڵکو مەلایەکی وەها بە ناوبانگ بوو، کە هەموو دنیا باسی زیرەکیی ئەوی ئەکرد و ، لەوانەشە زۆرێك لە پیاوانی دەورووبەری پاشا خۆشیان بوێت .. کەواتە کوشتنی مەلایەکی وەها ناودار زۆر ئەکەوێ لەسەری ..

لە دەرەوە نەخشەیەك بە دڵیدا هات ، بۆیە دوای کەمێك گەرایەوە بۆ ناو چادرەکە و ، بە مامۆستای وت :

ـ لە ناوچەی جەزیرەی ئیبن عومەردا زانای زۆرم هەن و ، پێش برکێیەك لە نێوانتاندا رێك ئەخەم ، جا ئەگەر توانیت بەسەریانا زاڵ ببی هەرچیی بڵێیت بە گوێت ئەکەم ، بەڵام ئەگەر ئەوەت لێ نەیەت ئەت خەمە رووبارەکەوە

هەر هەموو چاویان بریبە مەلا سەعیدی بچووك و چاوەروان بوون وەڵام بداتەوە..

مامۆستا هاتە وەڵام :

ـ وەك من مافی ئەوەم نیە ئەوە رابگەیەنم، کە بەسەر هەموو ئەو زانایانەدا زاڵ ئەبم ، تۆش مافی ئەوەت نیە من بخەیتە رووبارەوە، بەڵکو ئەگەر توانیم پرسیاری ئەو هەمووە زانایە وەڵام بدەمەوە ئەوا من داوای تفەنگێکی ماوزەرت لێ ئەکەم ، هەتا ئەگەر بەڵێنەکەی خۆتت بەسەر نەبرد بەو تفەنگە بت کوژم .

هەموو لە کێڵگەوە گەرانەوە بۆ ناو شار، کە ئەکەوتە سەر رووباری دیجلە و ، پاشایش لە رێگا دوو لێوەی لەگەڵ مامۆستا نەکرد .. ناردی بـە دوای زانایـانی شاردا و ، داوای لێکردن خۆیان ئامادەی پێشبرکێ بکەن و ، گرانترین پرسیاریش ئامادە بکەن و لە کاتی دیاریکراودا کۆببنەوە

پاشا زۆر پەلەی بوو، ئەو کۆرە بگێرێ و بە دەست مەلاکانی شـار دەرسـێکی چاکی ئەو مەلا گەنجە دابدات، کە هەرگیز لە یادی نەکات، چونکە ئەگەر زاناکان بی بەزێنن ، ئیتر ناوبانگی نامێنێت و ، پاشا ئەتوانێ بە ئارەزووی خـۆی سـزای بدات ..

مامۆستا بە بۆنەی ئەوەوە، کە لە سەفەردا زۆر ماندوو بوو بوو، داوای لە پاشا کرد شوێنێکی بۆ تەرخان بکات بۆ خەوتن، هەرکە راکشا چووە خەوێکی قووڵەوە و، هیچ باکی لە تاقیکردنەوە نەبوو، لەولاوە زاناکان خەریکی ئـەم دیـو و ئـەو دیوی پەرەی کتێبەکان بوون و ، هەوڵیان ئەدا گـرانترین پرسـیار بدۆزنـەوە بـەو هیوایەی بی بەزێنن ..

دوای چەند سەعاتێك لە خەوی قووڵ ، مامۆستا چاوی کردەوە ، سەیری کرد وا زانایان کۆریان بەستووە و ، پاشایش چاوەروانی ئەوە

مامۆستا چووە کۆری زانایان و سەلامی لێکردن ، پاشان دانیشت و ، دەسـت کرا بە چا گێران .. بەڵام زاناکان وەها پەشۆکابوون ئاگایـان لـە چـا خواردنـەوە نەبوو.. لە نێوان خۆیان دا بە چپەوە وت و وێژیان ئەکرد، بەڵام مەلا سەعید بەبێ

باك دەستی دایە چا خواردنەوە و ، چاوەڕوانی پرسیاری زانایان بوو .. کە سەیری کرد وا پەشۆکاون ، دەستی دایە پیاڵە چایی سیان چوارێکیان و ، هەر بۆ خۆشیی یەك لە دوای یەك خواردنیەوە

موصطفا پاشا بە وردیی چاوی لە کۆڕی زانایان بوو .. سەرنجی دا وەك زاناکان پەشۆکاون ، مامۆستای گەنج هیچ باکی لە تاقیکردنـەوە نیـە .. ئـەوەبوو رووی کردە زاناکان و پێی وتن :

ـ بەڕێزان ! من خوێندەوار نیم ، بەڵام هەر لە ئێستەوە ئەزانم ئێوە لەبـەر دەم مەلا سەعیدا ئەدۆڕێن، چونکە سەرنجم دا ، ئێـوە ئەوەنـدە پەشـۆکاون بـە بـیر کردنەوە هەتا چا خواردنەوەتان لە یاد چووە ، کەچیی مەلا سەعید سێ چوار پیاڵە چایی ئێوەشی خواردەوە

زاناکان شڵەژا بوون ، چونکە ئەترسان ئەم زانایە ، کە ناوبانگیان بیسـتووە ، پرسیاری وەها قورسیان لێبکات ئەوان نەتوانن وەڵامی بدەنەوە، بەڵام مامۆستا هێوری کردنەوە و پێی راگەیاندن، کە ئەو پرسیار لە هیچ کەسیان ناکات ، بەڵکو ئەو ئامادەیە ئەوان پرسیاری لێبکەن ..

مامۆستاکان هەستیان بە خۆشیی و ئارامییەکی زۆر کرد ، ئەوەبوو نزیکـەی چل پرسیاری قورسیان کۆ کرنەوە تا لە مامۆستایان بکەن، ئەویش بە بێ وەستان و گورج و گۆلیی وەڵامی دانەوە، بەڵام وەڵامی پرسیارێکی بە هەڵە دابوویەوە و، زاناکانیش هەستیان پێ نەکرد و ، رەزامەندییان لـە وەڵامـەکان دەربریـی، کـە ویستیان هەڵسن و کۆتایی بە کۆڕەکەیان بهێنن ، مامۆستا وەڵامـە راسـتەکەی هاتەوە یاد ، بۆیە وەستاندنی و پێی وتن :

ـ ببوورن بەڕێزان ! لە وەڵامی فلانە پرسیاردا سەهووم کردووە ، وەڵامی راستی بەو جۆرەیە

ئەوەندەی تر سەرسام بوون و دانيان بە زۆريی زانستيدا نا .. هەتا هەندێكيان داوايان لێكرد چەند دەرسێكيان پێ بڵێت .

موصطەفا پاشـايش بەڵێنەكـەی خـۆی بەسـەر بـرد و تفەنگـە ماوزەرەكـەی پێشكەش كرد و ، دەستی بە نوێژ كرد

هێشتا مامۆستا نوورسيی لە جەزيرە بوو، موصطەفا پاشا پێش بركێيەكی بە ئەسپ رێك خست و ، ژێر بە ژێريی ماينێكی سەركەشی بۆ مەلا سەعيد هێنا.. مامۆستای گەنج، كە تازە تەمەنی بوو بووە، شانزە ساڵان پەرييـە سـەر پشـتی ماينەكە و ئەی ويست بە راست و بە چەپ‌دا هەڵی بسوورێنێ ، كەچيی ماينەكە بە پێچەوانەوە هەنگاوی ئەنا چەند هەوڵی لەگەڵيا دا كەڵكی نەبوو.. ماينەكە بە سەركەشيی رووی لە ناوچەيەك نا، كە منداڵان يارييان تێـدا ئـەكرد .. لـەوێ منداڵی يەكێ لە نـاوداراني جـەزيرەی خسـتە ژێـر .. منداڵەكـە لـە ژێـر پێـی ماينەكەدا ئەگەوزايەوە خەڵك هەڵمەتيان دا منداڵەكە رزگار بكەن ، كەچيی سەيريان كرد وا منداڵەكە لە جووڵە كەوتووە .. ويستيان مەلا سەعيد بكوژن .. خەنجەريان بۆ دەرهێنا مەلا سەعيدی بچكۆلەش ئازايانە دەستی خسـتە سـەر دەمانچەكەی و رووی تێ كردن و وتی :

ـ لە روانگەی راستييەوە ، خوای پاك و بێ گەرد ئەو منداڵەی مراند ، بەلاّم بە رواڵەت ماينەكە كوشتوويەتی خۆ ئەگەر لە گۆشـەی هۆكاريشـەوە سـەرنجی كارەكە بدرێ ، موصـطەفا كەچەڵ ، كە ماينەكەی بە من داوە ، كوشتوويەتی دەی با تەماشای منداڵەكە بكەين .. ئەگەر مردبوو ، با جـەنگ بكـەين .. لـە ماينەكە دابەزيی و باوەشی بـە منداڵەكـەدا كـرد كـە ديتـی وا لـە جووڵـە كەوتووە، لە ئاوی سـاردی هـەڵ كێشـا و ، خێـرا لـە ئاوەكـەش دەری هێنـا

منداڵەکە بە زەردەخەنەوە چاوی کردەوە و ، خەڵکەکەش لە رووداوەکە سەرسام بوو بوون ..

مامۆستا لە جەزیرە ماوەیەك مایەوە و ، پاشان لەگەڵ مەلا صالح دا ، کە یەکێ لە قوتابییەکانی بوو، بەرەو ( بیرو ) رۆیشتن، کە ناوچەی بەدووی عەرەب بوون .. ماوەیەکیش لەوێ مایەوە و ، هەتا ئەوەبوو بیستی موصطەفا پاشا لە بەڵێنەکەی پاشگەز بۆتەوە و ، دەستی داوەتەوە زوڵم و ستەم، هاتەوە بۆ لای و هەندێ ئامۆژگاریی کرد ، پاشان هەرەشەی لێکرد و پێی وت :

- جارێکی تر دەستت بە زوڵم و ستەم کردۆتەوە .. بە ناوی ( حەق ) ئەتکوژم.

نووسەری پاشا کەوتە بەین و هەڵوێستەکەی هێور کردەوە ، بەڵام مەلا سەعید هەر کۆڵی نەدا و ، بەردەوام هەرەشەی لە پاشا ئەکرد لەسەر زۆریی ستەمەکانی . پاشا لەسەر ئەو سووکایەتییانە یەکجار توورە بوو، و ویستی مامۆستا بکوژێت ، بەڵام پیاوماقووڵانی عەشرەتی میران نەیان هێشت .. پاشان عەبدولکەریمی کوری پاشا لە مامۆستا پارایەوە، کە گوێ بە کردەوەکانی باوکی نەدات ، چونکە قسە لە کەس وەرناگرێ و ، کابرایەکی بێ دینە . لێی پارایەوە کە تەشریف بەرێت بۆ شوێنێکی تر .. مامۆستاش بە گوێی کرد و ، بەرەو بیابانی ( بیرو ) رۆیشت هەرچەندە تووشی جەردە و رێ بر ئەهاتن ..

دوای چەند رۆژێك گەیشتە ماردین، لەوێش زانایان ویستیان بەرهەڵستیی بکەن و بی بەزێنن ، کەچیی نەیانتوانیی ، سەرەنجام بە مامۆستای خۆیان لە قەڵەمیان دا ، هەر چەندە ئەو لە تەمەنی منداڵەکانیاندا بوو .

لەو ماوەیەدا مامۆستا گەیشت بە دوو قوتابیی ، کە یەکێکیان لە قوتابیانی سەیید جەمالوددینی ئەفغانیی بوو و ، ئەوی تریشیان هەڵگری تەریقەتی

سنووسيى بوو .. بە هۆى ئەو دوو قوتابييەوە لە مەنهەجى ئەفغانيى و تەريقەتى سنووسيى شارەزا بوو .. [٤٠]

[٤٠] سيرة ذاتية : ٥٥ ـ ٥٨ ، رجل القدر : ١٧

### حەوتەم : لە شاری بەدلیس دا

که دەنگ و باسی زیرەکیی مامۆستا لە ماردین بلاّو بوویەوە ، نادر بەگی پارێزگار ئەوەی پێ خۆش نەبوو ، بەڵکو بڕیاری دا دەریبکات، ئەوەبوو بە کۆت و زنجیرەوە دایە دەست دوو جەندرمە تا رەوانەی بەدلیسی بکەن .

لە رێگای بەدلیس‌دا کاتی نوێژ هاتە بەرەوە .. مامۆستا داوای لە جەندرمەکان کرد کۆتەکانی لە دەست بکەنەوە هەتا نوێژەکەی بەجێ بهێنێ ، کەچیی بە گوێیان نەکرد .. مامۆستا زۆر بە ئاسانیی کۆتەکانی لە دەستی داکەند و خستنیە بەردەمیان .. هەردوو جەندرمەکە واقیان وڕما و ، بە کەرامەتیان لە قەڵەم دا ، بۆیە بە تکا و پارانەوەوە پێیان وت :

- تا ئێستا ئێمە پاسەوانت بووین ، بەلاّم لەمەو دوا خزمەت کارتین ..

هەر، کە پرسیار لە مامۆستا ئەکرا کە کۆتەکان چۆن کرانەوە ؟

ئەی وت : منیش نازانم ، تەنها کەرامەتی نوێژ بوو .

رۆژێکیان لە بەدلیس ئەوەی بەرگوێ کەوت، کە والیی و کۆمەڵێك لە فەرمان بەران خەریکی عارەق خواردنەوەن، کە ئەوەی بیست بە یەکجاریی هەڵ چوو و وتی: کەسێك، کە نوێنەری حکومەت بێت لە شارێکی موسڵمانی وەك بەدلیس‌دا نابێ کاری وەها بکات، خێرا چوو بۆ کۆڕی عەرەق خواردنەوەکە و ، یەکەم جار ئامۆژگارییەکی گەرم و گوری کردن و بە فەرموودەیەکی شەریف دەربارەی عەرەق ئامۆژگارییەکەی دەست پێ کرد ، پاشان دەستی دایە وتەی توند و تیژ و جەرگ بڕ و ، دەستیشی بەسەر دەمانچەکەیەوە بوو، چونکە ئەگونجا والیی ئاماژە بکات بۆ چەکدارانی تا دەستی لێ بکەنەوە، بەلاّم والیی زۆر هێمن و خۆگر بوو، و دەمی نەکردەوە

کە مامۆستا ویستی کۆڕەکە بەجێ بهێڵێ هاورێکەی والیی پێی وت :

ـ چيتان كرد ؟ ئەم قسانەتان هەقی سێدارەيان هەيە .

" سێدارەم بە بيردا نەهاتووە ، بەڵكو وام دانا بوو، سزای ئەمە بەند كردن يان نەفيی كردن بێت .. بە هەر حاڵ ، ئەگەر لە پێناوی لابردنی كردەوەيەكی خراپدا بمرم زيانێكم نەكردووە ! "

دوای دوو سەعات لە گەرانەوەی لەو كۆرە واليی دوو پۆليسی نارد بۆ لای تا بانگی بكەن .

مامۆستا چوو بۆ لای واليی و ، ئەويش بەوپەری رێز و پايەدارييەوە بە خێرهاتنی لێكرد و ، هەڵمەتی دا دەستی ماچ بكات و وتيشی :

ـ هەموو كەسێك مامۆستايەكی پێشەنگی هەيە ، تۆيش مامۆستای پێشەنگی منی .

عومەر پاشای واليی بەدليس وەك وانەيەكی چاكی لە مامۆستا وەرگرت ، لە هەمان كاتدا زانست و زانايانی يەكجار خۆش ئەويستن ، بۆيە بە گەرميی داوای لە مامۆستا نوورسيی كرد تا لە ميوانخانەكەيدا بمێنێتەوە .. ئەوەندە تەكليفی لێ كرد تا مامۆستا دوو ساڵ لەلای مايەوە .. شايانی باسە، كە عومەر پاشا خاوەنی كتێبخانەيەكی گەورە ئەبێت ..

عومەر پاشا شەش كچی ئەبن سيانی بچووك و سيانی گەورە و عازەب .. جا هەر چەندە لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا لە يەك خانوودا پێكەوە ئەژيان ، مامۆستا هێشتا سێ كچە گەورەكەی جيا نەئەكردنەوە و نەی ئەناسين ، چونكە لێيان ورد نەئەبوويەوە، رۆژێكيان مامۆستايەك ئەبێتە ميوانی مامۆستا نوورسيی و ، لە ماوەی دوو رۆژدا كچەكانی ئەناسێ و جيای ئەكردنەوە، ئەوانەی، كە لە دەور و بەری مامۆستادا ئەبن سەرسام ئەبن لەوەی، كە لە ماوەی دوو ساڵدا ئەو كچانەی نەناسيون و لێيان ئەپرسيی :

ـ بۆچ سەيرت نەكردوون ؟ ئەويش وەڵامی ئەدانەوە :

" پاراستنی پايەداريی زانست نەزەری حەرامی لێ قەدەغە كردووم !! " [٤١]

كە مامۆستا سەعيد لە بەدليس گەيشتە تەمەنی بالّغ بـوون گـەرم و گـوڕيی سنووحات لە دلّ و دەروونيدا كەميان ئەكرد ، بۆيە وای بە چاك زانيی سەرگەرمی لەبەركردنی مەتنی كتێبە ئيسلامييە رەسەنەكان بێت لە هەموو زانست و بوارێك دا .. بۆ ماوەی دوو سالّ سەرگەرمی لەبەركردن بوو ، تا ئەوەبوو نەوەد كتێبی لە عەقيدە و نەحو و صەرف و مەنطيق و تەفسير و حەديـث و فيقهـ و زانستی كەلام لەبەركردن و هەر سێ مانگ جارێـك و رۆژانـە سـێ سـەعات بـە هـەموويان‌دا ئەچوويەوە، ئەم لەبەر كردنەش هەروا كوێرانە نەبوو ، بـەلّكو لەگـەلّ قـوولّترين تێگەيشتن‌دا بوو .. ئەوەبوو كتێبی ( المرقاة ) ی [٤٢] لەبەر كرد ، بەلاّم بايەخی بە حاشيە و شەرحەكانی نەدا ، پاشان بەراوردی تێگەيشتنی خۆی لەگەلّ ئەو حاشيە و شەرحانەدا كرد ، سەيری كرد تەنها لە سێ وشەدا جياوازيی لەگەلّيانا هەبوو . ئەو زانايانەی، كە لێی ئاگادار بوون دەست خۆشييان لێكرد و، زۆريشيان بـەلاوە سەير بوو . [٤٣]

لەو ماوەيەدا، كە مامۆستا لە بەدليس بوو، دەنگ و باسی ئەوە بلاّو بوويەوە كە مامۆستا موحەممەدی كوفرەويی [٤٤] دوعای خراپی لە مەلا سەعيد كردووە، كە مامۆستا ئەم هەوالّەی بيست خێرا چوو بـۆ سـەردانی مامۆسـتا كـوفرەويی و ،

---

[٤١] الـملاحق ـ ملحق أميرداغ : ١ / ٣١٢

[٤٢] مرقاة الوصول إلى علم الأصول : كتێبێكی مەزهەبی حەنەفييە و دانراوی موحەممەدی كوڕی فورامـورزی خوسرەويی، كە لە سالّی ( ٨٨٥ ) ی كۆچييدا وەفاتی كردووە

[٤٣] سيرة ذاتية : ٦٠ ـ ٦١

[٤٤] لە گوندی كوفرەی سەر بە سەعرەد لە دايك بووە و ، سەرەنجام نيشتەجێی بەدليس بووە و لە سالّی ١٨٩٧ ز بەرامبەر بە ١٣١٣ ك هەر لەوێ وەفاتی كردووە

ئەویش زۆر بە گەرمیی پێشوازیی لێکرد و ، مامۆستا سەعید دوا دەرسی گەنجیی بە لاوە خوێند، کە بە دەرسێکی یەکجار پر فەر و بەرەکەتی ئەژمارد و ، دەریشی ئەبریی، کە مامۆستا کوفرەویی لە رادەبەدەر سۆز و شەفەقەتی لەگەڵیا نواندووە .

شەوێکیان مامۆستا نوورسیی لە خەویدا مامۆستا کوفرەویی ئەبینیێ، کە پێی ئەڵێت : مەلا سەعید سەردانێکم بکە ، چونکە من کۆچ ئەکەم، هەر لە خەوەکەیدا خێرا ئەچێت بۆ سەردانی ئەبینێ وا کۆچەکەی مامۆستا لەماڵەکەدا ئەفرێت .. کە لە خەو رائەچڵەکێ ئەبینێ وا سەعات حەوتی شەوە ، بە تەوقیتی خۆرئاوا بوون ، واتە نیوەشەوە .. مامۆستا دیسان ئەخەوێتەوە، کە رۆژ ئەبێتەوە دەنگی شیوەنی کەس و کاری مامۆستا ئەبیستێ ، کە ئەچێ بۆ هەواڵ زانین بۆی دەرئەکەوێ، کە لە سەعات حەوتی نیوەشەودا وەفاتی کردووە ، ئیتر بە خەفەت بارییی ئەگەڕێتەوە و بەردەوام ﴿ إنا لله وإنا إليه راجعون ﴾ دووبارە ئەکاتەوە رەحمەتی خوای لێبێ . [٤٥]

[٤٥] سيرة ذاتية : ٦١

### هەشتەم : لە شاری وان دا

لەو کاتەدا حەسەن پاشا والیی شاری وان بوو، و لەبەر ئەوەش، کە زانایەکی ناودار لە شارەکەیدا نەبوو ، مامۆستا نوورسیی بانگ کرد بۆ ئەویٚ، مامۆستا بە گوێی کرد و ، ڕۆیشت بۆ ئەویٚ بەڵام، کە طاهر پاشا هەواڵی هاتنی مامۆستای بیست چوو بۆ لای و لێی پارایەوە، کە بچێتە لای ئەو .

طاهر پاشا خاوەنی کتێبخانەیەکی نایاب بوو، کە سەرەرای کتێبە ئیسلامییەکان پری بوو، لە کتێبە نوێیەکان ، وەك فیزیا و کیمیا و بیرکاریی .. لەویٚ مامۆستا نوورسیی دەستی دایە خوێندنەوەی زانستە نوێکان، بۆ ماوەی پانزە ساڵ لەویٚ جێگیر بوو، کە بە ناو عەشرەتەکان دا ئەسوورایەوە، بە نیازی ئامۆژگاریی و ئیرشاد و ، دەرس وتن بە قوتابییان . مامۆستا پەیوەندییەکی چاکی لەگەڵ والیی و فەرمانبەرانی شارەکەدا هەبوو .. لەو ماوەیەدا بایەخی چاکی بە صوڵحی نێوان عەشرەتەکان ئەدا .. هەر ئەوەندە بی بیستایە، کە دوو لایەن ناکۆکن خێرا رووی لێیان ئەنا و ناکۆکیی نێوانیانی لا ئەبرد و ئاشتی ئەکردنەوە .. ئەوەبوو مامۆستا سەعید توانیی صوڵح بە شوکریی ئاغا و موصطەفا پاشای سەرۆك عەشرەتی میران بکات ، هەرچەندە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوثمانیی نەی توانیی ناکۆکیی نێوانیان لەناو بەرێت .. لە کاتی صوڵحەکەدا مامۆستا سەعید رووی لە موصطەفا پاشا کرد و پێی وت :

ـ تا ئێستاش هەر تەوبەت نەکردووە ؟

ـ «سیدا» من گویٚ رایەڵی فەرمایشتی تۆم !

دوای ئەوە موصطەفا پاشا ماییننێك و هەندیٚ پارەی دا بە مامۆستا ، کەچیی وەری نەگرت و وتیشی :

ـ گوایا نەتبیستووە من تا ئێستە پارەم لە هیچ کەس وەرنەگرتووە ؟ ئیتر چۆن لە زاڵمێکی وەکو تۆی وەرئەگرم ؟! وا دەرئەکەوێ تەوبەکەتان شکاندووە ! لەسەر ئەوەش بە سەلامەتیی ناگەیتەوە جەزیرە .

هەروایش بوو ، موصطەفا پاشا هەر لە رێگادا ، بێ ئەوەی بگاتەوە ناوچەکەی خۆی ، مرد ، هەروەك ئەو دوعایەی، کە لێی کرد گیرا بووبێت ..

هەر لە شاری واندا مامۆستا گەیشتە قەناعەتی تەواو، کە پێویستە شێوازی تازە ، بۆ گەیاندنی ئیسلام بە بەرەی داهاتوو ، بەکار بهێنرێت ، چونکە زانستی کەلامی کۆن ناتوانێ بەرهەڵستی گومان و دوو دڵییەکانی چەرخی نوێ بکات ، بۆیە پێویستە شان بە شانی زانستە شەرعییەکان موسڵمانان لە زانستە نوێکان شارەزا بن ..

لەو تەمەنە کەمەدا توانیی دەردی دواکەوتنی موسڵمانان دەست نیشان بکات و، سەرەنجام دوای سیی ساڵ لەوە خوای گەورە دەستی یارمەتیی بۆ بەندەی موخلیصی درێژ کرد و ، پەیامەکانی نووری نووسیی بۆ راست کردنەوەی عەقیدەی موسڵمانان و ، بانگ کردنی مرۆڤایەتیی بۆ سەر رێبازی سەرفرازیی .

بۆ ئەمە مامۆستا دەستی بە خوێندنەوەی زانستە نوێ جۆر بە جۆرەکان کرد ، وەك مێژوو و ، جوغرافیا و ، بیرکاریی و ، جیۆلۆجیا و ، فیزیا و ، کیمیا و ، فەلەك و فەلسەفە .. ئەوەبوو لە ماوەیەکی کورتدا توانیی تەقە لە بنی ئەو زانستانە هەڵ بسێنێ ، بێ ئەوەی هیچ کەسێك یارمەتیی بدات ، یان لەلای هیچ کەس دەرس بخوێنێ ..

زانایان هەر یەکە لە زانستێکدا تا رادەیەك پسپۆر بوون ، بەڵام مامۆستا سەعید لە هەموو بوارەکاندا لە هەموو پسپۆرێك پسپۆرتر بوو ..

بۆ نموونە : لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا توانیی کتێبێك لە جوغرافیا لەبەر بکات و ، بۆ سبەینێ لە ماڵی والیی ( طاهر پاشا ) ، بەرامبەر بە مامۆستای پسپۆری جوغرافیا بوەستێ و لەو زانستەی خۆیدا بی بەزێنێ ..

بە هەمان شێوە بە لەبەرکردنی کتێبێکی زانستی کیمیا توانیی مامۆستای کیمیا ببەزێنێ ..

هەر لەو ماوەیەدا، کە لە وان ئەژیا گەیشتە ئەو قەناعەتە، کە پێویستە زانستە نوێکان تێکەڵ بە زانستە شەرعییەکان بکرێن ، هەتا قوتابییانی موسڵمانان چاوکراوە و پێشکەوتوو بن و ، پێویستە ئاسانکارییش بۆ رۆڵەی موسڵمانان بکرێت تا لە کاروانی گەلان دوا نەکەون .

ئیتر دەنگ و باسی زیرەکیی مامۆستا لە ناو زانایاندا وەها پەرەی سەند ، هەموان پێی سەرسام بوون و ، لە ئەنجامی ئەوەدا نازناوی « بدیع الزمان » یان لێنا

جا وەنەبێ مامۆستا نوورسیی لەسەر ئەو نازناوە رازیی بووبێ ، لە هەمان کات دا دەری ئەبرێ، کە ئەگەر خەڵکیی بە ناشیاویی نازناوی ( بدیع الزمان ) یان لێ نابێ ، ئەوا ئەو ناوە ناوی مەعنەویی پەیامەکانی نوورە، و دانەری پەیامەکان بە خواستن و سپاردەیی ئەو نازناوەی هەڵ گرتووە و ، وا ئەو سپاردەیە ئەگێرێتەوە بۆ خاوەنی راستەقینەیان، کە پەیامەکانن ..

لە شوێنێکی تری پەیامەکاندا دەری بریوە، کە پەنجا و پێنج ساڵ لەمەو بەر مامۆستا فەتحوڵلای [٤٦] مامۆستای لە سەعرەد سەعیدی کۆنی شوبهاندووە بە ( بدیع الزمان الهمداني ) و [٤٧] ، نازناوی ( بدیع الزمان ) ی پێ بەخشیوە . [٤٨]

---

[٤٦] لە پێشەوە باسی کرا و ، لە ساڵی ١٣١٧ ی کۆچیی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٠٠ ز وەفاتی کردووە ..

### نۆهەم : هەواڵی کاریگەر و دڵ تەزێن

ڕۆژێك لە ڕۆژان طـاهر پاشا ڕۆژنامەيەکی پيشانی مامۆستا ( بديع الزمـان ) دا، کە هەواڵێکی دڵ تەزێنی تێدا بوو .. بۆی دەرکەوت، کە ئـەورووپا خـەريکی پيلان گێرانە دژی قورئانی پيرۆز.. ئەوەبوو ڕۆژنامەکان وتەيەکی وەزيری ( مستعمرات ) ی بەريطانيی وليەم گلادستۆنيان [٤٩] بلاَو کردبوويەوە کە وتبووی : «هەتا ئەم قورئانــە بــە دەســتی موســڵمانەکانەوە بێــت ، ئێمــە نــاتوانين بــە شێوەيەکی ڕاستەقينە حوکميان بکەين، کەواتە با هەوڵ بدەين دەستبەرداری بن

کە مامۆستا ئەمەی بيست يەکجار تووڕە بوو، بۆيە بڕياری دا نەخشەی ژيانی بگۆڕێت .. بڕياری دا هەموو ژيانی تەرخان بکات بۆ خزمەتی قورئان .. هەرچيی زانستيشی دەست خستووە بيخاتە خزمەتی قورئانەوە تا پەی بە واتاکانی بەرێت و، ڕاستييەکانيشی بسەلمێنێ ..

مامۆستا تێ گەيشت، کە کافران نايانەوێ قورئانی پـيرۆز بـوونی هـەبێت .. قورئانی پيرۆز بە چقڵی چاويان ئەزانن ..

تێ گەيشت، کە کافران لێبراون بە هەوڵ و کۆششێکی بێ وچانەوە دژی قورئان تەرخان بکات و ، بە بەڵگەی زانسـتيانەی دەم کـورت کـەری چـەرخی نـوێ بـی

[٤٧] ( بديع الزمان ) ی هەمەدانيی : ناوی ئەحمەدی کوڕی حوسەين بووە .. لە نێوان ساڵانی ( ٣٥٨ ـ ٣٩٨ ) ی کۆچييدا ژياوە . ئەويش لەوپەڕی زيرەکيی و ، توانای لەبەرکردن و ، زەين ڕۆشنيی و ، دەروون پاکييدا بووە .. تەنها چاوێکی بە چوار پێنج لاپەڕەی کتێبێکدا بخشاندايە لەبەری ئەکردن .

[٤٨] سيرة ذاتية : ٦٢ ـ ٦٥ ، رجل القدر : ٢٥ ـ ٢٦

[٤٩] وليەم گلادستۆن : ( ١٨٠٩ ـ ١٨٩٨ ز ) پلەی وەزيريی چەند جارێك پێ دراوە .. چـوار جـاريش پلـەی سەرۆك وەزيرانی وەرگرتووە

سەلمێنێ، کە فەرمایشتی خوایە و ، موسڵمانانیش بانگ بکاتەوە بۆ سەری و ، بی سەلمێنێ، کە قورئان خۆرێکی مەعنەوییە و ، هەرگیز کلپەی کز نابێت و ، هیچ کەسێکیش ناتوانێ بیکوژێنێتەوە ، کە ئەی وت :

(( **بۆ جیهان ئەی سەلمێنم، کە قورئان خۆرێکی مەعنەوییە و، هەرگیز کز نابێت و، ناشتوانرێ ڕووناکییەکەی بکوژێنرێتەوە ..** )).

ئەم هەواڵە زیاتر مامۆستای پاڵ پێوە نا تا هەوڵی دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی ، لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا ، واتە لە ناوچەی کوردستاندا ، بدات ، ئەویش بە ناوی زانکۆی زەهرا ، لە شێوەی زانکۆی ئەزهەری شەریف و دوو لقی هەبێ ، یەکێك لە بەدلیس و یەکێکیش لە دیاربەکر ، بۆ خزمەتی قورئان و شان بە شانی زانستە نوێکانیش بخوێنرێن ، چونکە پێویستە موسڵمانان لە دواکەوتن و نەخوێندەواریی رزگار بکرێن ..

جا بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم مەبەستەی مامۆستا سەعید بەرەو شاری ئەستەمبوڵی پایتەخت کەوتە رێ ، بەو هیوایە، کە زانکۆیەکی ئیسلامیی بە پێی یاسای نوێ دابمەزرێنێ .. بۆ ئەمە نامەیەکی لە لایەن بەرێز ( یحیی نزهت پاشا ) وە هێنا بوو بۆ کەسێکی نزیکی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم ..

مامۆستا نزیکەی ساڵ و نیوێك لە ئەستەمبوڵ مایەوە بەو هیوایەی کارەکەی سەر بگرێ ، بەڵام بێ هوودە بوو، و بێ ئەنجام گەرایەوە بۆ شاری وان ..

لە ساڵی ١٩٠٦ زدا مامۆستا نوورسیی راستەوخۆ رووی لە حیکمەتی قورئان نا و ، دەستی دایە خزمەتی قورئان و ، دوای ساڵێکیش رووی لە ئەستەمبوڵ نا و، دەستی دایە جیهادی مەعنەویی .[٥٠]

---

[٥٠] سيرة ذاتية : ٦٥ ـ ٦٦ ، رجل القدر : ٢٦

# بۆ باوەشی ئەستەنبوڵ

## یەکەم : وەڵامی هەموو پرسیارێک

دوای یانزە ساڵ لەو سەردانەی ئەستەنبوڵی ، واتە لە ساڵی ١٩٠٧ ز دا مامۆستا بۆ دووهەم جار سەردانی ئەستەنبوڵی کردەوە ، بەو هیوایەی، کە هەوڵ بدات ئاواتەکەی بێتە دیی، کە ئەویش دامەزراندنی زانکۆی زەهرا بوو، لە کوردستاندا .. ئەوەبوو لە ( خان شکرچی ) لە نزیك مزگەوتی ( فاتح ) ژوورێکی بە کرێ گرت و ، تیایا نیشتەجێ بوو .. ئەم خانە ئوتێلی ئەو سەردەمە بوو و ، بنکەی زۆرێك لە ئەدیبان بوو، و شوێنی بە یەك گەیشتنی بیریارە ناسراوەکان بوو بە وێنەی شاعیری بەناو بانگ ( محمد عاکف ) و ،[٥١] زمانەوانی ناسراو مامۆستا جەلال و ، زانای فەلەکیی مامۆستا ( فطین )

کاتێك، کە بەرەو ئەستەنبوڵ کەوتە رێ دەربارەی زانستی کەلام چەند کتێبێکی نایابی دەست کەوت و بە وردیی خوێندنیەوە .. ئیتر، کە گەیشتە پایتەختی ئیسلام بانگی کردە زانایان و مامۆستایانی قوتابخانە ئیسلامییەکان و ماوەی دان با چ پرسیارێکیان پێ خۆشە لێی بکەن .

---

[٥١] موحەممەد عاکیف : شاعیرێکی مەزنی موسڵمانانی تورکیایە و ، سەرنووسەری گۆڤاری ( الصراط المستقیم ) و ( سبیل الرشاد ) بووە .. بۆ نوێنەری پەرلەمان لە ئەنقەرە هەڵ بژێرراوە کە لە ساڵی ١٩٢٥ دا یاسای جل و بەرگ لە تورکیا شەبقە لەسەر کردنی فەرز کرد ، پێی ناڕازیی بوو و ، چوو بۆ میصر و لەوێ لە زانکۆی قاهیرە خەریکی وانە وتنەوە بوو .. کە نەخۆشیی زۆری بۆ هێنا گەڕایەوە تورکیا و ، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٦ دا کۆچی دوایی کرد

ئەوەی، کە زیاتر سەرنجی مامۆستای راکێشا بوو ئەوەبوو چیی پرسیاری ئاراستە کرا وەڵامی هەر هەموویانی لە رێی ئەستەنبوڵدا خوێندبۆوە ، یان وەڵامەکەیان لە زەینیدا مابوویەوە .. هەتا ئەو پرسیارانەش، کە فەیلەسووفەکان ئاراستەیان کرد وەڵامەکەیان لە زەینیدا مابوویەوە .. ئەوەبوو دوای پەنجا ساڵ ئەوسا حیکمەتی ئەوەی بۆ دەرکەوت .. بۆی روون بۆوە، کە ئەو سەرکەوتنە و ئەو ناوبانگ دەرکردنە بۆ ئەوەبوو، تا زانایان و مامۆستایانی ئەستەنبوڵ هەر کاتێ پەیامەکانی نووریان بەرچاو کەوتن بەهایان بزانن و ، راستەوخۆ تەسلیمیان بن و، دژایەتییان نەکەن .

کاتێك لەو ئوتێلەدا نیشتەجێ بوو بوو، لەسەر دەرگای ژوورەکەی تابلۆیەکی هەڵواسیی کە لەسەری نووسیی بووی : ( **لێرەدا هەموو کێشەیەك چارەسەر ئەکرێت و ، وەڵامی هەموو پرسیارێکیش ئەدرێتەوە ، بێ ئەوەی پرسیار ئاراستەی هیچ کەس بکرێت** ) [٥٢]

ئەم نووسینە شتێکی سەیر و سەمەرە بوو، بە لای دانیشتوانی شارەوە و ، سەرنجی رائەکێشان ، بۆیە زۆرێك لە زانایان و قوتابیانی قوتابخانەکان دەستیان دایە سەردانی مامۆستا، کە پێیان خۆش بوو، ئەم گەنجە، کە تەحەددای پایتەختی ئیسلامی کردووە ببینن .. هەندێك بە راستگۆ و هەندێکیش بە پێچەوانەوە ئاماژەیان بۆ ئەکرد، بەڵام، کە چاویان پێ ئەکەوت و گوێیان لە وەڵامەکانی ئەگرت سەرسام ئەبوون و ، لایان ئەسەلما، کە پیاوی وەهایان نەدیوە ، چونکە وەڵامەکانی زۆر رێك و پێك بوون ..

---

[٥٢] مامۆستا بە درێژایی تەمەنی نەبینراوە پرسیار لە هیچ کەس بکات ، ئەویش بە بۆنەی ئەو فەرمانەوە، کە لە منداڵییدا لە خەویدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریدا دابووی .

حەسەن فەهمیی باش ئۆغلۆ ( کە لەوەو دوا بۆتە ئەندامی دەستەی راوێژکارانی کاروباری دینیی لە تورکیا، کە هاوبەرابەری وەزارەتی ئەوقافی ولاتە عەرەبییەکانە) ئەڵێت : کاتێك، کە لە سەردەمی ( مشروطیە ) دا قوتابیی قوتابخانەی فاتح بووم ، بیستمان، کە گەنجێك بە ناوی ( بدیع الزمان ) هاتۆتە ئەستەنبوڵ و ، لەسەر دەرگای ژوورەکەی ، لەو ئوتێلەدا، کە تیایا ئەمێنێتەوە تابلۆیەکی هەڵ واسیوە و لەسەری نووسیوە : ( لێرەدا هەمووکێشەیەك چارەسەر ئەکرێت و ، وەلامی هەموو پرسیارێکیش ئەدرێتەوە ، بێ ئەوەی پرسیار ئاراستەی هیچ کەسێك بکرێت ) منیش ئەوەم بە دڵدا هات، کە خاوەنی وەها داوایەك ئەبێ شێت بێت ، بەلام زۆریی سەنا و ستایش، کە لەو خەڵك و قوتابیی و زانایانەوە، کە سەریان لێ دابوو ئەم بیست ، بووە هۆی ئەوەی زۆر حەز بکەم منیش سەردانی بکەم .. بریارم دا قورس‌ترین پرسیار لە وردترین مەسەلەدا هەڵ ببژێرم تا ئاراستەی بکەم .. ئەو کاتە منیش بە یەکێ لە قوتابییە پێش کەوتووەکانی قوتابخانە ئەژمێررام، ئەوەبوو ئێوارەیەکیان خۆم ئامادە کرد و ، لە زانستی ( عەقائید ) وردترین بابەتم هەڵ بژارد، کە بۆ وەلام دانەوەیان پێویست بە چەند کتێبێك ئەکات .. بۆ رۆژی دووهەم چووم بۆ لای و ئەو پرسیارانەم ئاراستەی کرد . ئەوەبوو وەلامەکانی لە عادەت بەدەر و سەیر و سەرسوڕهێنەر بوون ، هەروەك دوێنی لە گەڵم دا بوویێت و لە کتێبەکان ورد بێتەوە ، چونکە وەلامەکانی زۆر تێر و تەواو بوون .. بەلام بە تەواوەتیی دڵ متمانە بووم و بە یەقینییش زانییم، کە ئەو زانستەی ئەو وەك زانستی ئێمە بە دەستی نەهێناوە ، بەڵکو زانستێکە خوا پێشکەشی کردووە، پاشان نەخشەیەکی بۆمان دەرهێنا و ، رادەی

گرنگیی و پێویستیی کردنەوەی قوتابخانەی زانستیی لە خۆرهەلاّتی ولاّت دا ، کە ئەو کاتە کاروباریان لەلایەن ( هێزەکانی حەمیدی )[٥٣]یەوە بەرێوە ئەبرا ، لەسەری روونی کردەوە بۆمان، ئەوەبوو روونی کردەوە، کە ئەو جۆرە کاروبار بەرێوە بردنە بۆ ئەو ناوچەیە بەس نیە و ، روونیشی کردەوە، کە پێویستە ئەم ناوچەیە لە رووی زانستەوە ، بە شێوازێکی قەناعەت کەر ، بە ئاگا بهێنرێت و ، ئەمیش تەنها لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستەدا هاتووە بۆ ئەستەنبوڵ، ئەشی وت:

**"دین رۆشنایی دڵەکانە، بەلاّم زانستە نوێکان رووناکیی مێشکەکانن "**

هەروەها نووسەری تورکیی ( ماهیر ئیز ) ئەڵێت :

کاتێك، کە ( بدیع الزمان ) هاتە ئەستەنبوڵ گەنج بوو، و بە جل و بەرگی کوردەوارییەوە هات و چۆی ئەکرد، کەسایەتییەکی خاوەن بەلاغەتی لێهاتوو، و وتاردەرێکی زمان پاراو بوو، و دارای زیرەکییەکی لە عادەت بەدەر بوو، کە ناوچەی خۆرهەلاّتی ولاّت هەڵی خستبوو .. داوای کرد زانایان بێن بۆ بەرابەرکێ و تەحەددای هەر هەموویانی کرد، چونکە لە خۆی را ئەبینیی )) .

هەروەها بەرێز ( علي همت برکي ) ، کە یەکێك بووە لە سەرۆکە پێشینەکانی مەحکەمەی تەمییز بیرەوەرییەکانی خۆی دەربارەی هاتنی ( بدیع الزمان ) بۆ ئەستەنبوڵ ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

لەو کاتەدا، کە من لە کۆلیجی یاسا قوتابیی بووم دەنگ و باسێك بلاّو بوویەوە کە کەسێك بە ناوی ( بدیع الزمان ) کە بەژن و بالاّیەکی سەیری هەیە لە

---

[٥٣] هێزەکانی حەمیدیی : سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم وای بە چاك زانیی کەڵك لە سەرۆك عەشرەتەکانی ناوچەی کوردستانی تورکیا وەربگرێ ، بەوەی، کە هەر ناوچەیەکی بە سەرۆکێك سپارد تا چەکدار لە ناوچەکەدا کۆ بکەنەوە و ، ئیدارەی ناوچەکەیان پێ بەرێوە ببەن و ، لە هەمان کات دا پارێزگاریی سنووری دەوڵەتی عوثمانیی لەگەڵ رووسیادا بکەن . جا ئەو هێزە چەکدارانە بە هێزەکانی حەمیدیی ناو ئەبران ..

خۆرهـەلاتی ولاتـەوە هـاتووە و ، هـەر پرسـيارێكی ئاراسـتە بكـرێ وەلامـی ئـەداتـەوە.. ئێمەش هەستمان بە حەسودييەك كـرد و چـووين بـۆ سـەردانی .. دانيشتبوو و ، بە بەڵگەی عەقڵيی و مەنطيقيی فەلسەفەی سوفسطائيی ئەدايـە دواوە و پووچەڵی ئەكردەوە .. بە راستيی شياوی نازناوی ( بديع الزمان ) بـوو ، چونكە زانيارييەكانی لە فەلسەفەی ئيسلاميی ( واتە لە زانستی كەلام ) و ، لە زمانزانييدا سنووريان نەبوو .

هەروەها يەكێكی تر لەوانەی، كە ناوبانگی مامۆستايان بيست و سـەردانيان كرد زانايەكی بەرێزی پايەدار بوو بە ناوی ( حەسەن ئەفەنديی ) ، كە نەوەد ساڵی تەمەنی بە دەرس وتنەوە بەسەر بردبوو و ، جگە لە تاقە رۆژێك هـيچ كـات دوا نەكەوتبوو، كە ئەويش ئەو رۆژە بوو سـەردانی مامۆسـتای كردبـوو .. ئـەوەبوو قوتابييەكانی لە دواكەوتنی ئەو رۆژەی ئاگادار كرد چونكە لە خۆرهەلاتی ولاتەوە زانايەك بە ناوی ( بديع الزمان ) هاتووە و ئەيەوێ سەردانی بكات .

مامۆستا حەسەن ئەفەنديی، كە بۆ رۆژی دووهەم گەرايەوە لای قوتابييـەكانی تێی گەياندن، كە كەسی وەهای نەديوە و ، يەكێكە لەو كەسانەی، كە بە دەگمەن هەڵ ئەكەون .

مامۆستا لە چلەكاندا باسی هاتنی بۆ ئەستەنبوڵ ئەكات، كـە ئـەوەش ئـەی سەلمێنێ زانايانی ئەستەنبوڵ بە تەواويی دانيان بە زانياريی زۆری مامۆستادا ناوە، كە ئەڵێت :

چل ساڵ لەمەو بەر ، واتە ساڵێك پێش جاردانی سەربەستيی ، هاتمە ئەستەنبوڵ و ، لەو كاتەدا فەرماندەی يابانيی هەندێ پرسياری دينيـی ئاراسـتەی زاناكـانی ئيسلام كردبوو و ، زاناكانی ئەستەنبوڵيش ئەو پرسيارانەيان ئاراستەی من كرد و

، هەروەها چەندین پرسیاری تریشیان بەو بۆنەوە لێم پرسیی، لە ناو ئەو پرسیارانەش‌دا ئەو باسە هاتبوو، کە لە یەکێ لە فەرموودە شەریفەکان‌دا باس کراوە کە : ( لە ئاخر زەمان‌دا کەسێکی سامناك پەیدا ئەبێ کە لە ناوچاوانیدا نووسراوە : ئەمە کافرە ) . منیش وتم :

کەسێکی سەیر و سەمەرە کاری ئەم ئوممەتە ئەگرێتە دەست و ، خۆی شەپقە لەسەر ئەکات و ، خەڵکیش ناچاری لەسەر کردنی ئەکات .. دوای ئەم وەڵامەش لێمیان پرسیی :

ئایا ئەو کاتە هەر کەسێك لەسەری بکات کافر نابێت ؟ وتم :

کاتێك شەپقەکە لەسەر ئەکرێت ( بەو کەسە ) ئەڵێت : سەجدە نەبەیت ، بەلام إن شاءالله ئەو ئیمانەی، کە وا لە سەردا ئەو شەپقەیە ناچاری سەجدە بردن ئەکات و، موسڵمانیشی ئەکات ...

پاشان چەندین پرسیاریان دەربارەی بەندی ( ذوالقرنین ) و ( یأجوج و مأجوج ) و، دەربارەی گیان لەبەرەکەی زەویی و ، دەججال و ، دابەزینی عیسا سەلامی لێبێ، منیش وەلامم دانەوە ، هەتا بەشێك لەو وەلامانە لە ناو هەندێ دانراوی کۆنم‌دا نووسراون . [٥٤]

---

[٥٤] الشعاعات : ٤١٨ ، مەبەست لە دانراوی کۆن پەیامی ( محاکمات ) یان ( رجتة العلماء ) ە ، کە لەو ماوەیەدا دایناوە و ، وەلامی پرسیارە یابانییەکانیشی لە ( مقالة ) ی سێهەم دا تۆمار کردووە و ، لە تیشکی پێنجەمی کۆمەڵەی تیشکەکانیش‌دا چەند باسێك دەربارەی دەججال و سوفیانیی و نیشانەکانی تری قیامەت بە

## دووهەم : چاوکەوتن بە سولتان عەبدولحەمیدی دووهەم

لەبەر ئەوەی، کە ( بدیع الزمان ) بە وردیی ئاگاداری گیروگرفتەکانی کوردستانی تورکیا بوو ، وای بە چاك زانیی سەردانێکی سولتان عەبدولحەمیدی دووهەم بکات، تا بارودۆخی شپرزەی کوردستانی بۆ باس بکات، کە بە دەست هەژاریی و نەخوێندەوارییەوە ئەناڵێنێ لەو بارەوە ئەڵێت :

« لەگەڵ ئەوەش‌دا، کە دەوڵەت لە حاڵ و گوزەرانی دانیشتوانی ناوچەی خۆرهەڵات ، کە بە بەشێکی گرنگی ئوممەتی عوثمانیی ئەژمێررێن ، ئاگادارە ، منیش هیوادارم ماوەم بدرێت چەند رایەك و چەند داواکارییەك ، کە ئەوانیش بەشێکی کاری پیرۆزی زانستیین ، بخەمە روو » .

دوای ئەوە دەری ئەبڕێ، کە چەند قوتابخانەیەك لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ‌دا کراونەتەوە ، بەڵام تەنها ئەو قوتابیانە کەڵك لە زانست وەرئەگرن، کە تورکیی ئەزانن، ئیتر ئەوانەی تورکیی نازانن ناچارن روو لە حوجرەکان بکەن، مامۆستاکانی قوتابخانەکانیش کوردیی نازانن ، بەمە نەزانیی و دانەمەزراویی پەرە ئەسێنن .. جا بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە مامۆستا وای بە چاك زانیی دەوڵەت لە چەند شارێکدا وەك بەدلیس و وان و سەعرەد قوتابخانە بکاتەوە و ، لە هەر یەکێکیان‌دا پەنجا قوتابیی بە مەسرەفی حکومەت بخوێنن بەو مەرجەی زانستە نوێکانیش شان بە شانی زانستە شەرعییەکان بخوێنرێن .

---

درێژە باس کراون ، لەگەڵ هێنانی ئەو فەرموودە شەریفانەی، کە دەربارەیان هاتوون .. ( سيرة ذاتية : ٦٧ ـ ٦٨ ، رجل القدر : ٢٧ ـ ٢٨ ) .

لەو کاتەدا کە مامۆستا لە ئەستەنبوڵ بوو، زانای بەناو بانگ ( عبـد الرشـید إبـراهیم ) [٥٥] یـش لــە ئەســتەنبوڵ بــوو، هــاواری هێنابویــەوە لای ســوڵتان عەبدولحەمید تا فریای موسڵمانانی چین بکەون و زانای پێویستیان بۆ بنێرن هەتا لە ناو نەبرێن .

جا سوڵتان خۆی ئاسا بایەخێکی چاکی بەم سکالآیەی مامۆستا عبد الرشید دا و شیخ الإسلام جمال الدین ی بانگ کـرد تــا بــە پێــی توانـا بچـێت بــە هانــای موسڵمانانی چینەوە

مامۆستا نوورسییش لە کاتی چاو پێ کەوتنەکەیدا ، ئەو سکالآیەی خستە روو تا بە هانای مامۆستا عبد الرشیدەوە بچن ، ئیتر نەی زانیی بـوو، کـە سـوڵتان فەرمانی داوە بە کۆمەکیی کردنی ..

پاشان مامۆستا نوورسیی رەخنەی لە حکومەتی سوڵتان عەبدولحەمید گـرت، کە ئازادیی تیا بە دیی ناکرێت ، بەڵکو ( إستبداد ) بەدیی ئەکرێت و ، دەریشی بریی ( إستبداد ) هیچ پەیوەندییەکی بە شەریعەتی پیرۆزەوە نیە .

---

[٥٥] عبدالرشید إبراهیم ( ١٨٥٠ ـ ١٩٩٤ ز ) خەڵکیی ناوچەی سیبریایە ، واتە لە موسڵمانەکانی ڕووسیایە . بە منداڵی بە چاکیی شارەزای زانست ئەبێت و لە ( ١٨٧٠ ) سەردانی ئەستەنبووڵ و مەککە و مەدینە ئەکات و چەند ساڵێك لە حیجاز ئەمێنێتەوە ، تا زانست وەربگرێ ، چاویشی بە ( شێخ شـامل ) ی موجاهیـدی ڕووسـیی ئەکەوێت، لە ساڵی ( ١٨٨١ ز ) دا ئەگەڕێتەوە ئەستەنبووڵ و چاوی بە ( جمال الدین ) ی ئەفغانیی و ، نامق کمال و ، ئەحمەد وەفیق پاشا ئەکەوێ، پاشان ئەگەڕێتەوە ڕووسـیا بـۆ ئیرشـادی موسـڵمانان، لـەوێ قوتابخانـە دائەمەزرێنێ و ، دەست بە وتاردان ئەکات، حکومەت نەفی ئەکات ، ئەویش ئەچێت بۆ چین و کۆریا و هیند و یابان و دەربارەی ژیانی موسڵمانان کتێبی ( جیهانی ئیسلامیی ) ئەنووسێت، لـە سـاڵی ١٩٠٤ ز دا لەگـەڵ ( شـیخ الإسلام ) ی ڕووسیا مامۆستا مووسا جار الله ( ١٨٧٨ ـ ١٩٤٩ ) ، لەسەر چالاکیی دینییان لەلایەن حکومەتی ڕووسیاوە نەفیی ئەکرێن و ، ئەوانیش ڕوو لە یابان ئەنێن و لەوێ کۆمەڵەی ( ئاسیای گەورە ) دائەمەزرێنن، پاشان مامۆستا ( عبدالرشـید ) سەردانێکی چین ئەکات و حاڵی خراپی موسڵمانەکان ئـەبینێ، کـە چـۆن سـتەمیان لێ ئەکرێت .

مامۆستا نوورسیی وەك گەنجێكی خوێن گەرم و شارەزای شەریعەت مافی خۆیەتی، كە رەخنە بگرێت و داوای حوكمی شەریعەت بكات ، لە هەمان كاتدا ئەگەر سەرنجێكی بارودۆخ و زەمانە و دەوروبەری سوڵتان عەبدولحەمید و دەوڵەتی عوثمانیی بگرین بۆمان دەرئەكەوێ، كە سوڵتانی ئازیز لەوە زیاتر توانای نەبووە و، ئەوەش ( إستبداد ) نیە، كە سوڵتانی مەظلووم لەسەری بووە ، چونكە چەندین گیروگرفت یەخەیان بە دەوڵەتی عوثمانیی گرتبوو و ، چەندین دەوڵەتی مل هوری دوژمن بە ئیسلام و تەماعكاریش دەورەیان لێ دابوو .. ئەوەبوو سوڵتان لە حەفتاكانی صەدەی نۆزدەهەمدا ویستی دەستوور پیادە بكات و ، یاسای پەرلەمان دابمەزرێنێ ، كەچیی چونكە هاولاتیانی دەوڵەتی عوثمانیی بریتیی بوون لە چەندین نەتەوە و ، توخم و ، دین و ، زمان و ، مەزهەب ئەوا دەوڵەتە بێگانەكان بە ئاسانیی ئەیان توانیی دەست بخەنە كاروباری ناوخۆی دەوڵەتەوە و، هەڵنانی هەندێ توێژی ولاتەكە لە دژی دەوڵەت و ، لە ئەنجام دا ئاژاوە بەرپا ببێ، بۆیە یەكەم هەوڵی سوڵتان بۆ پیادەكردنی دەستوور سەری نەگرت ، چونكە ناحەزان ئەو كارەیان بە هەل زانیی و ، لە دژی دەوڵەتی عوثمانیی بە كاریان هێنا، ئەوەبوو بە پیلانی ئەندامە ناموسڵمانەكانی پەرلەمان دەوڵەتی عوثمانیی تووشیی جەنگی ساڵی ١٧٧٦ ز كرا لەگەڵ رووسیادا، سەرەنجام دەوڵەت تووشی قەرزاریی هات ئەمەش بە هۆی ئەوەوە، كە بارودۆخ بۆ ئەو جۆرە حوكمە هێشتا نەرەخسا بوو .. هەتا سوڵتان، كە دوای زیاتر لە سیی ساڵ هەوڵی دا بۆ جاری دووهەم كار بە دەستوور بكات ، ئەو كاتەش هێشتا بارودۆخ لە بار نەبوو ، دواتریش، كە كۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) هاتنە سەر كورسیی دەسەلات و دیكتاتۆریەتی حیزبییان دامەزراند و ، دوای ئەوانیش حوكمی تاكە كەسیی ئەتاتورك هاتە كایەوە نەیان توانیی حوكمی نیابیی جێبەجێ بكەن ..

هەر چەندە مامۆستا نوورسیی رەخنەی لە حکومـەتی سـولتان عەبدلحەمیـد ئـەگـرت ، بـەلام دوایی بـۆی دەرکـەوت، کـە ( إسـتـبـداد ) ی سـولتـان لـە چـاو ( إسـتـبـداد ) ی ئەوانەی دوای ئەو هاتن چەند کەم و لاواز بوو ..

مامۆستا موصطفا صونگور باسی مامۆستا نوورسیی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت : دوای ئەوەی، کە مامۆستا لە سەردەمی تاکە حیزب ( سـەردەمی مـوصـطـفـا کەمال و عیصمەت ئینۆنۆ ) دا ئەوەی چەشت، کە چەشتی، لەگەڵ خۆی ئەدوا و ئەی وت : ئەی سەعید ! لە تۆڵەی ئەو نارەزاییەی، کە دەرهەق بـە سـولتانێکی بەسۆز و بەشەفەقەت دەرت ئەبریی کە گوایا ( إستـبداد ) بـە کـار ئەهێنـێ ، ئـازاری ئـەم ( إستبداد ) ە سامناکە بچێژە

هەروەها ئەگێڕێتەوە و ئەی وت : رۆژێکیان مامۆستاکەمان ( واتە مامۆسـتا نوورسیی ) دەربارەی خوا لێ خۆش بوو، سـولتان عەبدولحەمیـد وتـی : سـولتان عەبدولحەمیـد وەلیـی و پیاوچـاکە و نـاوی ئەویشـم خسـتۆتە نـاو دوعـا تایبەتییەکانمەوە، بۆیە هەموو بەیانییەك ئەپارێمەوە و ئەڵێم : **خوایە ! لە سولتان عەبدولحەمید خان و سولتان وەحیدەددین و خێزانی عوثـمانیی حوکم بـە دەست رازیی بیت**

**هـەروەها ئـەی وت : ( سـولتان عەبدولحەمیـد خەلیفـەی شەصت ملیـۆن موسڵمان بوو و ، من بە پیاوچاکێك لە پیاوچاکانی خوای لە قەڵەم ئەدەم )** ئەمەش لە وەلامی نووسەرێك‌دا، کە کتێبێکی دژی سولتان عەبدولحەمید نووسیی بوو .

مامۆستا نوورسیی لە سەرەتاوە، کە بانگەشە بۆ ئازادیی و سەربەستیی ئەکرا، دڵی پێ خۆش بوو، بەلام مەرجی بۆ دائەنا ، ئەو مەرجەش بریتیی بوو: لەوەی ئەو

ئازادییە لە سنووری شەرع دەرنەچێت ، ئەگینا ( إستبداد ) ی رەها تەنگ بەو ئازادییە هەڵ ئەچنێت و لە ناوی ئەبات .

وتمان : مامۆستا نوورسیی سوڵتان عەبدولحەمیدی بە وەلیی لە قەڵەم ئەدا ، چونکە لەو بارودۆخە ناهەموارەدا، کە دەوڵەتی عوثمانیی پیایا تێ پەریی سوڵتان مەردانە بەرەنگاری پیلانەکانی دوژمنان ئەبوویەوە و ، هەوڵی دا قەرزێکی زۆری دەوڵەتی دایەوە و ، چەندین قوتابخانەشی لە سەرانسەری وڵاتدا کردەوە هەروەها عەشرەتە کۆچەرییەکانی پارێزگاکانی خۆرهەلاتی بە دروست کردنی هێزە چەکدارەکانی ( الحميدية ) بەرەو مەدەنیەت بردن و ، خۆیشی نوێژی جومعەی لە مزگەوت بە جێ ئەهێنا و ، هەمیشە لە کۆشکەکەیدا زانایەکی بەرێزی خواناسی شارەزای شەریعەتی دانا بوو، تا بە وێنەی رابەرێکی مەعنەویی ئامۆژگاریی بکات و ، ئەمیش پرس و رای پێبکات ، رەحمەتی خوای لێبێت .

کە مامۆستا داواکارییەکانی خستنە روو و رەخنەشی لە دەوڵەتی عوثمانیی و لە سوڵتان عەبدولحەمید گرت ، سیفەتی شێتییان دایە پاڵی و ، ناحەزان و حەسوودان کەوتنە تاوانبارکردنی تا ئەو رادەیە کە سوڵتان فەرمان بدات و بی خەنە خەستەخانەی شێتانەوە .

جا مامۆستا خۆی دەری ئەبرێ، کە بەزەیی بە ناوچەی کوردستاندا هاتۆتەوە و، بە نیازی خزمەتکردنی سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە، وەك ئەوە بگەیەنێ، کە ئەندامێکی دەوڵەت لاواز و نەخۆشە، کەچیی، کە دێتە ئەستەنبوڵ و سەرنجی ئەدا، ئەبینێ ئەو زیاتر نەخۆشە و ، نەخۆشییەکە لە دڵدایە و لەوێوە و تەشەنەی کردووە و ، ئەندامەکانیش تووش بوون ..

لەسەر ئەو رەخنانە ( بديع الزمان ) رەوانەی لیژنەی لێکۆڵینەوەی دادگای عەسکەریی یەڵدز کرا .. لەوێ فەریق شاکر پاشای سەرۆکی دادگا ، کە گومانی

هەبوو ( بدیع الزمان ) سەرکردایەتیی بزووتنەوەیەکی کـوردیی جیـاخواز بکـات پرسیی :

ـ تۆ سەر بە چ عەشرەتێکی کوردییت ؟

مامۆستاش وەلآمی دایەوە :

ـ ئەی تۆ سەر بە چ عەشرەتێکی تەتارییت ؟ من کەسێکی عوثـمانیـیم و ، کوردییەتەکەیشم لەو ناوەوە پەیدا بووە، کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی، کە تیایا لە دایك بووم و پێ گەیشتووم بەسەرمدا بڕیویانە

ئەو ڕەخنانەی، کە لە دڵیا بوون چەند جارێکیش لە دادگادا دەری بـڕین ، بـە ڕادەیەك، کە ترسی خستە دڵـی ( مـدعي عـام ) سـروور ئەفەندییـەوە و ، بـە سەرسوڕمانەوە پرسیی، کە چۆن ئەوێرێ ئەو قسانە بکات ، چونکە سوڵتان توورە ئەبێت و سزای ئەدات ؟

مامۆستاش تێی گەیاند کە ئەو وتانەی لەبەردەمی سـوڵتاندا وتـوون، ئەمـە ترسی خستە دڵی ئەنـدامانی دادگـاوە ، هـەتا ئیسـماعیل پاشـای پشـکێنەری عەسکەریی گشتیی قوتابخانە عەسکەریەکان هاتە سەر ئـەو ڕایـە، کـە ( بـدیع الزمـــان ) تێك چوویێت ، بۆیە وای بە چاك زانیی بینێرنە خەستەخانە بۆ فەحص کردنی مێشکی، ئەوەبوو هەر لەو دادگایەدا پێنج لە دکتۆرەکان ، کـە بریتیـی بوون لە دکتۆرێکی تورکیی و ، یەکێکی ڕۆمیی و ، یەکێکی ئەرمەنیی و ، دوانی جوولەکە ، بڕیارێکی لەو جۆرەیان ئیمزا کرد

کە ڕەوانەی خەستەخانەی نەخۆشییە عەقلییەکان کرا لە ناوچەی تۆپ تاشیی، دوای چەند حەفتەیەك لە کۆشکی سوڵتانەوە دکتۆرێك ئەنێرنە لای تـا دەربـارەی حاڵەتیی عەقڵیی ڕاپۆرتێکی بۆ بنووسێ، هەر، کە دکتۆر ئامادە بوو مامۆسـتا بەوپەری سەلیقەوە باسی خۆی و ناوچەی کوردستانی بۆ دکتۆر کرد و ، بە وێنەی

حەكيمێكى بێ وێنە گەوهەر لە دەمى ئەبارێى .. دكتۆر بە جارێ سەرى لە ژيرىى و زيرەكيى مامۆستا سور ئەما .. سەرنجى دا زيرەكيى ئەم پياوە لە چڵە پۆپەدايە.. لە بەردەميدا خۆى بە قوتابيى دا ئەنا و ئەويش بە مامۆستا سەرەنجام هاتە سەر ئەوە كە راپۆرت بۆ لايەنە رەسمييەكان بنووسێت و تيايا بنووسێت : ئەگەر ئەوەندەى گەردىلەيەك شێتيى لە لاى ( بديع الزمان ) هەبێت ، كەواتە لە سەرانسەرى دنيادا يەك ژير نيە

بەڵام كاربەدەستان و دايەرەى رۆتين ئەم دەست و ئەو دەستيان بە راپۆرتەكە ئەكرد و ماوەيەكى زۆر دوا خرا ، بۆيە مامۆستا لەو خەستەخانەيەدا بۆ ماوەى هەشت مانگ مايەوە

ئەو راپۆرتەى كە ئەو دكتۆرە خاوەن ويژدانە بۆ مامۆستاى نووسيى ترس و سەرساميى لەلاى كاربەستانى كۆشكى خەلافەت دروست كرد ، بۆيە بە پەلە فەرمانيان دەركرد كە مامۆستا لە خەستەخانەوە بگوێزنەوە بۆ بەنديخانە و ، لەگەڵ وەزيرى ئەمن شەفيق پاشادا فەرمانێكى ئيدارييان نارد، كە بريتيى بوو لە برينەوەى مەبلەغى سيى ليرە زێر وەك مووچەيەكى مانگانە بۆ مامۆستا نوورسيى، لەگەڵ هەندێك بەخشين ، تا لە ئەستەنبوڵ دوور بخرێتەوە

كە لە خەستەخانە دەرچوو برديانە بەردەم ليژنەى پشكنينى عەسكەريى، كە ئەمەبوو لە نێوان مامۆستا و شەفيق پاشاى وەزيرى ئەمن و سەرۆكى ئەو ليژنەيەدا ئەم وت و وێژە رووى دا

شەفيق پاشا : سوڵتان سەلامەت لێتەكات و ، فەرمانيشى داوە مووچەيەكى مانگانەت بۆ ببڕێتەوە، كە بريتييە لە هەزار قيرش و ، كاتێكيش گەرايتەوە بۆ ناوچەكەت ئەم مووچەيە ئەبێتە سيى ليرە و ، مەبلەغى هەشتا ليرەى زێريشى بە شێوەى خەڵاتى سوڵتانيى بۆ ناردووى

بەدیعوززەمان: من سوالکەری مووچە نەبووم ئەگەرچیی بگاتە هەزار لیرەش، من لە پێناوی ناوچەکەمدا هاتووم بۆ ئێرە ، نەك لە پێناوی خۆمدا .. پاشان ئەوەی، کە هەوڵ ئەدەن پێشکەشی بکەن بەرتیلی بێ دەنگ بوونە

شەفیق پاشا : تۆ بەمە خەلاّتی سولّتانیی ئەدەیتە دواوە و ، خەلاّتی ئەویش نادرێتە دواوە

بەدیعوززەمان : من ئەی دەمە دواوە ، تا سولّتان زیز ببێ و بانگم بکات و ، ئەو کاتەش هەلّ دەست ئەکەوێ تا راستیی پێ بلّێم .

شەفیق پاشا : دەی سەرەنجامی باش نابێت .

بەدیعوززەمان : ئەگەر سەرەنجامەکەی ئەوەبێ بخرێمە ناو دەریاوە ، ئەوا دەریاکە بۆم ئەبێتە قەبرێکی فراوان و ، گەر لە سێدارەش بدرێم ، ئەوا لە ویژدانی ئوممەتی ئیسلامدا ئەژیم، بشزانن کاتێ هاتوومەتە ئەستەنبوڵ گیانم خستۆتە سەر لەپی دەستم، جا هەرچیتان پێ خۆشە پێم بکەن، من ئەزانم چیی ئەڵێم، چونکە ئەمەوێ هاوولاّتیانم ئاگادار بکەمەوە ، ئەمەش بۆ خزمەتی ئەو دەوڵەتەی، کە وام لە سایەیدا ، نەك لە پێناوی بە دەست هێنانی مووچەدا .. پاشان ئەو خزمەتەی، کە کەسێکی وەکو من بتوانێ بیکات ئەوەیە ئامۆژگاریی بە ئوممەت و بە دەوڵەت پێشکەش بکات، دیارە ئەم ئامۆژگارییەش کاتێك نرخی ئەبێت، کە بە چاکیی کاریگەریی هەبێت و ، کاتێکیش کاریگەریی چاکی ئەبێت، کە بە ئیخلاّصەوە و دوور لە هەموو خڵتەیەکی تەماع ئەنجام بدرێت و ، ئەمەش کاتێ دێتە دیی، کە بەبێ بەرامبەر و ، دوور لە سوودی کەسیی بێت، لەبەر ئەوە، کە من ئەو مووچەیە ئەدەمە دواوە ، چاوپۆشییم لێکراوە .

شەفیق پاشا: ئەو پێشنیارکردنەت بۆ بلاّوکردنەوەی زانستەکان لە ناوچەکەتدا، ئێستا وا لە ژێر کۆڵینەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا

بەدیعوززەمان : کەوابێ ، باسی زانستەکان بۆچ دوا خرا و ، بۆ مووچەکە پەلە کرا و ، لەسەر چ بناغەیەکیش ئەمە بەجێ هێنرا ؟ بۆچیی سوودی کەسیی پێش سوودیی گشتیی ئەخەن ؟

لەگەڵ ئەوەدا، کە مامۆستا نوورسیی بەم شێوە توند و تیژە وت و وێژی لەگەڵ وەزیردا کرد، و بە شێوەیەکی جەرگ بر رەخنەی لە حکومەت ئەگرت ، کەچیی ئازادیان کرد [٥٦]

بە ماوەیەکی کەم پێش جاردانی مەشرووطیەتی دووهەم لـە ٢٣ ی تـەمووزی ساڵی ١٩٠٨ زدا مامۆستا ( بدیع الزمان ) بەرەو شاری سلانیك کەوتە رێ کە ئەو کاتە بنکەی سەرەکیی چالاکیی کۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) نهێنیـی و نـەیاری حوکمی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووهـەم بـوو، سـەرۆکەکانی ئـەو کۆمەڵەیـە پەیوەندییان پێوەی کرد و بە تەما بـوون رای کێشـنە سـەر بـیر و بۆچـوونەکانی خۆیان، چونکە ئەوان دروشمی ( سەربەستیی و ، برایەتیی و ، یەکسـانیی ) یـان بەرز کردبوویەوە و ، بیرو بۆچوونی مامۆستاش، کـە بریتیـی بـوو لـە شـوورا و برایەتیی ئیسلامیی و عەدالەتی ئیسلامیی ، لەگەڵیانا تەریب بوو .

لەو سەردەمەدا مامۆستا ( بدیع الزمان ) تەئکیدی ئـەکردە سـەر مەبـدەئی شوورا ، تا بە موسڵمانانی بگەیەنێ، کە شوورا لە ئیسلامدا زۆر گرنگە و ، یاسای حوکمی تاکە کەسیی لەلایەن بیریار و پارتەکانی خۆرئاواوە بە یاسای ئیسلام لـە قەڵەم نەدرێ و ، خەلیفە سێبەری خوا نیـە لەسـەر زەوییـدا .. خـۆ دیـارە ئـەم بانگەوازەی مامۆستا بۆ شوورا لە زاناکانی تری جیا ئەکردەوە و ، لە هەمان کات دا لەوانە بوو، بکەوێتە بەر خەشم و قینی حکومەت .

---

[٥٦] سيرة ذاتية : ٦٩ ـ ٨٠ ، رجل القدر : ٢٩ ـ ٣٦

لە شاری سلانیك ئەندامانی کۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) دەورەیان لـە ( بـدیع الزمان ) دا و پێیان خۆش بوو، پیاوێکی وەها ناودار پاڵیان پێوە بدات تا کەڵك لە ناوبانگیی وەربگرن، بەڵام هەرچەندە لە سەرەتاوە پشت گیریی لێ ئەکردن ، بـە سەربەخۆ مایەوە و بیروبۆچوونی خۆی تێکەڵ بە بیری ئەوان نەکرد

لـەو کاتانـەدا عـەمانۆئێل قەرەصـوو ، کـە جوولەکەیـەکی ناسـراو بـوو و، ئەندامێکی دیاری ماسۆنییەت بوو، و دەورێکی دیاریشی لە داماڵینی سـوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمدا هەبوو ، هەوڵی دا چاوی بە مامۆستا نوورسیی بکەوێت، بەو نیازەوە کاری تێبکات و رای بکێشێ .. مامۆستا ئەو چاو پێ کەوتنەی پـێ خۆش بوو و ، رەزامەندییشی لەسەر نواند، کەچیی کابرای جوولەکە کۆبوونەوەکەی تێك دا و بە پەلە رای کرد و ، لە دەستی مامۆستا خۆی داماڵیی نەوەکو کاری تێ بکا که هەستا ئەی وت : خەریك بوو ئەم پیاوە سەیرە بە قسەکانی موسڵمانم بکات ..

ئەوەبوو دواتر کۆمەڵەی ( إتحاد وترقي ) کە کاریان گرتە دەست و ، بیرو باوەری رزیوی بێ دینیی خۆیان ئاشکرا کرد ، دەستیان دایە تیرۆرکردنی نەیارانیان و، لە سێ دارەدانیان، مامۆستا بەوپەری غیرەتەوە دژیان ئەوەستا و زوڵم و ستەمی ئەو ماوەیەی بۆ روون ئەکردنەوە

ئا لەو کاتەدا موفتیی وڵاتـی میصـر ، مامۆسـتا بوخـەیتی مـوطیعیـی [٥٧] سەردانی ئەستەنبوڵ ئەکات ، کە زانایەکی بە ناوبانگ ئەبێت، هەنـدێك لایـان

[٥٧] یەکێك لە گەورە فەقیهانی میصر بووە و ، لە شاری موطیعەی سەر بە پارێزگای ئەسیووطی صـەعیدی میصر لە دایك بووە، لە ئەزهەر خوێندنی تەواو کردووە و سـەرگەرمی دەرس وتنـەوە بـووە . سـاڵی ١٢٩٧ ك گوازراوەتەوە بۆ قەضای شەرعیی و ، پەیوەندییشی بە بەرێز ( جمال الـدین ) ی ئەفغانییەوە کردووە و ، پاشان لە ١٣٣٣ ك دا بۆتە موفتیی وڵاتی میصر هەتا ١٣٣٩ ك . چەند کتێبێکی بە نرخی هەن و ، ساڵی ١٣٥٤ ك کۆچی دوایی کردووە . ( الأعلام : ٦ / ١٢٧٤ )

وابوو شتێکی عەنتیکە ئەبێت، کە ئەگەر ئەم زانایە و ( بدیع الزمان ) بکەونە وت و وێژ و ، لەوانەیە ئەوەی، کە بە زانایانی ئەستەنبوڵ نەکرا ، کە بریتیی بوو لە بەزاندنی ( بدیع الزمان ) ، ئەم بتوانێ ئەنجامی بدات .. ئەم پێشنیارە خرایە بەردەم مامۆستای میصریی و ئەویش رەزامەندیی دەربریی .

رۆژێکیان لە قاوەخانەیەکی نزیکی مزگەوتی ئایاصۆفیا و ، دوای نوێژی عەسر، مامۆستای میصریی زانیی ( بدیع الزمان ) لەوێیە ، بە هەلی زانیی لەگەڵیا بکەوێتە وت و وێژ و ، لەبەردەم کۆمەڵە زانایەکدا ئەم پرسیارەی ئاراستەی ( بدیع الزمان ) کرد :

دەربارەی ئەو سەربەستییەی، کە لە دەوڵەتی عوثمانییدا هەیە و ، دەربارەی شارستانێتیی ئەوروپاش رات چییە ؟

( بدیع الزمان ) وەلاّمی دایەوە :

دەوڵەتی عوثمانیی بە دەوڵەتێکی ئەوروپاییەوە ئاوسە و ، رۆژێك دێت، کە لێی ببێ و ، ئەوروپاش بە ئیسلامەوە ئاوسە و ، رۆژێك دێت، کە لێی ببێ ..

مامۆستای بەرێز وتی : منیش تەصدیقی ئەوە ئەکەم، کە ئەیڵێ .

پاشان بە زانایانی دەوروبەری وت : ئەم گەنجە بەرابەرکێی لەگەڵدا ناکرێ و ، ناشتوانم بی بەزێنم ..

ئەوەتا لە دایك بوونی یەکەمان دیی، کە بۆ دوورکەوتنەوە لە دین چارەکە صەدەیەك پێشی ئەوروپا کەوت .. بەلاّم لە دایك بوونی دووهەم بە ئیزنی خوا دوای سیی ساڵ دەرئەکەوێت . لە خۆرهەلاّتیش و لە خۆرئاواش دەوڵەتێکی ئیسلامیی پەیدا ئەبێت .. [٥٨]

---

[٥٨] الملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢ / ٣٨٦ . ( سيرة ذاتية : ٨٤ ، ٨٧ ، رجل القدر : ٣٧ ـ ٣٨ )

## سێهەم : چالاکیی ئەو ماوەیەی

دوای ئیعلانی دەستووری دووهەم و ، ئازادکردنی رۆژنامەکان تـا چـییان پـێ خۆشە بی نووسن ، هەرچیی و پەرچیی و ئاژاوەیەك بلاّو بوویەوە، چیی ئەنووسرا لە سەرانسەری دەولّەتی عوثـمانییدا دەنگی ئەدایەوە .. هەر نووسەر و بیریارێك وەهای ئەزانی هەرچیی ئـەو ئـەی زانـێ راسـتییە و ، تـەنها بـەوەش خزمـەت ئەکرێت.. لە راستییدا بەشێك لە نووسەران بـە راسـتیی رۆشـنبیر بـوون، و بـە دڵسۆزانە کاریان ئەکرد ، بەو هیوایەی نەخۆشییەکان بدۆزنەوە و ، دەرمانیان بـۆ دیاریی بکەن، بەلاّم بەشێکی تر بۆ بەرژەوەندیی خۆیی کاریـان ئـەکرد و ، بـە لایانەوە ئاسایی بوو، خۆیان بە هەموو لایـەك بفرۆشـن ، بـەو مەرجـەی پـارە و پوولّیان دەست بکەوێ، دیارە هەموو کۆمەلّێك لە هەردوو بەشـەکەی تێدایـە ، ئەوەندە هەیە ئەگەر ئەو کۆمەلّە زیندوو بێت دڵسۆزەکانی زۆر ئەبن و خۆ فرۆشانی دەگمەن ئەبن، بەلاّم ئەگەر زۆربەیان ئاوی روویان تکا و شەرم و حەیا لەلایان باری کرد ، ئەوا دڵسۆزە پاکەکان غەریب و نـاوازە دەرئەچـن .. لـە هـەمان کـاتدا دەولّەتە مل هورەکـان وەك ئینگلیـز و فەرەنسـە و روسـیا تـەماعیان کردبـووە دەولّەتی عوثـمانیی ، بۆیە پارەیەکی زۆریان بە خەرج ئـەدا بـەو مەرجـەی ئـەو دەولّەتە لاواز بکەن و سەرەنجام بیخەن .. لەلایەکی تـرەوە ماسـۆنیەتیش دەوری خۆی بینیی و کۆمەلّەی ( إتحاد وترقي ) هێنایە سەر حوکم تا ئاواتـەکانی خـۆی بێنێتە دیی .

هەر لەم ماوەیەدا نووسین و بیری ئیلحادیی تەشەنەی کرد و ، نەمانی سولّتان عەبدولحەمیدیان بە هەل زانیی، کە ساڵەهای ساڵ بوو پەرچی ئیلحادی ئەدایەوە و، ئالاّی کۆمەلّگای ئیسلامیی بەرز ئەکردەوە .. ئەو مولحیدانە چەند گۆڤار و کتێب و رۆژنامەیان دەرئەکرد

شایانی باسە، کە بیری ئیلحادیی لە خاکی ئیسلام دا نەش و نومای نەکردبوو ، بەڵکو وەك درەختێکی نامۆ لە ئەوروپا هەڵیان کێشا بوو، و هێنابوویان لە خاکی قورئاندا بینێژن . دیارە جگە لە گێلیی و خـەواڵوویی موسـڵمانان هـیچ شـتێك پشتگیریی لە کاری وەها ناشەرعیی ناکات ..

لە هەموو دنیادا چ میللەتێك دەست لە میللەتی خۆی هەڵ ئـەگرێت و ، بـە دوژمنی ئەفرۆشێت ؟!

بۆیە بەرامبەر بەو نووسەرە خۆفرۆشـانە چـینێکی بـەرێز لـە نووسـەران پـێ گەیشت، کە بە شێوازێکی بەرز و پیرۆز راستییەکانیان ئەخستە پێش چـاوان و ، پێشکەشیان ئەکرد، لە هەموو ئەوانە بە ناوبانگ تر ئەحمەد حیلمیـی شـابەندەر زادە [٥٩] و ، ئیسماعیل فەننیی بوو . [٦٠]

دیارە مامۆستا ( بدیع الزمان ) لە هەموان زیاتر هەستی بە مەترسیی شەپۆلی ئیلحاد ئەکرد و ، لە هەموانیش زیاتر غیرەتی ئەجوولا ، بەڵام ئەم بە شێوەیەکی

---

[٥٩] ئەحمەد حیلمیی شابەندەر زادە ( ١٨٦٥ ـ ١٩١٤ ) : لە فیلیبا لە دایك بووە و ، زانستە شەرعییەکانی لای موفتیی ئەو شارە خوێندووە و ، ئامادەییشی لە ئەستەنبوڵ تەواو کردووە، سەری لە بەیرووت و میصر و فیزان داوە و لە ١٩٠٨ دا گەڕاوەتەوە ئەستەنبوڵ و گۆڤارێکی حەفتانەی بە ناوی ( الإتحاد الإسلامي ) دەرکردووە ، بەڵام کۆمەڵەی ( إتحاد وترقي ) دایان خستووە ، ناچار لە گۆڤار و ڕۆژنامەی تردا نووسینەکانی بڵاو ئەکردنەوە، پاشان ڕۆژنامەیەك و چاپخانەیەك دائەمەزرێنێ و دەست ئەداتە هێرش بۆ سەر ( إتحاد ) یەکان و ئەوانیش دایان ئەخەن . پاشان لە ١٩١٢ دا گۆڤارێکی گاڵتەو گەپی حەفتانەی دەرئەکرد، لە کۆلێژی ( فنون ) دەرسی فەلسەفەی ئەوتەوە و ، چەند کتێبی نایابیشی نوسیوە لەبەر ئەوەی مامۆستا یەکێ لەوانەی، کە هێرشی ئەکردە سەر صەهیۆنیەت و ماسۆنییەت ، ژەهریان دەرخوارد دا و لە ساڵی ١٩١٤ وەفاتی کرد

[٦٠] ئیسماعیل فەننیی ( ١٨٥٥ ـ ١٩٤٦ ) لە شارێکی بولغاریای ئێستا لە دایك بووە و ، سەرەتای خوێندنی لەوێ تەواو کردووە، لە تەمەنی بیست ساڵییدا دێتە ئەستەنبوڵ و لەوێ خوێندن تەواو ئەکات، زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی و فەرەنسیی و فارسیی بە چاکیی شارەزا بووە، سەرەڕای خوێندنەوەی زۆری و ، سەرەڕای ئەوەش، کـە شاعیر و مۆسیقاڕ و ئاوازساز بووە

ئاسان و ناسك دەستی دایە بەرگریی لە ئیمان و ، بە نووسینە دڵ رفێنە پـر لـە کاریگەرییەکانی دەستی دایە پەرچ دانەوەی ئیلحاد ، بە شێوەیەك، کە ئەوانـەی خوێندەوارییان کەم بوو، لێی تێ بگەن و ، شـارەزا پایەبـەرزەکانیش کـەڵکی لێ وەربگرن ، بەڵاّم لەم ماوەیەدا نووسـراوەکانی لـە گۆڤـار و رۆژنامـەکاندا بـڵاّو ئەکردەوە

ئەوەبوو ( حسين جاهد يالچين ) کە سەرنووسەری رۆژنامەی ( طنين ) و یـەکێ لە ئەندامە ناودارەکانی کۆمەڵەی ( إتحـاد و ترقـي ) بـوو ، دەسـتی دایـە بـڵاّو کردنەوەی عەلمانیەت و دژایەتیی کردنـی ئیسـلام ، هـەروەك وەهـا بزانـێ، کـە ئیسلامیش وەك دینی مەسیحیەت وەهایە، دەری ئەبریی، کە خۆرئاوا دوای پشت هەڵکردنیان لە کەنیسە بەرەو پێشەوە چوون .[٦١]

مەردانە مامۆستا نوورسیی وەك شێری بێشە لێی دەرپەریی و ، بە مەقالەیەك پەرچی دایەوە، کە لە ئیسلامدا پیاوی دینیی نیە و ، کەس ناتوانێ خـۆی فـەرز بکات ، بەڵکو لە ئیسلامدا مامۆستای ئیرشاد و رێ نیشاندان هەن ، کە خۆیان بە جوانیی رەفتار بـە وتـەکانیان ئەکـەن و ، لـە هـەموو کەسـێك زیـاتر پابەنـدی فەرمانەکانی شەریعەتن .

---

[٦١] حسين جاهد يالچين ( ١٨٧٥ ـ ١٩٥٩ ) رۆژنامەنووس و رۆمان نووسێکی تورکییە و ، فـەرمان بـەر و مامۆستای ئینگلیزیی و فەرەنسیی بووە، پاشان دەستی داوەتە نووسینی مەقالە و چیرۆك و رۆمان، دوای کوودەتای ١٩٠٨ تێکەڵ بە سیاسەت بوو، و بە نوێنەری ئەستەنبووڵ هەڵ بژێررا و ، لە رێی رۆژنامەی ( طنين ) ەوە بەرگریی لە ( إتحاد و ترقي ) ئەکرد، کە دەوڵەتی عوثمانیی دڕا و ( إتحاد ) ی یەکانیش لە ١٩١٨دا کەوتن و نەفیی کران ، ئەویش نەفیی کرا بۆ دوورگەی ( مالطه ) . سێ ساڵ لەوێ مایەوە و فێری زمانی ئیتاڵیی بوو، و چەند کتێبێکی وەرگێڕان، بە نووسینەکانی دەورێکی وێران کاریی ئەبینی

لێرەدا ( حسین جاهد ) لـە وتـەکانی پەشـیمان بوویـەوە و دەری بریـی، کـە مەبەستی دژایەتیی نەبووە ، بەڵکو ئیمانی بەو بنچینانە هەیە کە ( بدیع الزمان ) باسی کردوون .

هەروەها ئەمیر محمد صباح الدین، کـە خوشـکەزای سـوڵتان عـەبدولحەمیـدی دووهەم بووە، هەندێ پێشنیار پێشکەش ئەکات تـا چارەسـەری گیروگرفتـەکانی دەوڵەتی عوثـمانیی بکرێت ، کە بریتیی بوون لە بڕیاردان لەسەر لامەرکەزیەت و حوکمیی زاتیی دان بە کەمینە نەتەوەیی و دینییەکانی دەوڵەت، بەلاّم مامۆستا ( بدیع الزمـان ) پەرچی ئەم رایەشی دایەوە و ، دەری بریی، کـە ئـەو نەخشـەیە بریتییە: لە پارچە پارچە کردنی دەوڵەتی عوثـمانیی و ، بە قازانجی دەوڵەتە تەماع کارە بێگانەکان دەرئەچێت ، بەڵکو چاك وەهایە کە بیر لە یەك بوونی موسڵمانان و هەوڵی جێبە جێ کردنی شەریعەت بدرێت ، چونکە ئیسلامی بێگەرد بە ئەحکامە پڕ عەدالەتەکانی مافی هەموو لایەك ئەپارێزێ و ، رەحمەتی خوایە بۆ هەمووان ، هەتا بۆ نامو‌سڵمانەکانیش ..

وەنەبێ مامۆستا ( بدیع الزمان ) تەنها بە مەقالـە نووسـین خـەریکی کـار و خزمەت بوو بێت ، بەڵکو لە هەر لایەك فیتنە و ئاژاوەیەك سەری هەڵ بدایە خێرا هەڵمەتی ئەدا و مەردانە قۆڵی لێ هەڵ ئەماڵیی هەتا ئاو بەسەر ئاگردا بکات و، نەهێڵێ تەشەنە بکات ..

ئەوەبوو لە یەکێ لە کۆبوونەوە جەماوەرییەکان‌دا، کە لەسەر شانۆی فەرەح لە ناوچەی شازادەباشیی ئەستەنبوڵ‌دا ئەنجام درا ، خەریك بوو، فیتنە و ئاژاوە ، لە نێوان پشتیوانانی کۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) و نەیارەکانیان دا ، بەرپا ببێ ، بگرە خەریك بوو خوێنی لێ بکەوێتەوە ، خێرا مامۆستا نوورسیی هەڵمەتی دا و چووە سەر سەکۆی شانۆکە و بە دەنگە زولاڵەکەی بانگی کردە ئامـادەبووان تـا هێـور ببنەوە و ، خۆیان بگرن و ، رێز لە را و بۆچوونی یەکتریی بگرن و ، دەریشی بریی،

کە میللەتێك دەستوور و پەرلەمانی ساز دابێ ، شوورەییە بۆی ئازادیی لە بەرامبەرەکەی زەوت بکات و مافی پێ شێل بکات و ، بیریشی خستنەوە، کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە سنگی فراوانەوە راوێژی لەگەڵ هاوەڵانی ئەکرد ئەوەبوو هێمنی کردنەوە و ، لە رشتنی خوێنی یەکتریی دەست کۆتای کردن .

هەروەها مامۆستا بە سەلیقە بێ وێنەکەی خۆی هەوڵ ئەدات حەماڵە کوردەکانی ئەستەنبوڵ واز لەو بریارەیان بهێنن، کە ئەوەبوو دەستیان لە کار کێشابوویەوە و ، خەریك بوو کاری خراپی لێ دەرچێ .

لە نۆهەم رۆژی مانگی رەمەزانی ساڵی ١٣٢٦ ك ، بەرامبەر بە نۆهەم رۆژی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨ز دا نەمسا بریاری دا بۆسنە و هەرسك بخاتە سەر وڵاتەکەی ، ئەمەش بە بۆنەی ئەوەوە، کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم رەحمەتی خوای لێ بێ دەسەڵاتی نەمابوو و ، هەندێ ئەفسەری گەنجی هیچ نەزان کاروباریان هەڵ ئەسووراند و، هیچ شارەزاییەکیان لە سیاسەت و کونج و کەلەبەرەکانی نەبوو.

بە بۆنەی ئەم بریارەوە لە دەوڵەتی عوثمانییدا بریار درا، کە پشت لە کەل و پەلی نەمسا بکرێت و هیچ کەس هیچیان لێ نەکرێت ، حەماڵەکانیش بریاریان دا ئەو کەل و پەلانە دانەگرن و باریان نەکەن، ئەمە پەرەی سەند و خەریك بوو، کار بکاتە سەر بازار و بازرگانیی ئەستەنبوڵ و ، حەماڵەکانیش لە سەرۆکەکانیان یاخیی بوون و ، لە هەندێ قاوەخانەدا و لە بنکەی سەرەکیی خۆیاندا کۆ ئەبوونەوە

جا مامۆستا حەکیمانە وتارێکی قەشەنگی بۆ دان و ، نەی هێشت پەرە بسێنێ و شتی خراپی لێ بکەوێتەوە ، هەتا پشکێنەری پۆلیسی گشتیی ئەستەنبوڵ سوپاس و پێ زانینی خۆی بە مامۆستا نوورسیی کرد

هەتا مامۆستا ساڵێك لەوەو بەر خەمی ئەو کوردانەی ئەستەنبوڵ ئەخوا و، ئەترسێت هەڵگرانی حیزبەکان سادەییان بە هەل بزانن و بیان خەڵەتێنن ، بۆیە

بەسەريان دا ئەگەڕێ و لە قاوەخانە و شوێنی کۆبوونەوەيان دا بەسەريان ئەکاتەوە و لە بارودۆخی وڵات و سەربەستيی شەرعيی تێيان ئەگەيەنێت، هەتا ئـەدات بـە گوێياندا، کە سوڵتان پێويستە شوێن سوننەتی پێغەمبەری خـوا ﷺ بکـەوێت ئەوسا موسڵمانەکان گوێ رايەڵيی فەرمانی بکەن ، ئەگينا هەر کەس لە پێغەمبەر ﷺ ياخيی ببێ و ستەم لە خەڵکيی بکات حـوکمی جـەردەی هەيـە ئەگەرچـيی سوڵتانيش بێت ..

هەروەها لە ٢٧ ی شوباطی ١٩٠٩ دا هەزاران قوتابيی زانستە شەرعييەکان لە ناوچەی بايەزيدی ئەستەنبوڵدا کۆبوونەوە و ، دەستيان دايە دەربڕينی نارەزايی بەرامبەر ئەو بڕيارەی، کە وەزارەتی جەنگ دەری کردبوو بـۆ ئـەوەی قوتابيـانی زانسـتە شـەرعييەکان خزمـەتی عەسـکەريی ئـەنجام بـدەن ، کـە لـەوەو پـێش چاوپۆشييان لێ ئەکرا ، بۆ ئەوەی سەرگەرمی خوێندن بێـت، جـا هەنـدێك بـەو بيانووەوە خۆيان ئەکردە قوتابيی دينيی هەتا لە خزمەتی عەسـکەريی رزگاريـان ببێ، بەم بۆنەوە ژمارەی قوتابيان يەکجار زۆر بوو، و وەزارەتی جەنگيش بڕياری دا تاقيی کردنەوەيەکيان بۆ ئەنجام بدات و ، ئەوەی دەرچوو چاوپۆشيی لێ بکرێ و، ئەوەش دەرنەچوو بکرێ بە سەرباز، بۆ ئەمە کاتی تاقيکردنەوە دياريی کرا، بەڵام ئەوەندە ماوەی نەبوو تا قوتابيان خۆيان ئامـادە بکـەن ، لەبـەر ئـەوە قوتابيـان دەستيان دايە خۆ پيشان دان و خەريك بوو لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت دا لێك بدەن، بەڵام مامۆستا ( بديع الزمان ) بـە پەلـە خـۆی گەيانـدە لای ئـەو قوتابيانـە و وتارێکی گونجاوی بۆ دان، کە بووە مايەی هێور کردنەوەيان و ، نەهێشتنی توند و تيژيی و بڵاوەکردن بە خۆپيشاندانەکە بە هێمنيی و لەسەرخۆ ..[٦٢]

---

[٦٢] سيرة ذاتية : ٩٣ ـ ٩٤ ، رجل القدر : ٣٩ ـ ٤٣

### چوارەم : کۆمەڵەی « الإتحاد المحمدی »

لە ڕۆژی ٥ ی نیسانی ١٩٠٩دا سوهەیل پاشا و ، موحەمـــمەد صـادق و ، فەریق ڕەضا پاشا و دەروێش وەحدەتیی لەگەڵ کەسانی تردا کۆمەڵەی ( الإتـحاد الـمحمدي ) یان پێك هێنا و ، بە کۆبوونەوەیـەکی دینیـی قەڵـەباڵغ لـە شـاری ئەستەنبوڵدا و لە مزگەوتی ئایا صۆفیا ئیعلانیـان کـرد، کـە ئەسـتەنبوڵ ڕۆژی وەهای بە خۆیەوە نەدیی بوو .

دروست بوون و پێك هێنانی ئەم کۆمەڵەیە هەڵقوڵاوی غیرەت و مەردایـەتیی ئیمان داران بوو، کە لە پایتەختی ئیسلامدا بە چاوی خۆیان دژایەتیی ئیسلامیان ئەبینیی و ، مارەکانی ئیلحادیش بڵێسەی زمانیان ئەهات و ، بەبێ شەرم و حەیا دژایەتیی قورئان و فەرموودەیان ئەکرد

مامۆستا ( بدیع الزمان ) یش ئامادەی ئەم کۆبوونەوەیە بوو، و کە هات بـە کۆمەڵێکی گەورەی قوتابیانی زانستە شەرعییەکان دەوری گیرا بوو، و وتارێکیشی پێشکەش کرد، کە نزیکەی دوو سەعاتی پێ چوو، و هانی موسڵمانانی بۆ ئەوە ئەدا، کە دەست بە ئیسلامەوە بگرن و ، دوژمنان خـەریکن داو بـۆ موسـڵمانان ئەنێنەوە .

شایانی باسە دەروێش وەحدەتیی یەکێ بوو، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی یەك گرتنی موحەمـــمەدیی و خاوەنی ڕۆژنامەی وولقـان واتـە گرکـان بـوو ، کـە بـە نووسینی توندوتیژ ناوبانگی دەرکردبوو .

وەحدەتیی لە بنەڕەتدا قوبروصیی بوو، و دوای ئیعلانی دەستووری دووهـەم هاتبووە ئەستەنبوڵ و ، تەمەنیشی بیست ساڵان بـوو، و ڕۆژنامەکەشـی زمـان حاڵی کۆمەڵەی موحەمـــمەدیی بوو، جا هەرچەندە مامۆستا ( بدیع الزمان ) لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە نەبوو ، هەندێ مەقالەی لە ڕۆژنامەی گرکـاندا بـڵاو

ئەكردەوە .. لەو مەقالانەدا داوای هێمنیی و یەكریزیی و وازهێنان لە كـردەوەی نالەباری ئەكرد و ڕێی ڕاستی پیشـان ئـەدا بـەڵكو لـە هەڵـە و هـەرزەیی دوور بكەوێتەوە، جارێكیان ئەم نامەی نووسیی :

بۆ برام دەروێش وەحدەتیی !

پێویستە ئەدیبان خۆیان بە ئەدەب برازێننەوە ، بە تایبەت ئەدەبی ئیسلامیی و، با ویژدانی دینییش پاسەوانی یاسای چاپ كراوەكان بێت ..

بەڵام وەحدەتیی ئەو ئامۆژگارییانەی نەبیستن و لەسەر ڕەوتی خـۆی بـەردەوام بوو، تا ئەوەبوو لە دوای ڕووداوی ( ٣١ ی مارت ) گیرا و درا بە مەحكەمە و لە سێدارە درا

كە كۆمەڵەی ( الإتـحاد الـمحمدي ) دائەمەزرێت مامۆستا نوورسـیی ترسـی ئەوەی لێ ئەنیشێ، كە هەندێ نەزان كاری نەشیاو ئەنجام بدەن و ، لەسەر ئەو ناوە پیرۆزە بكەوێت و، كە پاڵیشی پێوە ئەدات لەلایـەن خۆیـەوە پـاڵ بـەو كۆمەڵـە نوورانییە گەورەوە ئەدات، كە موسڵمانان لە سەرانسـەری جیهـانی ئیسـلامییدا دروستیان كردووە و ، ژمارەی ئەندامەكانیشی لە(٣٠٠ )سێ صەد ملیۆن كـەس زیاترە و، بریتییە لە بازنەیەك، كە پەیوەستە بە زنجیرەیەكی نوورانییەوە، كە لـە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا و لە بـاكوورەوە بـۆ باشـوور درێـژ بۆتـەوە و ، لایـەنی یەكێتیی و پەیوەندیی ئەندامەكانی تەوحیدی خوایە و ، سوێند و پەیمانیشی ئیمانە و ، ئەندامانیشی ئیماندارانی مێژووی دوور و درێژی مرۆڤایەتیین و ، تۆمارگـای ناوی ئەندامەكانیشی ( لوح الـمحفوظ ) ە و ، بـڵاو كـەرەوەی بـیر و فیكریشـی هـەموو كتێـب و ڕۆژنامەیـەكی ئیسـلامیین، كـە مەبەسـتیان بەرزكردنـەوەی فەرمایشتی خوایە و، شوێنی كۆبوونەوەكانیشی مزگـەوت و تەكیـە و قوتابخانـە

شەرعییەکانی سەرانسەری جیهانی ئیسلامیین و ، بنکەی سەرەکییشی هەردوو حەرەمی شەریفن..

دیارە کۆمەڵێك بەم ناونیشانانە بەرپا ببێت ، پێویستە سەرۆکەکەی فەخری کائینات ، حەزرەت ( محمد المصطفى ) بێت ﷺ و مەسلەك و پرۆگرامیشی بریتیی بێت لە چاوکردنی هەموو ئەندامێك لە رەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ و ، زیندووکردنەوەی سوننەتی پاك و بێ گەرد و ، خۆشەویستیی ئیمان داران و ، پێشکەش کردنی ئامۆژگاریی بۆیان و ، یاسای ناوەندییش سوننەتی پاك و بێ گەرد بێت و ، دەستوور و یاسایشی فەرمان و قەدەغە شەرعییەکان بێت و ، شمشێر و چەکیشی دەلیل و بەڵگە قەناعەت پێ کەرەکان بێت ، چونکە هیدایەت دانی ئەوروپا بە قەناعەت ئەبێت نەك بە زۆر و ناچارکردن .. بە خۆشەویستیی ئەبێت نەك بە دژایەتیی و بەربەرەکانێ .. مەبەست و ئامانجیش بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوایە و ، رێژەی رەوشت و خواپەرستیی و کاروباری قیامەتیش لە شەریعەتدا ٩٩٪ لە صەدا نەوەد و نۆیە و ، رێژەی سیاسەتیش لە١٪ صەدا یەك زیاتر نیە و، مەبەستی ئێمەی موسڵمانیش بەرزکردنەوە گرۆی ئادەمییەکانە بۆ پلە بەرزەکان و ، پێشکەوتنی ماددیش لەم سەردەمەدا یارمەتیی گەشەکردنی بانگی پیرۆز ئەدات .

بەم شێوەیە و بەم تێ گەیشتن و بۆچوونەوە مامۆستا نوورسیی پاڵ بەو کۆمەڵەیەوە ئەدات و ، خۆیشی بە بچووکترین ئەندامی لە قەڵەم ئەدات، کەواتە هەموو ئیماندارێك سەر بەو کۆمەڵەیە و ، جگە لە مولحید و بێ دینەکانیش هیچ کەس لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا نیە .

ئەمە بۆچوونی مامۆستا نوورسییە بۆ کاری ئیسلامیی .. ئیتر نابێت موسڵمانان بەش بەش بن و پارچە پارچە بن ، هەتا ئەگەر لە ژێر ناونیشانی جۆراو

جۆریش‌دا کار بکەن ، پێویستە ئەو خالآنەی سەرەوە لە یاد نەکرێن و ، موسڵمانان هەر بە یەك کۆمەڵە بزانرێن و ، کارکردنیان لە دژی یەکتریی شەرعیەتی نیە

کاتێك کە کۆمەڵەی ( الإتحاد المحمدي ) دامەزرێنرا ، لەلایەن ناحەزانیەوە هەندێ وەهم درانە پاڵی، مامۆستا نوورسییش بە ژیرانە وەڵامی ئەو وەهمانەی دایەوە

لەو رۆژانەدا رۆژنامەکان کاریان بۆ رووخاندنی خوورەوشت ئەکرد و ، ورەو غیرەتی موسڵمانانیان ئەرووخاند ، بۆیە مامۆستا نوورسییش وای بە چاك زانیی ئامۆژگارییان بکات و ، هەوڵیان لەگەڵ بدات تا رێز و ئیحترام بپارێزن . خۆیشی بە مەقالەی بەهێز رۆژنامەکانی ئەرازاندنەوە و ، دەری ئەبریی کە بە سەروماڵ بەرگریی لە شەریعەت ئەکات و ، هەموو ژیانی بۆ خزمەتی سوننەتی بێ گەرد تەرخان کردووە .[٦٣]

---

[٦٣] رجل القدر : ٤٤ ـ ٤٥ ، سيرة ذاتية : ٩٥ ـ ٩٦

## پێنجەم : رووداوی ٣١ ی مارت

رووداوی ٣١ ی مارتی ساڵی ١٣٢٥ ی رۆمیی بەرامبەر بە ٢٢ ی رەبیعی یەکەمی ١٣٢٧ ی ك ، ١٣ ی نیسانی ساڵی ١٩٠٩ ی زاینیی ، [٦٤] بریتیی بوو، لە یاخیبوونی سەربازانی ئەو هێزە سەربازییەی، کە لە لایەن ( إتحاد ) یەکانەوە لە شاری سلانیکەوە نێررابوو، بۆ ئەستەنبوڵ بۆ پاراستنی دەستوور و مەشرووطیەت .

ئەم یاخیی بوونە لە نیوەشەوی ١٣ / نیسانی ١٩٠٩ لە سەربازگەی ( طاش قشله ) رووی دا ئەوەبوو سەربازەکان هەڵمەتیان دا و ئەفسەرەکانیان بەند کردن و ، خۆیشیان رژانە گۆرەپانی سوڵتان ئەحمەد و ، کە رۆژ بوویەوە دەستیان دایە گوللە تەقاندن بە هەوادا و ، ترس و لەرزێکی زۆریان پەخشان کرد، بە دەنگی بەرزیش هاواریان ئەکرد :

ـ شەریعەتمان ئەوێت .. شەریعەتمان ئەوێت .

پاشان نێرراویان ناردە لای سەربازگەکانی تر و داوایان لێکردن ئەوانیش بدەنە پاڵیان، ئەوەبوو هەندێ سەربازی تر پاڵیان پێوە دان ، سەرەرای هەندێ قوتابیی قوتابخانە دینییەکان و کەسانی صۆفیی و هەندێ کەسی تریش، کە چارەی ( إتحاد و ترقي ) یان نەئەویست، ئەم یاخیی بوونە یانزە رۆژی خایاند و چەند کەسێکیش گیانیان لە دەست دا

هەر، کە سوڵتان لەو یاخییبوونە ئاگادار بوو، سەرۆکی نووسەرانی خۆی ناردە لایان تا دڵخۆشیان بکات ، کەچیی یاخیی بووەکان داواکاریی تریان راگەیاند ، کە ئەوەبوو داوایان ئەکرد ( حسين حلمي پاشا ) ی سەرەك وەزیر و ، ( علي رضا

---

[٦٤] رجل القدر : ٥٧

پاشا ) ی وەزیری جەنگ و ، ( محمود مختار پاشا ) ی فەرماندەی فیرقەی یەك و ، ( أحمد رضا ) ی سەرۆکی پەرلەمان لا ببرێن و ، ( إتحاد )یەکان لە ولآت نـەفیی بکرێن و ، ئەفسەرەکانی ( ئالایلیی ) کە خانەنشین کرابوون بگەڕێنەوە سەر کار و، چاوپۆشییش لەوانە بکرێ، کە بەشداریی ئەم یاخیی بوونەیان کردووە

ســـەربازەکان هـــەوڵیان دا ســـەرۆکی پەرلـــەمان و ڕۆژنامـــەنووس ( حسین جاهد یالچین ) کە دوو دوژمنیی سەرسەختی ئیسلام بوون، دەسـت گـیر بکەن و بیان کوژن، کەچیی خۆیان حەشار دابوو و دەست نەکەوتن ، بـەڵام نـاظم پاشای وەزیری عەدل کوژرا ، چونکە سەربازەکان بە ( أحمد رضا ) یان زانیی و ، ئەمیر محمد أرسلانی نائیبی ( لاذیقیە ) ش کوژرا، کە وایان زانیی ( حسین جاهد ) ی دوژمن بە ئیسلامە، هەروەها کۆمەڵێك ئەفسەری دەرچووی کۆلێژی جەنگ بە دەستی سەربازەکان کـوژران چـونکە ئەوانـەیان بـە پاڵپشـتی ( إتحـاد ) یـەکان ئەژمارد

جا هەرچەندە سوڵتان سەرەك وەزیرانی لابرد و تەوفیق پاشای خستە جێگەی و، وەزیری جەنگ و فەرماندەی فیرقەی یەکی لەبەر داواکاریی سـەربازەکان لابـرد ، کەچیی یاخییبوونەکە کۆتایی نەهات .

ئەندامانی ( إتحاد و ترقي ) لە سلانیکەوە دەستیان دایە بروسـکە نـاردن بـۆ کۆشکی یەڵدز و ، سوڵتانیان بەوە تاوانبار ئەکرد، کە گوایا ئەم یاخییبوونە دەست کیسەی ئەوە و ، مەبەستی لە ناوبردنی دەستوور و ، کۆمەڵی ( إتحـاد و ترقـي ) یە، بۆ ئەمە بریار درا لە سلانیکەوە هێزێکی سەربازیی ڕەوانـە بکـرێ تـا ئـەو یاخییبوونە کپ بکاتەوە .. ئەم هێزە سەربازییە بە فەرمانداریەتیی مەحموود پاشا ڕەوانەی ئەستەمبووڵ کرا ، تا دەسەلآت بگێڕێتەوە بۆ ( إتحاد ) یەکان، ئەوەبوو لـە ١٥ ی نیسـاندا کەوتـە ڕێ و ، لـە ٢٣ ی نیسـانی ١٩٠٩ دا گەیشـتە

ئەستەمووڵ و دەستی بەسەردا گرت .. لە راستییدا ئەم سوپایە سوپایەکی نیزامیی تورکیی نەبوو، بەڵکو سەرەرای هەندێ سەربازی تورك ، خەڵکی تری مەدەنیی لە بولغار و ئەلبانیی و جوولەکەی دۆنەمەی سلانیکیشیان لەگەڵدا بوون، کە دوژمنی دەوڵەتی عوثمانیی بوون و چەندین ساڵ لەگەڵیا جەنگابوون ..[٦٥] ئەم سوپایە حوکمی عورفیی ئیعلان کرد و ، دادگایەکی عەسکەرییشی بۆ دادگاییکردنی لێ پرسراوانی ئەم رووداوە دامەزراند .

ئەم سوپایە زۆر بەهێز نەبوو ، بەڵکو سوپای پارێزەری کۆشکی سوڵتان زۆر لەو بەهێزتر بوو ، کەچیی، کە سوپای حەرەکەی سلانیك ویستی سوڵتان دابماڵێ ، سوپای کۆشك داوای لە سوڵتان کرد، کە ماوەی بدرێ تا سوپای سلانیك لەناو بەرێت ، بەڵام سوڵتان رازیی نەبوو، لەسەر داماڵینی ئەو خوێن برژێت، ئیتر ئەوەبوو سوپای حەرەکە لە ٢٧ ی نیسانی ١٩٠٩ زدا بەرامبەر بە ٦ ی رەبیعی دووهەمی ١٣٢٧ ك سەعات ( ٣٢ : ١ ) ی زەوالیی سوڵتان داماڵرا و دەسەڵات کەوتە دەست ( إتحاد ) یەکان، کە سوڵتان رەشادی برای سوڵتان عەبدولحەمیدیان کردە سوڵتان ..

ماموٚستا نوورسیی چەند دەقیقەیەك ئەو یاخیی بوونەی بینیی ، خێرا بۆی دەرکەوت بەرەو ئەنجامێکی چاك ناروات، چونکە گوێڕایەڵیی فەرمان نەماوە و، ئامۆژگارییش کەڵکی نیە ، بۆیە دوای سێ دەقیقە شوێنی یاخیی بوونەکە چۆڵ ئەکات و بە پەلە خۆی ئەگەیەنێتە یەکێ لە گەرەکەکانی ئەستەنبوڵ بە ناوی ( باقر گوی ) تا نەهێڵێ دۆستەکانی تێکەڵ بەو کارە بن و ، هەرکەسی بدیایە ئامۆژگاریی ئەکرد

---

[٦٥] رجل القدر : ٤٥ ـ ٤٦

بۆ رۆژی دووهەم پرسیار لە هەندێ سەربازی گوێ رایەڵ ئەکات، کە چەند ئەفسەر پێکراون؟ ئەوانیش هەواڵی ئەدەنێ، کە تەنها چوار ئەفسەری ستەم کار پێکراون .[٦٦]

مامۆستا، کە دیتی وا گوێ رایەڵیی سەربازان لە جێی خۆیدا نیە ، زۆری پێ ناخۆش بوو ، بۆیە بە سەربازانی راگەیاند :

ئەی سەربازان ! ئەگەر ئەفسەرەکانتان بە یەك تاوان ستەم لە خۆیان بکەن ، ئەوا ئێوە بەم یاخیبوونەتان ستەم لە سیی ملیۆن عوثمانیی و سێ صەد ملیۆن موسڵمان ئەکەن، چونکە شەرەف و رێزی عوثمانیەکان و عامەی موسڵمانان ، هەروەها بەختەوەریی و ئاڵای یەکێتییان ـ لە لایەکەوە ـ لەسەر گوێ رایەڵیی ئێوە وەستاوە

پاشان ئێوە داوای شەریعەت ئەکەن، کەچیی ئێوە بەم یاخیی بوونەتان پێچەوانەی شەریعەت ئەجووڵێنەوە [٦٧]

جا بۆ ئەوەی حەقیقەتی ئەم رووداوە بە جوانیی دەر بکەوێت ، پێویستە ئەم حەوت خاڵە بەرچاو بگرین :

١ ـ لە ٩٠٪ صەدا نەوەدی ئەم راپەرینە دژی ( إتحاد و ترقي ) و دژی ستەم و ئیستیبدادیان بوو .

٢ ـ مەبەست لەم راپەرینە لابردنی ئەو وەزیرانە بوو لە نێو حیزبەکاندا وت و وێژیان لە سەر ئەکرا

---

[٦٦] سيرة ذاتية : ١٠٣ ـ ١٠٤

[٦٧] صيقل الإسلام ـ الحكمة العسكرية : ٤٤٨ .

٣ ـ رزگارکردنی سولّتان عەبدولحەمیدی ستەم لێکراو ، تا لە خیلافەت دانەماڵرێ .

٤ ـ قەدەغەکردن و لابردنی ئەو بریار و ئاگادارییانەی کە لەگەڵ رەوشتی سەربازیی و رەوشتی دینیدا ناگونجێن .

٥ ـ بکوژی بەرێز ( حسن فهمي ) [٦٨] بدۆزرێتەوە ، ئەویش دوای ئەوەی، کە باسی کوشتنەکەی گەورە کرا

٦ ـ باسی ئەفسەرەکانی ئالایلیی ،[٦٩] کە لە خزمەتی سەربازیی دەرکرابوون، چارەسەر بکرێت و مافیان پێ شێل نەکرێت .

٧ ـ سنوورێك بۆ سەربەستیی دابنرێت ، ئەویش بە ئەحکام و رەوشتە شەرعییەکان ، تا کاری نابەجێ بە ناوی سەربەستییەوە ئەنجام نەدرێن، پاشان حەددە شەرعییەکان بە جوانیی جێبەجێ بکرێن .[٧٠]

مامۆستا نوورسیی رۆژی جومعە لەگەڵ چەند زانایەکی تردا ئەچن بۆ لای ئەو سەربازانەی کە لە وەزارەتی جەنگدا یاخیی بووبوون . ئەوەبوو بە چەند وتاری کاریگەر توانیی هەشت فەوج بهێنێتەوە سەر رێی گوێرایەڵیی، ئەمەش نموونەیەکە لە وتارەکانی :

ئەی سەربازە خواناسەکان ! شەرەف و کەرامەت و بەختەوەریی و هێمای یەك بوونی سیی ملێون عوثمانیی و ، سێ صەد ملیۆن موسڵمان ـ لە لایەکەوە ـ

[٦٨] حسەن فەهمیی : رۆژنامەنووسێکی نەیاری کۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) بووە و ، لەسەر پردی ( غلطه ) بە دەستی ئەوان کوژراوە، جا کوشتنەکەی بووە هۆی رق هەڵسانی میللەت لەو کۆمەڵەیە.

[٦٩] بریتیی بوون لەو ئەفسەرانەی، کە لە پلەی سەربازییەوە بەرز بووبوونەوە ، واتە لە دەرچووانی کۆلێژی جەنگ نەبوون ..

[٧٠] صيقل الإسلام ـ الحكمة العسكرية : ٤٤٥

بەستراوە بە گوێڕایەڵیی ئێوەوە، ئەگەر ئەفسەرەکان بە تاوانێك ستەم لە خۆیان بکەن ، ئەوا ئێوە بەم یاخیی بوونەتان ستەم لە سێ صەد ملیۆن موسڵمان ئەکەن ، چونکە بەم یاخیی بوونەتان برایەتیی ئیسلامیی لەناو ئەبەن .

چاك بزانن ! دەوری سەرباز یەکجار مەزنە ، چونکە ئەو لە کارگە ئەچێت ، جا ئەگەر پێچکەیەکی ئەو کارگەیە لە کار کەوت ئەوا هەموو کارگەکە لە کار ئەکەوێت .. سەربازیش نابێ دەست لە کاری سیاسەت وەر بدەن ، ئینکیشارییەکان [٧١] چاکترین شاهێدن لەسەر ئەمە .. ئێوە داوای شەریعەت ئەکەن ، بەڵاّم لە راستییدا ئێوە پێچەوانەی ئەجووڵێنەوە و چەپەڵیشی ئەکەن. [٧٢]

---

[٧١] ئینکیشاریی : یاسایەکی سەربازیی پیادە بووە، لە دەوڵەتی عوثمانیی دا، کە سوڵتان ئۆرخان دای مەزراندووە، لە سەرەتاوە خزمەتی چاکی پێشکەش بە دەوڵەت کردووە ، سوڵتان مەحموودی دووهەم هەڵی وەشاندەوە و لە جێگەیدا یاسایەکی سەربازیی نوێی دامەزراند..( سيرة ذاتية : ١٠٦ ) .

[٧٢] صيقل الإسلام / الحكمة العسكرية : ٤٤٩

## شەشەم : بۆ دادگای سەربازیی

مامۆستا نوورسییش یەکێك بوو، لەوانەی کە درا بەو دادگا سەربازییەی، کە خۆرشید پاشای دڵڕەق سەرۆکی بوو .. [٧٣] ئەم دادگایە هەلێکی چاك بوو بۆ ( إتحاد ) یەکان ، تا بە بیانووی بەشدارییکردنی رووداوەکە ، یان کۆمەکییکردنی ئەوانەی، کە رووداوەکەیان بەرپا کرد ، خۆیان لە دوژمنەکانیان رزگار بکەن، شایانی باسە، کە ( إتحاد ) یەکان ئەم رووداوەیان کردە بیانوو بۆ لەکارخستنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم ، هەرچەندە ئەو هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەو باسەوە نەبوو، لە هەمان کاتدا سوڵتان ئەوەندە خۆی بە پاك ئەزانیی داوای کرد لیژنەی لێکۆڵینەوە پێك بهێنن تا دەربکەوێت کێ تاوانبارە ، کەچیی ( إتحاد ) یەکان نەیانوێرا ئەو لیژنەیە پێك بهێنن ، نەوەکو سوڵتان بە پاك و بێ تاوان دەربچێت . [٧٤]

---

[٧٣] مامۆستا لەگەڵ پیرەمێردی شاعیردا بەند ئەکرێن و شەوێکیان خەو بە کاك ئەحمەدی شێخەوە ئەبینێت و مژدەی رزگاربوونیان ئەداتێ، مامۆستاش خەوەکە بۆ پیرەمێرد ئەگێڕێتەوە و ، دوای ماوەیەك ئازاد ئەکرێن و ، بەو بۆنەوە پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە دیوانەکەیدا ل ١١٢ تۆمار کردووە :

کاك ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا — زۆر کەس بە سایەی تۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ — هەر تۆی سەربەرزیی قەومەکەت ئەوێ
کە لە زیندانیان تێك خزاندبووین — سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین
تۆ چووبوویتە لای بدیع الزمان — مژدەت دابوویە بە ژیان وەمان
فەرمووبووت ئێوە نامرن ئەمێنن — تا سەر ئازادیی گەلتان ئەبینن
خۆ من باوەڕم بەوە کردووە — بە وەسیەت ناوی ئەوەم بردووە
بەڵام وا ئەمرم بەو ئاواتەوە — بشمرم گۆڕم دەنگ ئەداتەوە

[٧٤] رجل القدر : ٤٦

جا هەرچەندە ( بدیع الزمان ) هیچ پەیوەندییەکی بەو رووداوەوە نەبوو ، بگرە بە پێچەوانەوە ، ئەو ئامۆژگاریی سەربازەکانی کرد تا ڕێز لە فەرمانی ئەفسەرەکانیان بگرن و ، پارێزگاریی لە هێمنیی و ئاسایش بکەن ،[٧٥] بەلاّم کۆمەڵەی ( إتحاد ) ئەو بابەتە توند و تیژانەیان لە یاد نەچوو بوون، کە مامۆستا لە رۆژنامەی ( وولقان ) دا دژی ئەوان بڵاوی ئەکردنەوە، لە هەمان کاتدا ( إتحاد ) یەکان کۆمەڵەی ( إتحاد محمدي ) یان هەڵ وەشاندەوە

کاتێك، کە ( بدیع الزمان ) برا بۆ دادگا ، زیاتر لە دە تەرمی لە سێدارە دراوەکان بە سێدارەکانەوە ، لە حەوشەی دادگای سەربازییدا هەڵواسرابوون ..

مامۆستا نوورسیی لە سەرخۆ و بە دامەزراوییەوە چووە هۆڵی دادگاوە تا بەرامبەر بە دەستەی دادگای سەربازیی بوەستێ، کە بە سەرۆکایەتیی ( خورشید پاشا ) پێك هێنرا بوو، کە گەیشتە بەرەوە خورشید پاشا بە توورەیی و گاڵتەپێ کردنەوە پرسیی :

تۆیش داوای ( شەریعەت ) ئەکەیت ؟ سەیرکە ! هەرکەس داوای بکات ، ئاوەها لە سێدارە ئەدرێت. ( بە دەستیشی ئاماژەی بۆ تەرمی لە سێدارە دراوەکان کرد، کە لە پەنجەرەی دادگاوە دیار بوون ) .

دوای ئەم هەرەشەیە مامۆستا بە پێوە وەستا و ، لەبەردەم دادگادا بەرگرییەکی ئازایانەی قەشەنگی پێشکەش کرد، کە ئەمە هەندێکیەتی :

---

[٧٥] ئەو وتارەی لە رۆژنامەی ( دینیی ) دا، کە لە ئەستەنبووڵ دەرئەچوو ، ژمارە ( ١٠٧ ) ی رۆژی ١٧نیسانی ١٩٠٩ بلاّو کراوەتەوە ( رجل القدر : ٥٧ )

من داواكاری شەريعەتم ، لەبەر ئەوە هەموو شتێك بە ترازووی شەريعەت كێشانە ئەكەم، ئيسلاميش بە تەنيا ئوممەتی منە ، لەبەر ئەوەش هەموو شتێك بە تێروانينی ئيسلام هەڵ ئەسەنگێنم و سەيری ئەكەم .

لە كاتێكيش‌دا، كە من لەسەر لێواری جيهانی بەرزەخدا، كە پێی ئەڵێن ( بەنديخانە ) وەستاوم و ، لە وێستگەی لە سێدارەدان‌دا چاوەڕوانی ئەو شەمەندەفەرەم، كە بەرەو قيامەت هەڵم ئەگرێت ، ئەو بارودۆخە پڕ لە زوڵم و غەدرانە، كە لە كۆمەڵگای مرۆڤ دا ڕوو ئەدەن ، تاوان بار ئەكەم و ڕەخنەيان لێ ئەگرم، جا ڕووی وتارم بە تەنها لە ئێوە نيە ، بەڵكو بەرەو ڕووی هەموو ئادەميزادی ئەم چەرخەی ئاراستە ئەكەم ....

من بەوپەڕی تاسەمەنديەوە ئامادەی ڕۆيشتنم بۆ ئاخيرەت و ، ئامادەم لەگەڵ ئەو لە سێدارە دراوانەدا بچم بۆ ئەوێ، بەم نموونەيەش ئەوە بێننە بەرچاوتان، كە چەندە تاسەمەندم بۆی :

گوندنشينێك، كە شەيدای شتی سەير و سەمەرە بێت ، ئەگەر شتە سەير و سەمەرە و جوانەكانی ئەستەمبوڵی بەرگوێ كەوتبێ ، داخۆ ئەبێت چەندە تاسەمەنديی بينينيان بێت ؟

جا من ئێستا وەك ئەو گوندنشينە شەيدای ئەو قيامەتەم، كە پێشەنگای شتە سەير و سەمەرەكانە .

لەبەر ئەوە دوورخستنەوەم و نەفييكردنم بۆ ئەوێ بە سزادانم ناژمێررێت، بەڵام ئەگەر لە تواناتان‌دا بێ و ، لێتان بێت سزا و ئازارم بدەن ، ئەوا ئازاری وێژدانييم بدەن، ئيتر لەوە كەمتر نە سزايە و نە ئازار ، بەڵكو فەخر و شانازييە .

لە سەردەمی ئيستبداد دا ئەم حكومەتە دژايەتيی عەقڵ و ژيريی ئەكرد، بەڵام ئێستا دوژمنايەتيی لەگەڵ هەموو ژيان‌دا ئەكات .. جا ئەگەر ئەوە شێوە

و مەنطیقی حکومەت بێت، دەبا بژیی شێتیی و ، دە با بژیی مردن و، دەبا بژیی دۆزەخی ماوا و مەنزڵی زاڵمانیش .

هیوادار بووم شوێنێکم بۆ ئامادە ببێت تا بیر و بۆچوونەکانمی تێدا دەر بخەم ، ئا ئەوەتا ئەم دادگا عورفییە بووە شوێنێکی چاك تا بیرو بۆچوونەکانمی لێوە پەخش بکەم .

لە ڕۆژانی سەرەتای لێکۆڵینەوەدا ، وەك لە کەسانی تریان پرسیی ، لە منیشیان پرسیی :

تۆیش داوای شەریعەتت ئەکرد؟!

منیش وتم : ئەگەر هەزار ڕۆحم ببوایە ، ئامادە بووم هەر هەموویان لە پێناوی حەقیقەتێك لە حەقیقەتەکانی شەریعەتدا بەخت بکەم .. چونکە شەریعەت هۆی بەختەوەرییە و ، عەداڵەتی پاڵفتەیە و ، ڕەوشت بەرزییشە .. ئەڵێم : شەریعەتی ڕاستەقینە ، نەك ئەوەی، کە یاخییبوان داوای ئەکەن .[٧٦]

ئەم بەرگرییەی مامۆستا دوو جار چاپ کرا .. لە کاتێك‌دا، کە چاوەڕوان ئەکرا ئەو دادگا ناهەموارە حوکمی ئیعدام دەر بکات ، کەچیی حوکمی بێ تاوانیی بۆ مامۆستا دەرکرد ، مامۆستاش لە بریی سوپاس کردنی دادگا بۆ ئەو بڕیارەی ، لە ناوچەی بایەزیدەوە ، کە دادگای لێبوو ، بەرەو ناوچەی سوڵتان ئەحمد کەوتە ڕێ و، خەڵکێکی زۆریش بە دوایەوە بوون، و بە دەنگی بەرز ئەیان وت : با دۆزەخ بۆ زاڵمان بژیت ، با دۆزەخ بۆ زاڵمان بژیت .[٧٧]

---

[٧٦] سيرة ذاتية : ١٠٨ ، رجل القدر : ٤٧ ـ ٤٨

[٧٧] سيرة ذاتية : ١٠٩

مامۆستا نوورسیی پێی خۆش بووە، هیچ شتێك نەبێتە بەربەستی سەربەستیی لە ژیانیدا ، بۆیە پێی خۆش نەبوو هیچ یاسایەك سنووری بۆ دابنێ ، مـادام لـە شەریعەت وەرنەگیرابێ .

ژیانی مامۆستا لەو ماوەیە لە ئەستەنبوڵدا تا رادەیەك ژیانێکی سیاسـییانە بوو ، بەو نیازەی، کە لە رێگەی سیاسەتەوە خزمەت بە دین بکات، ئەوەبوو، کە بانگی ئازادیی بەرز کرایەوە ، ئەویش پشتیوانیی لێکرد و ، بە توندییش دژی زوڵم و لادانی کۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) وەستا و ، روو بە روو ئاگاداری ئەکردن، کە ئەو کارەی ئەوان دەست درێژییە بۆ سەر دین و ، دژایەتیی غیرەتی خوایە و، پشت هەڵکردنە لە شەریعەت ، کەواتە سەرەنجامێکی ناهەمواری ئەبێت !

دوای ئیعلانی دەستووریش مامۆستا پشـتگیریـی لـە کۆمەڵـەی ( الإتـحاد الـمحمدي ) کرد، شایانی باسە، کە ئەو کۆمەڵەیە لە ماوەیەکی کەم دا پـەرەی سەند، دوای بلاوکردنەوەی وتەیەکی مامۆستا ( بـدیع الزمـان ) ، پـەنجا هـەزار ئەندام پاڵیان پێوە دا

مامۆستا لە رۆژنامەکاندا و بە وتاردان مانا و مەبەستی راستەقینەی ئازادیی بۆ موسڵمانان روون ئەکردەوە ، تا خراپ تێ نەگەن و ، پێویستە ئەو ئازادییە لە سنووری شەرعدا بێت ئەگینا ئیستیبداد هەر بەردەوام ئەبێت ..[٧٨]

[٧٨] سيرة ذاتية : ١١٠ ـ ١١١

### حەوتەم : گەڕانەوە بۆ وان

مامۆستا نوورسیی لە ئەستەنبوڵ زۆر نەمایەوە ، بەڵکو لە ساڵی ١٣٢٨ ك بەرامبەر بە ١٩١٠ ز دا لە ڕێی ( باطوم ) ەوە بەرەو وان گەڕایەوە .. لە ڕێگادا بەلای شاری ( تفلیس ) دا تێ پەڕیی و ، لەوێ سەرکەوتە سەر گردی ( شێخ صنعان ) و لەو کاتەدا وت و وێژێك لەگەڵ پۆلیسێکی ڕووسییدا ئەنجام ئەدات . مامۆستا خۆی ئەوەمان بۆ ئەگێڕێتەوە :

دە ساڵ لەمەوبەر چووم بۆ ( تفلیس ) و سەرکەوتمە سەر گردی ( شێخ صنعان ) . لەوێ سەرنجی ئەو ناوەم ئەدا و ، لێی ورد ئەبوومەوە . یەکێك لە پیاوانی پۆلیس لێم نزیك کەوتەوە و وتی :

- لە چیی ورد ئەبیتەوە ؟

+ نەخشەی قوتابخانەکەم ئەکێشم

- تۆ خەڵکی کوێیت ؟

+ خەڵکی بەدلیسم .

- خۆ ئێرە تەفلیسە !

+ بەدلیس و تەفلیس بران .

- مەبەستت چییە ؟

+ سێ نووری یەك لە دوای یەك لە ئاسیا ، لە جیهانی ئیسلامییدا ، سەریان هەڵداوە و ، لە لای ئێوەش سێ تاریکیی یەك لەسەر یەك سەر هەڵ ئەدەن و ، ئەم پەردە زاڵمانەیەش ئەدرێت و دێتەوە یەك و ، ئەو کاتەش دێم بۆ ئێرە و قوتابخانەکەم دائەمەزرێنم .

- ئەی هوو ! لە هیوای زۆرت سەرسامم !!

+ منیش لە عەقڵی تۆ سەرسامم ! ئایا ئەگونجێ وەها بزانی، کە ئەم زستانە نابڕێتەوە ؟ هەموو زستانێك بەهارێك و ، هەموو شەوێکیش ڕۆژێکی لە دوایە !

ـ موسڵمانەکان بەم لاو بەولادا بلاّوەیان کردووە

+ رۆیشتوون بۆ وەرگرتنی زانست، ئا ئەوەتا کاکی هیندیی، کە کوری لێهاتووی ئیسلامە لە دواناوەندیی ئینگلیزدا ئەخوێنێت .

ئا ئەوەتا کاکی میصرییش، کە کوری زیرەکی ئیسلامە لە قوتابخانەی کارگێریی سیاسیی ئینگلیزدا دەرس ئەخوێنیٚ ..

ئا ئەوەتا کاکی قەفقاسیی و تورکوستانییش، کە دوو کوری پاڵەوانی ئیسلامن لە قوتابخانەی جەنگیی رووس‌دا خەریکی راهێنانن .. هتد .

جا کابرا ! ئەو کورە چاك و بەرێزانە ، دوای وەرگرتنی بروانامەکەیان ، هەر یەکەیان کاروباری کیشوەرێك لە کیشوەرەکان ئەگرێتە ئەستۆ و ، ئالاّی باوکی دادپەروەریان ، واتە ئیسلامی مەزن ، بەرز ئەکەنەوە تا لە بەرزاییەکانی کەمالاّت دا بشەکێتەوە ، تا نهێنیی حیکمەتی ئەزەلیی، کە بۆ نەوەی ئادەم بریار دراوە ، لە بەرامبەر هەموو کۆسپێك‌دا ، ئاشکرا بکات .[٧٩]

مامۆستا نوورسیی، کە لە ساڵی ١٩١٠ دا گەیشتەوە وان دەستی دایە دەرسە کۆمەلاّیەتیی و موحازەرە زانستیەکانی و ، لە نێوان عەشرەتەکانیش‌دا هات و چۆی ئەکرد تا لە رێی پرسیار و وەلاّمەوە ریٚ نماییان بکات، ئەوەبوو لەو پرسیار و وەلاّمانە کتێبی ( مناظرات ) بە زمانی تورکیی دەرچوو، پاشان وەری گێرایە سەر زمانی عەرەبیی و ناوی نا ( رجتة العوام )، شایانی باسە، کە ( مناظرات ) لە ساڵی ١٩١٣ دا و لە ئەستەنبوڵ چاپ کرا و ، چەند جارێکیش چاپ کردنەوەکەی دووبارە کرایەوە .[٨٠]

---

[٧٩] سيرة ذاتية : ١١١ ـ ١١٢ ، نقلاً عن صيقل الإسلام ـ الساعات : ٣٧١

[٨٠] سيرة ذاتية : ١١٣ ، رجل القدر : ٥٠

## هەشتەم : سەردانی شام

لە زستانی ١٩١١ ز ـ ١٣٢٧ ك مامۆستا سەردانی ولاتی شامی کرد، کە ئەوەبوو خوشکەکەی و زاواکەی لەوێ بوون، لە دیمەشق و لە مزگەوتی ئومەوییدا، لەسەر داوای زانایان و کۆڵ نەدانیان ، مامۆستا بە زمانی عەرەبیی وتارێکی قەشەنگی پێشکەش کرد، کە ئەوەبوو خەڵکێکی یەکجار زۆر، کە ئەگەیشتە (١٠,٠٠٠)دە هەزار کەس و نزیکەی(١٠٠) صەد زانای پایەداریش لە ناویاندا بوون، ئەم وتارەی کرا بە نامیلکەیەك و لەژێر ناونیشانی ( الخطبة الشامية ) دا ، لە حەفتەیەكدا دوو جار چاپ کرا .. مامۆستا لە ساڵی ١٩٥١ دا بەم وتارەدا چوویەوە و ، دوای بژارکردنی و زیادکردنی هەندێ پەراوێز و برگە ، بە زمانی تورکیی دای رشتەوە

لەم وتارەدا مامۆستا شەش نەخۆشیی گرنگی دەست نیشان کرد، کە بوونەتە هۆی دواکەوتنی موسڵمانان، کە ئەمانەن :

١ ـ ورەبەردان و دەست لە خۆ شۆردن .

٢ ـ نەمانی راستگۆیی لە ژیانی کۆمەلایەتیی و سیاسییدا

٣ ـ خۆش‌ویستنی دوژمنایەتیی .

٤ ـ بێ ئاگایی لەو پەیوەندییە نوورانییانەی، کە ئیمانداران بە یەکەوە ئەبەستن .

٥ ـ پەرەسەندنی ئیستیبداد و پەرەسەندنی نەخۆشیی جۆراو جۆر .

٦ ـ بەرچاوگرتنی کەڵکی خۆیی بە تەنیا

پاشان دەستی دایە نواندنی دەرمان بۆ هەر یەکە لەو نەخۆشییانە، کە دیارە ئەو دەرمانانەی لە دەرمانخانەی قورئانی حەکیم هەڵ گۆزیوە و ئەبنە مایەی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە سەختانە [81]

---

[81] سيرة ذاتية : ١١٥ ـ ١١٦ ، رجل القدر : ٥٠ ـ ٥١

## نۆهەم : بۆ ئەستەنبوڵ و هاوڕێیەتیی سوڵتان

دوای تەواوکردنی گەشتەکەی شامی، مامۆستا بدیع الزمان لە ڕێی بەیرووت ئەزمیرەوە گەڕایەوە ئەستەنبوڵ، هەرکە گەیشت ئاواتەکەی جارانی هاتەوە یاد و دەستی دایە پەیوەندیکردن بە لایەنە بەرپرسەکان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئاواتە پیرۆزەی، کە بریتیی بوو، لە دامەزراندنی زانکۆی زەهرا تا زانستە شەرعییەکان و زانستە نوێکان پێکەوە شان بە شانی یەك بخوێنرێن، چونکە پێشکەوتنی موسڵمانان بەستراوە بە شارەزاییەکی چاکی دین و ، دەست خستنی زانستە نوێکان .

لە سەرەتای سەردەمی سەربەستییدا سوڵتان ڕەشادی برای سوڵتان عەبدولحەمید گەشتێکی بەرەو ڕۆم ئەیلیی دەست پێ کرد و ، مامۆستا نوورسییش بە نوێنەریی پارێزگاکانی کوردستان کەوتە گەڵی [٨٢] لەو گەشتەدا دای بە گوێی سوڵتانیش و بە گوێی ئەو ( إتحاد ) یانەدا کە لەگەڵ سوڵتان هاتبوون، کە :

خۆرهەڵات پێویستییەکی زۆری بە زانکۆیەك لەو جۆرە هەیە ، چونکە کەوتۆتە ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامییەوە، سوڵتانیش بەڵێنی چاکی دایە، بەڵام ئەوەبوو جەنگی نێوان دەوڵەتی عوثمانیی و بولقان ڕووی دا و ، ئەو شوێنەی، کە بۆ زانکۆ دیاریی کرا بوو داگیر کرا ، ئیتر مامۆستا داوای کرد ئەو پارەیەی، کە بۆ ئەو کارە تەرخان کراوە ئاراستەی دامەزراندنی زانکۆیەك لە خۆرهەڵات بکرێت .. ئەمە ڕەزامەندیی لەسەر نووسرا و ، سوڵتان ڕەشاد نۆزدە هەزار لیرەی زێری بۆ

---

[٨٢] ئەم گەشتە لە حەوتەم ڕۆژی حوزەیران دەستی پێ کرد و تا ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩١١ ی خایاند .

دامەزراندنی ئەو زانکۆیە بەخشیی و ، لـە ناوچـەی ئیرتمیـت ، لەسـەر کـەناری دەریاچەی وان بناغەی دارێژرا ، بەلاّم هـەلّ گیرسـانی جـەنگی جیهـانیی یەکـەم نەیهێشت پرۆژەکە سەربگرێ ، بەلّکو تەفرەی کەوت . [٨٣]

[٨٣] الملاحق – قسطموني : ١٢٦

## دەهەم : کتێبی ( تعلیقات )

لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەم و لە ساڵی ١٣٢٩ ك دا مامۆستا سەعید پەراوێزی لەسەر کتێبی ( برهان گلنبوي ) نووسیی و ، خۆشەویست ترین قوتابیی، کە لە هەموو قوتابیەکان زیاتر پابەندی دەرس بوو، و ناوی مەلا حەبیب [٨٤] بوو نووسییەوە، دوای ئەوە جەنگی جیهانیی یەکەم هەڵ گیرسا و ، مامۆستا نوورسیی و مەلا حەبیب پێکەوە لە شێوەی ئامۆژگاردا ، لەگەڵ فیرقەی ( وان ) ڕۆیشتن بۆ بەرەی جەنگ لە ( أرضروم )، دوای ساڵێك، کە گەرانەوە دیتیان وا شاری وان لەلایەن ئەرمەنەکانەوە داگیر کراوە ، ناچار کشانەوە بۆ فەرمانداریی ( گواش ) و ، لەوێ مەلا حەبیب شەهید کرا و ، مەلا عەبدولەجیدی برای مامۆستا نوورسییش ، ساڵەهای ساڵ ، ئەو نامەیەی کە مەلا حەبیب نووسیی بووی لەم شار بۆ ئەو شار و ، لەم شارۆچکەش بۆ یەکێکی تر بردی هەتا ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٤٠دا لە شاری ( ملاطیە ) گیرسانەوە و ، لەوێ لە فەرمانداریی ( اورگوب ) بووە موفتیی

پەیامی ( تعلیقات ) بریتیی بوو لە پارچە کاغەز و مامۆستا عەبدولەجید کۆی کردنەوە و تەجلیدی کردن ، بەو هیوایەی زەمانەیەك بێتە بەرەوە، کە سەر لە نوێ زانست و دین ڕۆژیان لێ بێتەوە و ، کەسانێکیش بێنە مەیدانەوە و، هاو

---

[٨٤] مەلا حەبیب : قوتابیی مامۆستا نوورسیی بووە و ، نووسەری تایبەتیشی بووە ، کتێبی ( إشارات الإعجاز ) و پاشانیش ( تعلیقات ) و دانراوەکانی تری مامۆستای نووسییەوە و ، بە درێژایی تەمەنی لە خزمەتیا بوو ، هەتا ئەوەبوو لە جەنگی جیهانیی یەکەم دا شەهید بوو .

وێنەی ئەم پەیامانە بخوێننەوە ، ئەو کاتە نرخیان ئەزانرێ و ، ئەشزانرێ چ بیرێکی قووڵ و زیرەکییەکی بە برشتیان تێدایە، بەلاّم ئەی هـوو .. نـە ئـەو زەمانەیـە دێتەوە و ، نە ئەو خوێنەرانەش دێنـەوە مەیـدان ، وەك مامۆسـتا عەبدلمەجیـد ئەڵێت .[٨٥]

[٨٥] سیرة ذاتیة : ١١٨

## پانزەهەم : ڕووداوی بەدلیس و ئەرمەن

ڕووداوی بەدلیس بریتییە لە یاخیی بوونی ئەو عەشرەتانەی، کە لە دەوروبەری شاری بەدلیس‌دا ئەژیان ، ئەمەش لە حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣ دا و ، بە سەرۆکایەتیی شێخ سەلیم ، بە بۆنەی بێزاربوونیانەوە لە هەڵس‌وکەوتی ناشەرعیی هەندێ لە ئەفسەرەکانی سوپا، ئەوەبوو یاخیی بوونی خۆیانیان بریار دا و شاری بەدلیسیان بۆ ماوەی حەفتەیەك داگیر کرد .. خەریك بوو عەشرەتەکانی ( بیت الشباب ) یش بەشداریی ئەو یاخیی بوونە بکەن ، بەڵام مامۆستا نوورسیی بە پەلە خۆی گەیاندە لایان و ، هێوری کردنەوە و ، لە یاخیی بوون دووری خستنەوە ( سەیری کتێبی المثنوي العربي النوري بکە )

جا هەندێك لە پیاوە دیندار و خاوەن تەقواکانی ئەو عەشرەتانەی، کە یاخیی بوون دێنە شاری وان بۆ خزمەتی مامۆستا و ئاگاداری ئەکەن، کە هەندێ لە فەرماندەکانی سوپا کاری دژ بە دین ئەنجام ئەدەن و ، ئەمانیش ئەیانەوێ یاخیی بوون ئەنجام بدەن لە دژیان و ، داواشیان لێ کرد ئەویش بەشداریی بکات لە گەڵیان، مامۆستاش بە حەکیمانە وەڵامیان ئەداتەوە :

ئەو کارە بێ دینییانە و ، ئەو خراپکارییانە هی وێنەی ئەو فەرماندانەیە و ، نابێت بخرێنە ئەستۆی سوپاوە، ئا لەم سوپا عوثمانییەدا لەوانەیە

(١٠٠,٠٠٠)صەد هەزار ئەولیای خوا هەبن ، بۆیە من ناتوانم شمشێر لە رووی ئەو سوپایەدا هەڵ بکێشم ، لەبەر ئەوە ناتوانم بەشدارییتان لەگەڵدا بکەم .[٨٦]

کە مامۆستا پشتیان ناگرێ بەجێی ئەهێڵن و ، دەست ئەدەنە چەکەکانیان و ، سەرەنجام رووداوی بەدلیس روو ئەدات بێ ئەوەی ئەنجامێکی بووبێ، دوای ماوەیەکی کەم جەنگی جیهانیی یەکەم هەڵ گیرسا و ، سوپای دەوڵەتی عوثمانییش لە ژێر ئالاّی دین دا ، چووە مەیدانی جیهاد و ، صەدان هەزار شەهیدی بە پلەی ئەولیا گەیشتن و ، بە خوێنە گەشەکەیان بروانامەی ویلایەتیان مۆر کرد [٨٧]

دەربارەی رووداوی ئەرمەنیش ، مامۆستا سەعیدی کۆن لەگەڵ قوتابیەکانی دا پەیوەندییەکی یەکجار پتەویان هەبوو ، بە رادەی گیان فیداکردن و قوربانیی دان . بۆیە مامۆستا زۆر بە چاکیی ئەی توانیی پەرچی چەکدارە فیداکارەکانی ئەرمەن و طاشناق بداتەوە و لە سنووری خۆیان بیان وەستێنێ .. کە ئەوەبوو لە دەوروبەری وان و بەدلیس دا چالاکییان ئەنواند و ، هەوڵیان ئەدا دەست بۆ موسڵمانەکان درێژ بکەن .

دوای ماوەیەك تفەنگی ماوزەر پەیدا بوو و ، قوتابیەکانی مامۆستاش ئەو تفەنگەیان دەستی خۆیان خست و ، قوتابخانەکەیان کردە سەربازگە و ، کتێب و تفەنگ تێکەڵ بوو بوون، جارێکیان فەرماندەیەکی سەربازیی بە پلەی فەریق هات و ئەو دیمەنەی قوتابخانەکەی دیی و ، وتی : ئەمە قوتابخانەی دینیی نیە ، بەڵکو بنکەیەکی سەربازییە فەرمانیشی دا تفەنگەکان کۆ بکرێنەوە ، چونکە ترسی هەبوو وەك رووداوی بەدلیس یاخیی بوون، دروست ببێ . ئەوەبوو پانزە تفەنگیان

[٨٦] بۆ وەلاّم دانەوەی سەرۆك عەشرەتی تریش، کە ویستوویانە دژی موصطەفا کەمال شۆرش بەرپا بکەن ، مامۆستا هەمان رای بووە و ، زانیویە جگە لە رژانی خوێنی موسڵمانان کاری لەو جۆرە هیچ بەرهەمێکی نیە .

[٨٧] الشعاعات : ٤٢١

لە قوتابییەکانی مامۆستا سەند و ، دوای دوو مانگ جەنگی جیهانیی یەکەم هەڵ گیرسا و ، مامۆستاش چوو تفەنگەکانی وەرگرتنەوە

جا چەکدارە ئەرمەنییەکان هەرچەندە در بوون نەیان ئەوێرا خۆیان لە قەرەی قوتابیەکانی مامۆستا بدەن ، هەتا ئەو کاتەش، کە مامۆستا و قوتابیەکانی چووبوونە سەر چیای ئەرەك، خەڵك سەریان لەمە سور ئەما و پرسیاریان لە هۆیەکەی ئەکرد و ، مامۆستایش بۆی روون ئەکردنەوە، کە پاڵەوانێتیی ئەرمەن بۆ دەست خستنی ژیانێکی دنیایی فانیی و ، دەست خستنی بەرژەوەندیەکی نەتەوەیی کاتیی و بچووکە و ، پارێزگاریی لە سەلامەتیی خۆیان ئەکەن، بەلاّم قوتابیەکانی مامۆستا بۆ ژیانی نەمر و هەتا هەتایی هەوڵ ئەدەن و ، لە پێناوی دەست خستنی بەرژەوەندیە ئیجابیەکانی ئومەتی ئیسلامی مەزن و پایەداردایە و ، لاشیان یەقینە، کە ئەجەل پێش و پاشی بۆ نیە ، لە بەر ئەمانە قوتابیەکانی مامۆستا سڵ لە ئەرمەن ناکەنەوە و ، ئامادەن ئەم ژیانە کورتەی دنیایان بکەنە قوربانیی بۆ دەست خستنی ژیانی هەتا هەتایی قیامەت و ، بۆ پاراستنی سەلامەتیی چەندین ملیار ئیمانداری خاوەن تەقوا ...[88]

[88] الشعاعات : ٥٦٨

## دوانزەهەم : ئیعجازی قورئان لە خەویکی راستدا

مامۆستا بۆمان ئەگێڕێتەوە :

پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم و ، لە کاتی هەڵگیرسانیشیدا ، لە خەوێکی راستدا ئەمەم دیی :

ئەبینم وام لە بن چیای ( ئارارات ) دا و هەر ئەوەندەم زانیی چیاکە بە شێوەیەکی ناهەموار تەقییەوە و ، تاشەبەردی گەورە گەورەی بە وێنەی چیاکانی بۆ هەموو لایەکی زەویی ئەهاویشت، منیش، کە ترس و لەرز دایگرتبوومەوە ، ئەبینم وا دایکم ـ رەحمەتی خوای لیٚ بێت ـ لە نزیکمایە .. پێم وت : ( دایە گیان ! نەترسیت ! فەرمانی خوایە ... ئەویش میهرەبان و دانایە ) . کە من لەم حاڵەدا بووم ، پیاوێکی مەزنم لیٚ پەیدا بوو، و فەرمانی بەسەردا دام و وتی :

ـ ئیعجازی قورئان روون بکەرەوە

لە خەوەکە بێدار بوومەوە و تێگەیشتم، کە تەقینەوەیەکی گەورە روو ئەدات و، لە ئەنجامی ئەم تەقینەوە و ئاڵ و گۆڕە گەورەیەشەوە ئەو شوورایانە ئەرووخێن، کە دەوری قورئانی پیرۆزیان گرتووەوە و ، قورئان هێرشی ئەکرێتە سەر و ، ئەو کاتەش بەرگریی لە خۆی ئەکات و ، قەڵای مەحکەم و پۆڵایینیشی ئیعجازەکەی ئەبێت و، یەکێکی وەك منیش ، بۆ روونکردنەوەی جۆرێکی ئەو ئیعجازە، لەم زەمانەدا، کە زۆر لە سەرووی توانا و لێهاتنمەوە بێت ، دەست نیشان ئەکرێت، ئیتر تێ گەیشتم، کە من بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە دەستنیشان کراوم . [٨٩]

---

[٨٩] المكتوبات : ٤٧٥

مامۆستا عەبدولمەجیدی برای مامۆستا نوورسییش لە بیرەوەریەکانیدا باسی کردووە، کە لە کاتێکدا لەسەر بانی قوتابخانەی خورخور لە وان مامۆستا دەرسی تەفسیری پێ وتوون ، کەمێك پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم ئێوارەیەکیان خۆر بە تەواویی ئەگیرێت ، مامۆستا نوورسییش هەناسەیەکی قووڵ هەڵ ئەکێشێت و ئەڵێت : داخی بە جەرگم ، لافاوێکی قورس دێت و هەموومان را ئەماڵێ، هەروا دەرئەچێت دوای مانگێك جەنگ هەڵ ئەگیرسێت و ، بە ماوەیەکی کەم هەموو وڵات ئەگرێتەوە [٩٠]

[٩٠] ب / ٢٢٧ عن مذكرات عبدالمجيد : ١٧

# فـەرزی جیـهـاد

## ١٩١٦ ز ـ ١٣٣٤ ك

### *یەکەم : جەنگی جیهانیی یەکەم*

لە ساڵی ١٩١٤دا مامۆستا بـە شـێوەی ئامۆژگـار پەیوەنـدیی بـە سـوپای عوثـمانییەوە کرد و ، لە ساڵی ١٩١٥ شدا تیپی فیداکارانی ( أنصار ) ی پێك هێنا و ، بەرەو بەرەی جەنگی قەفقاس بردنی .

شایانی باسە، کە لە ٣١ / ١٠ / ١٩١٤ دا رووسەکان خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵیان داگیر کرد و ، لە ١٥ / ١ / ١٩١٥ ش دا گێررانەوە دوا ، دوای ئەوەی کە شەصت هەزار سەربازی عوثـمانیی شەهادەتیان وەرگرت، جـارێکی تـر و لـە ١٢ / ١ / ١٩١٦دا رووسەکان ، بە سێ ئەوەندەی سوپای عوثـمانییە وە ، بۆ داگیرکردنەوەی ناوچەکە هێرشیان هێنا و لە ١٦ / ٢ / ١٩١٦دا شاری ( أرضروم ) یان گرت ...

لە کاتی جـەنگـدا مامۆسـتا لەگـەڵ مـەلا حـەبیبی قوتابییـدا لـە بـەرەی پاسینلەرەوە بەرەو پێشـەوە و بـۆ سـەر رووسـەکان هەڵمـەتیان ئـەبرد .. تـۆپی رووسەکان لە هەر دەقیقەیەك یان دوو دەقیقەدا سێ گوللە تـۆپی بـە سـەریاندا ئەتەقاند، جارێکیان لە بەرزیی دوو مەترەوە سێ گوللە تـۆپ بەسـەریان دا تـێ پەریین و ، سەربازە موسڵمانەکان، کە لـە سـەنگەرەکەدا خۆیـان حەشـار دابـوو

پاشەکشەیان کرد ، کەچیی مامۆستا بۆ تاقیی کردنەوە رووی کردە مەلا حەبیب و وتی :

مەلا حەبیب ! ئەڵێی چیی ؟ لە گوللەتۆپی ئەو کافرانە خۆم حەشار نادەم . وتی : منیش وەهام، نە لێت دوا ئەکەم و نە لێیشت جیا ئەبمەوە دووهەم گوللە تۆپ لە نزیکیاندا دای بە زەوییدا ، مامۆستاش بە متمانەکردنەوە بە پارێزگاریی خوایی بۆیان بە مەلا حەبیبی وت : خێرا، کە با بۆ پێشەوە برۆین .. گوللە تۆپی کافران نامان کوژێت ، ئێمە هەرگیز بۆ هەلاتن و دواکەوتن سەر شۆر ناکەین ..

هەروەها مامۆستا لە بەرەی پێشەوەی جەنگی بەدلیسدا بەشداریی ئەکات و، سێ گوللەی رووسەکان شوێنی کوشندەی لاشەی ئەپێکن و ، یەکێکیشیان شەرواڵەکەی کون ئەکات و لە نێوان هەردوو قاچیدا تێپەر ئەبێت، لەو کاتەدا مامۆستا دارای حاڵەتێکی رۆحیی وەها بەرز بووە، بێزی نەهاتووە دابەزێتە ناو سەنگەرەوە ، تا ئەوەبوو فەرماندەی سوپا گوڵ عەلیی و والیی مەمدووح لە دواوە هاوار ئەکەن : یا با خێرا بکشێتە دواوە یان دابەزێتە ناو سەنگەرەکەوە ! کەچیی مامۆستا باکی نابێت و ، لەو تەمەنە کەمەیدا خۆی نەئەپاراست ، بەو هیوایەی شەهیدیی دەست بکەوێت .[٩١]

دوای ئەوەی، کە مامۆستا نوورسیی وەك فەرماندەی تیپەکانی ( ئەنصار ) ، لە بەرەی جەنگی قەفقاسدا ، بە چاك ترین شێوە فەرزی جیهادی بەجێ هێنا ، بە رادەیەك، کە ئەنوەر پاشای فەرماندەی گشتیی و فەرماندەکانی تیپەکانیش ئەوپەری ستایشیان کرد و بە چاوی رێزەوە سەیریان ئەکرد .. دوای ئەوە بەرەو شاری وان کشایەوە چونکە سوپای رووسیی رووی لەو شارە نابوو .

---

[٩١] سيرة ذاتية : ١٢٣ ، رجل القدر : ٦٣ ـ ٦٤

پێش هەموو شتێك هەوڵیان دا شارەكە لە ژن و منداڵ چۆڵ بكەن تا نەكەونە بەر هێرشی رووسەكان ، بۆیە مامۆستا ( بدیع الزمان ) لەگەڵ كۆمەڵێك لە قوتابیەكانیدا بڕیاریان دا بچنە قەڵاكەی شاری وانەوە و ، تا شەهیدیی بەرگریی لە شارەكە بكەن، لەو كاتەدا والیی و قائیم مەقام و خەڵكەكە و سوپا بەرەو بەدلیس كشانەوە و ، فەوجێك لە سوارچاكانی قازاقی رووسییش هێرشیان كردە سەر ( وسطان ) و ، مامۆستا و كەمێك لە قوتابییەكانی و نزیكەی چل سەربازێك ـ كە هێشتا نەكشابوونەوە ـ بەریان لەو فەوجە ئەگرت تا نەهێڵن ژن و منداڵەكان بكەونە دەست دوژمن و ، هەر هەموویان دەرباز بوون ..

جا بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی رووسەكانەوە ، مامۆستا و قوتابیەكانی وەهایان دەرخست، كە ئەیانەوێ ئەو گردە بگرن، كە ئەنوارێت بەسەر قازاقدا ، بەمە وەها تێگەیشتن، كە كۆمەكییەكی سەربازیی زۆریان بۆ هاتووە ، بەو بۆنەوە نەهاتنە پێش و ، شارۆچكەی ( وسطان ) نەكەوتە دەست رووسەكان .

لە كاتی پشوودا مامۆستا ئەگەڕایەوە ناو سەنگەرەكان و ، بەبێ ئەوەی هیچ سەرچاوەیەكی بەلاوە بێت ، تەفسیری ( إشارات الإعجاز ) ی بە قوتابیی بەڕێز و دڵسۆزی مەلا حەبیب ئەنووسییەوە، جاری وەهایش ئەبوو بەسەر ئەسپەكەیەوە بوو ، یان لە پێشی پێشەوەی جەنگدا بوو و پێی ئەنووسیی ، تا ئەوەبوو بەشی هەرە زۆری ئەو تەفسیرە مەزنە تەواو بوو، ئەمەش لەساڵی یەكەمی جەنگی جیهانیی یەكەمدا بوو، و بە بۆنەی ئەو بارودۆخە سەختەی جەنگەوە ناچار بوو یەكجار بە كورتیی بی نووسێت ..

لە پێشەكیی ئەم تەفسیرەدا مامۆستا چەند ئاواتێك ئەخوازێت :

ئاوات ئەخوازێت خوای گەورە ئەم تەفسیرە بكاتە كەفارەتی گوناهەكانی و، خوا كۆمەڵە پیاوێك بگەیەنێت هەتا بە تەواویی لێی تێ بگەن .

هەروەها ئاوات ئەخوازێت، کە خوای گەورە کۆمەڵێکی ئیمان‌دار بنێرێ تا ئەم بەشە تەفسیرە و ، وتەکان و ، مەکتوویات ، بگرە هەموو پەیامەکانی نوور بکەنە سەرچاوە و تەفسیرێك لەو شێوەیە بنووسن .

کاتێکیش ئەم تەفسیرە کەوتە بەر چاوی ئەنوەر پاشای فەرماندەی گشتیی زۆر بە دڵی بوو، بە رادەیەك، کە کاتێك مامۆستا نوورسیی لە دیلیی رووسەکان گەرایەوە خۆی چووە پێشوازیی و بەخێرهاتنەوەی لێکرد ، بە مەرجێك ئەمەی لەگەڵ کەس‌دا نەکرد بوو، و بریاریشی دا کاغەزی چاپ کردنی بۆ دابین بکات، تا ئەویش لە پاداشت و پایەداریی ئەو کارە مەزنەدا بەشی هەبێت، هەروەها غیرەت و هەوڵ و کۆششی مامۆستا لەو جەنگە ناهەموارەدا بە بەرز نرخێنرا [٩٢]

[٩٢] سيرة ذاتية : ١٢٤ ـ ١٢٦ ، رجل القدر : ٦٤

## دووهەم : هەوڵ و غیرەت

لە جەرگەی جەنگی خوێناوییدا و ، لەو شەوەدا، کە شاری بەدلیس لە لایەن دوژمنەوە گیرا ، نزیکەی چل قوتابیی مامۆستا پلەی شەهیدییان وەرگرت، بەلاّم قوتابیی بەرێز مەلا حەبیب ، دوای ئەنجامدانی ئەرکێکی سەربازیی ، لەگەڵ خەلیل پاشا لە بەرەی واندا ، لە شاری ( وسطان ) ، بە مانگێك پێش کەوتنی بەدلیس ، شەهید کرا

جا جەنگاوەرە ئەرمەنیەکان لە چەند ناوچەیەکدا فێر بووبوون، هەر کۆمەڵە منداڵێکی موسڵمانیان دەست بکەوتنایە سەریان ئەبرین، بەو بۆنەوە موسڵمانەکانیش تۆڵەیان ئەسەند و منداڵە ئەرمەنیەکانیان سەر ئەبرین .

ئەوەبوو جارێکیان هەزاران منداڵی ئەرمەن، لەو بەرەیەدا، کە مامۆستا نوورسیی لێبوو ، کەوتنە دەست موسڵمانەکان و ، مامۆستا فەرمانی بەسەر سەربازەکاندا دا و وتی :

- بە هیچ جۆرێك دەست بۆ، ئەو منداڵانە نەبەن .

پاشان هەر هەمووی بەردان بێ ئەوەی کەس لاقەیان بکات و ، گەرانەوە ناو کەس و کاریان کە لە پشتی سەنگەرەکانی رووسەوە بوون، بەم کارە جوانە مامۆستا سەرنجی ئەرمەنەکانی راکێشا و تێی گەیاندن کە موسڵمانان مەرد و پیاوچاکن

لە هەمان کاتدا چەکدارە ئەرمەنیەکانیش، کە جاران بە کۆمەڵ منداڵی موسڵمانانیان سەر ئەبرین بەو رووداوە وازیان لە سەربرین هێنا و ، ئەیان وت : مەلا سەعید منداڵەکانی ئێمەی سەر نەبری و تەسلیمی کردنەوە ، ئێمەش لەگەڵ منداڵە موسڵمانەکاندا وەك ئەو ئەکەین، بەمە مامۆستا بووە، هۆی رزگاربوونی چەندین منداڵی بێ تاوانی هەردوولا

دوای ماوەيەك رووسەكان دەستيان بەسەر ناوچەی وان و مووش‌دا گرت و ، بە سێ فيرقەوە هێرشيان كردە سەر بەدليس، لە كاتی ئەو هێرشەدا مەمدووح بەگی واليی و ، گوڵ عەليی فەرماندە بە مامۆستايان وت :

ئێمە ناچارين بكشێينەوە ، چونكە تەنها فەوجێك سەربازمان لەگەڵدايە لەگەڵ نزيكەی دوو هەزار خۆبەخشی ژێر دەستتان، مامۆستا پێی وتن :

بەو مانايەی، كە ئەو خەڵكەی لە دەور و بەرمانەوە پەنايان بۆمان هێناوە و، دانيشتوانی بەدليس خۆيشی و ماڵ و سامانيان و منداڵەكانيان ئەكەونە ژێر دەستی ئەوان، كەواتە ئێمە ناچارين بەرهەڵستيان بكەين و ، هەتا مردن بەرگريی لە ناوچەكە بكەين ..

وتيان : سەربازەكان دوای كەوتنی مووش هەوڵ ئەدەن سيی تۆپ لە تۆپەكانمان بگوێزنەوە بۆ بەرەيەكی تری مووش ، جا ئەگەر بەو خۆبەخشانەی، كە لە گەڵتان توانيت ئەو تۆپانە رزگار بكەيت ، ئەوا ئەو كاتە ئەتوانين بۆ چەند رۆژێكی تر بەرگريی بكەين بۆ ئەوەی دانيشتوان رزگار بن ..

( بديع الزمان ) بەڵێنی دا، كە يان ئەبێت بمرێت يان ئەبێت ئەو تۆپانەيان دەست بخاتەوە .. ئەوەبوو بە فەرمانداياتيی(٣٠٠) سێ سەد خۆبەخشن شەو بەرەو نوورشين، كە تۆپەكان بۆ ئەوێ راكێشرابوون ، كەوتە رێ، لەولاوە هەواڵ دەرانی ئەوەيان بەناو سەربازە رووسەكانی قازاق‌دا ، كە پاسەوانی ئەو تۆپانە بوون، بلاو كردەوە، كە فەرماندەی خۆبەخشەكان، كە بەرگريی لە بەدليس ئەكرد، بە خۆی و سێ هەزار لە سەربازەكانيەوە و ، لەگەڵ مووسا بەگی فەرماندەی بەناوبانگ بە خۆی و هەزار سەربازەوە دێن بۆ دەست خستنەوەی تۆپەكان، كە ئەم هەواڵە بلاو بوويەوە فەرماندەی رووسەكان لە چوونە پێش وەستا و ، مامۆستاش سەربازە خۆبەخشەكانی بەسەر تۆپەكان‌دا دابەش كردن و بەرەو بەدليس رايان

کێشان ، هەتا خۆی و دوان لە هاوەڵانی دواتۆپیان راکێشا و دەربازیان کرد، بە بۆنەی ئەم تۆپانەوە بۆ ماوەی چەند رۆژێك سەرباز و خۆبەخشەکان توانییان دان بە خۆیان دا بگرن ، هەتا دانیشتوان هەر هەموو بە ماڵ و منداڵیانەوە رزگار بوون ..

ئەگێرنەوە، کە چەکدارە ئەرمەنەکان لە پاراستنی نهێنییدا زۆر ئازا بوون ئەگەر چیی رووسەکان ئەیان وت : خۆبەخشەکانی ( بدیع الزمان ) لە ئازایەتییدا بەسەر چەکدارە ئەرمەنیەکاندا زاڵ بوون ، بە رادەیەك کە توانییان قازاق بهارن .

لەو جەنگەدا مامۆستا نەئەچووە ناو سەنگەرەوە ، بەڵکو لە پێشی پێشەوەدا مەعنەویاتی سەربازەکانی بەرز ئەکردەوە، جا لە کاتێکدا، کە بەسەر ئەسپەکەیەوە لە پێشی پێشەوەدا بوو، ئەوە بە دڵیا هات و ئامۆژگاریی دەروونی خۆی کرد، کە ئەگەر شەهید بوو، با شانازیی نەکات ، تا ئیخلاصەکەی کەچ نەبێت، دوای ئەوە بە پەلە گەرایەوە ناو سەنگەرەکەی .

دوای رزگاربوونی والیی و گوڵ عەلیی فەرماندە و دانیشتوان ، کە ئەوەبوو بە شەودا کشانەوە ، ( بدیع الزمان ) لەوێ لەگەڵ کۆمەڵێك خۆبەخشدا لە بەدلیس مانەوە تا ئەوانەش رزگار بکەن کە نەیانتوانی بوو، دەرچن، هەرکە دنیا تاریکی کرد فەوجێك سەربازی دوژمن بەرەو روویان هاتن و زۆرێك لەو خۆبەخشانەی، کە لەگەڵیا بوون، شەهید بوون، کە یەکێکیان عوبەیدی خوشکەزای بوو، و تەنها خۆی و چوار لە قوتابیەکانی توانییان بە شێوەیەکی لە عادەت بەدەر خۆیان دەرباز بکەن .. [٩٣]

---

[٩٣] سيرة ذاتية : ١٢٦ ـ ١٢٧ ، رجل القدر : ٦٤ ـ ٦٥

## سێهەم : بەدیل گیران

دوای ئەوە مامۆستا کەوتە بارودۆخێکی یەکجار ئاڵۆزەوە ، بە رادەیەك، کە دەست نووسی یەکەمی ( إشارات الإعجاز ) بە دەستی دوژمن دررا و ، بە یەك جار مامۆستا چوار قازیفەی بەرکەوت، کە بە یەکێکیان زامدار بوو و ، قاچێکی شکا و ، بۆ ماوەی سیی و چوار سەعات لە ناو قور و لیتەدا مایەوە و، چاوەروانیی مەرگی ئەکرد و ، دوژمنیش ئابلووقەی دابوو، ئەمەش بە سامناك ترین و دژوارترین ساتی ژیانی مامۆستا ئەژمێررێت .

کە مامۆستا قاچی ئەشکێت قوتابیەکانی خێرا لە دەوری کۆئەبنەوە و، ئەیگەیەننە جۆگە ئاوێکی سەرگیراو ، چەند تفەنگێکیان ئەخەنە ئاوەکەوە تا قاچی بەسەریاندا درێژ بکات و ، کەمێك بحەسێتەوە، پاشان مامۆستا روویان تێ ئەکات و ، ئەڵێت : براکانم ! قەدەر بریاری داوە من بە دیل بگیرێم ، ئێوەش بۆ رزگاریی خۆتان چارەیەك بدۆزنەوە، هەر، کە ئەمەی دا بە گوێیاندا هەموو دەستیان دایە گریان و وتیان : مامۆستا گیان ! بۆ کوێ برۆین ؟ ئایا ئەبێت تۆ لەم بارودۆخەدا بیت و ئێمەش بە جێت بهێڵین ؟ ئایا شەرەف و غیرەتمان نەماوە ؟ ئەگەر ئەمرین و ، ئەگەر ئەمێنین هەر با لە خزمەتتدا بین .

سەرما یەکجار زۆر بوو .. بەفر دنیای داپۆشیی بوو، سێ رۆژ بوو هیچ خواردنێکیان نەخوارد بوو .. سەرەرای خەوزران و ، ترس و لەرز .. بریار درا یەکێك لە قوتابیەکان کە کەمێك زمانی رووسیی ئەزانیی بروا و رووسەکان لە شوێنەکەیان ئاگادار بکات، ئەوانیش هاتن و مامۆستایان بە زامداریی بە دیل گرت و ، بردیان و قوتابیەکانیشی لەگەڵیدا بوون، پاشان بردنیان بۆ وان ، جلفا،

تفلیس ، کیلوغریف ، قۆسترما، ئەوەبوو مامۆستا نزیکەی دوو ساڵ و نیو لەوێ دیل بوو، تا ئەوەبوو هەڵات و لە ساڵی ١٣٣٦ ك دا گەیشتەوە ئەستەنبوڵ .[٩٤]

دوای بەدیل‌گیرانی مامۆستا فەرماندە رووسییەکە بە شێوەیەکی جوان مەعامەلەی لەگەڵدا کرد و ، شکاویی قاچەکەیان چارەسەر کرد ، بەو هیوایەی دڵی نەرم بکەن و کەڵکی لێ وەربگرن، ئەوەبوو فەرمانده رووسییەکە ئەم پێشنیارەی پێشکەش کرد :

ـ تۆ فەرماندەیەکی ناسراویت ، بۆیە من وەهای بە چاك ئەبینم نامە بۆ عەشرەتە کوردەکان بنێریت تا چەکەکانیان بە دەستەوە بدەن ، ئەو کاتە ئەتوانین لە یەك تێ بگەین و ، رێکیش بکەوین تا بە پێی ئەوە لە زەویی و زارەکان بکشێینەوە و بەجێیان بهێڵین بۆتان .

مامۆستاش وەڵامی دایەوە :

ـ بەڵکو من وەهای بە چاك ئەبینم ئێوە چەك لە ئەرمەنیەکان کۆ بکەنەوە ، تا کە هاتنە ژێر رکێفمانەوە ، ئەو کاتە ئەتوانین لەگەڵتان رێك بکەوین .

بۆ ئەم پێشنیارەی مامۆستا فەرماندە رووسییەکە نارەزایی دەربریی و وتی :

ـ نزیکەی ( ٣٥ ) هەزار ئەرمەنیی چەك‌دار لە ناوچەی بەدلیس و مووش‌دا هەن و ، کۆکردنەوەی چەکەکانیان کارێکی رێك نەکەوتووە .

مامۆستایش وەڵامی دایەوە :

ـ لەگەڵ ئەوەدا، کە ئێمە ئەو هەموو سەربەستیەمان بە ئەرمەن دا ، کەچیی ئەوان ئەم هەمووە کارەساتە ناهەموارانەیان بەسەرمان‌دا هێنا، ئەوەبوو دەستیان دایە سەربرینی گشتیی، کە هەتا منداڵانیش لێی دەرباز نەبوون ، ئێوەش ئێستا

[٩٤] سيرة ذاتية : ١٢٨ ، رجل القدر : ٦٦ ـ ٦٧

بە فروفێڵەکانتان ئەتانەوێ پاشماوەی دانیشتوان بە دەستی ئەو ئەرمەنیانە لـەناو بەرن، منیش بە تۆ ئەڵێم : ئەگەر بە سەربازەکانت ئەم شاخ و دەشت و چەمانە پر بکەیت ، ئەوا ناتوانیت لە دەربەندی ( دلك طاش ) تێپەر بکەیت .

دوای ئەوەی ، فەرماندە رووسییەکە دەستی لەوە شۆرد، کە ( بدیع الزمـان ) دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکات ، لەگەڵ دیلـەکانی تـردا رەوانـەی ئۆردووگایـەکی دیلەکانی کرد لە شاری کۆسترمای باکووری خۆرهەڵاتی رووسیا [٩٥]

لەو کاتەدا، کە مامۆستا لە رووسیا دیل بوو، بۆ ماوەی حەفتەیـەك خۆرئـاوا نەئەبوو و خەڵکەکەش ئەچوونە تەماشای ئەو دیمەنە سەرسورهێنەرە

مامۆستا لەو شوێنەدا لەگەڵ نەوەد ئەفسەری دیلدا لە یەك ژووری گـەورەدا ئەژیان .. جار بە جار دەرسی پێ ئەوتن .

رۆژێکیان فەرماندە رووسییەکە هات و کە چاوی بەو دیمەنە کەوت وتی : ئـەم کوردە فەرماندەی خۆبەخشەکانە و ، زۆرێکیش لە سەربازەکانمانی سـەر بریـوە ، ئێستە هاتووە لێرە دەرسی سیاسیی ئەڵێتەوە ، شتی وەها نابێت ، بە یەکجاریی قەدەغەی ئەکەم .

کەچیی دوای دوو رۆژ وتی : لەوە ئەچێت ، دەرسەکانتان سیاسیی نەبن ، بەڵکو دینیی و رەوشتیین ، کەواتە لەسەریان بەردەوام بە، ئەوەبوو رێی دەرس وتنەوەی داین ..

هەر لەو ئۆردووگایەدا ژوورێکیان بۆ بەجێهێنانی نوێـژ بـە جەماعـەت کـردە مزگەوت و ، مامۆستا نوورسیی ئیمامـەت یـی ئـەکرد بـێ ئـەوەی رووسـەکان

---

[٩٥] رجل القدر : ٦٧

قەدەغەيان بكەن، هەتا لە يەكيان دانەئەبرين و ، نامە ناردنيشيان لیٚ قەدەغـە نەئەكردن .

هەمووو جارێك مامۆستا ئامۆژگاريی ئەفسەرە ديلەكانی ئەكرد تا دەنگ بەرز نەكەنەوە و ، بە يەكترييدا هەڵ نەشاخێن ، ئەوانيش ريٚزی زۆريان لەو ئەگرت .

جارێكيان دەنگـە دەنـگ دروسـت بـوو، و دەسـتيان دايـە دەمـە دەمـیٚ مامۆستاش بۆ دامركاندنەوەيان بە هەندێكی وت : بچن بۆ لای ئـەو قـرە قـر و هاوار هاوارە و ، پشت گيريی ئەوەيان بكەن، كە لەسەر نارەوايە ، نەك ئەوەی، كە لەسەر رەوايە .. ئەوانيش رۆيشتن و كارەكەيان ئەنجام دا و ، قرە قرەكە كۆتـايی پیٚ هات .

پاشان لە مامۆستا ئەپرسن، كە بۆچ ئەم كارە نارەوايەی پيٚيان ئەنجام دا ؟

مامۆستا تيٚيان ئەگەيەنيٚت، كە ئەوەی لەسەر رەوايە خاوەنی ئينصافيشە و ، لە پيٚناوی حەسانەوە و بەرژەوەنديی كەسانی تردا، كە يەكجار زۆرە دەست لە مافە هەندەكييەكەی خۆی هەڵ ئەگريٚت، بەڵام ئەوەی، كە لەسـەر نارەوايـە زۆر جـار مەغروور و ئەنانييە و ، دەست لە هيچ شتيٚك هەڵ ناگريٚت ، بەمە قرە قرەكە زياد ئەكات .[٩٦]

---

[٩٦] الشعاعات : ٣٧٩

## چوارەم : چاونەترسانی مامۆستا

که مامۆستا بەدیل گیرا و رەوانەی گەورەترین ئۆردووگای دیلەکان کرا لە سیبریا ، رۆژێکیان نیکۆلا نیکۆلا فیچ بۆ پشکنین سەردانی ئەو ئۆردووگایە ئەکات و ، بۆ رێزلێنان لێی دیلەکان هەر هەموو لەبەری هەڵ ئەسن، بەلام، کە لە بەردەم ( بدیع الزمان ) دا تێپەر ئەکات لە جێی خۆی جووڵە ناکات و بایەخیشی پێ نادات ، بە رادەیەك، کە سەرنجی فەرماندەی گشتیی رائەکێشێ و ، جارێکی تر و بە بیانوویەکی ترەوە لە بەردەمیا تێپەر ئەکاتەوە ، دیسان بایەخی پێ ناداتەوە بۆ جاری سێهەم لەبەر دەمیا ئەوەستێ و ، بە هۆی تەرجومانەوە ئەم وت و وێژە لە نێوانیاندا روو ئەدات :

ـ ئایا نەی ناسیم ؟

+ بەڵێ ئەی ناسم، نیکۆلا نیکۆلا فیچی خاڵۆی قەیصەر و ، فەرماندەی گشتیی بەرەی قەفقاسە .

ـ کەواتە بۆچ سووکایەتیی پێ کردم ؟

+ نەخێر ، داوای لێ بووردن ئەکەم، سووکایەتییم پێ نەکردووە، بەڵکو فەرمانی عەقیدەکەمم ئەنجام داوە .

ـ عەقیدە فەرمان بە چیی ئەدات ؟

+ من زانایەکی موسڵمانم و ئیمان لە دڵمدایە، جا ئەو کەسەی، کە ئیمان لە دڵیدا بێت چاکترە لەوەی کە لە دڵیا نەبێت، جا ئەگەر من بۆ رێزلێنان لەبەر ئەو هەڵسم ئەوا رێزی کەمم بۆ عەقیدەکەم داناوە، لەبەر ئەوە لەبەری هەڵ نەسام .

ـ کەواتە هەر بەوەی، کە سیفەتی بێ ئیمانیی بەسەرمدا بریی ئەوە سووکایەتیی بە خۆم و ، بە سوپاکەم و ، بە ئوممەتەکەم و ، بە قەیصەر کردووە دەبا هەر ئێستە دادگایەکی سەربازیی بۆ لێکۆڵینەوە لێی پێك بهێنرێت .

بە فەرمانی فەرماندەی گشتیی دادگای سەربازیی پێك هێنرا و ، لەولاوە ئەفسەرە تورك و ئەڵمان و نەمساوییەكان هاتنە لای ( بدیع الزمان ) و داوایان لێ كرد، كە داوای چاوپۆشیی لە فەرماندەی رووسیا بكات و عوزری بۆ بهێنێتەوە ئەویش وەڵامی دانەوە، كە پێی خۆشە گەشتێك بۆ قیامەت بكات و ، بچێتە خزمەتی پێغەمبەری بەرێز ﷺ و ، پێویستیی بە بلیتی سەفەری قیامەت هەیە و، ناتوانێت كارێك ئەنجام بدات، كە پێچەوانەی ئیمانەكەی بێت ..

بەم وەڵامەی مامۆستا هەموو بێ دەنگ بوون و ، چاوەروانی بریاری دادگا بوون .. دادگایش كاری خۆی ئەنجام دا و ، بریار بۆ لە سێدارەدانی ( بدیع الزمان ) دەرچوو ، ئەویش بە هۆی ماددەیەكەوە، كە بریتییە لە سووكایەتیی كردن بە قەیصەر و سوپای رووسیی .

دەستەیەك سەرباز و ئەفسەرێكی رووسیی ئامادە بوون هەتا مامۆستا بەرنە مەیدانی لە سێدارەدان .

ئا لێرەدا مامۆستا هەڵ ئەستێ بۆ لای ئەفسەرەكە و ، بە روویەكی گەشەوە داوای تەنها پانزە دەقیقە مۆڵەت ئەكات هەتا ئەركی سەرشانی جێبەجێ بكات .

كە ماوەی ئەدەن دەست نوێژ ئەگرێت و دەست بە نوێژ ئەكات .

با هەموو دروست كراوانی خوا شاهێد بن ، وا خواناسێك لەبەر هێزی ئیمان و قووڵیی بیروباوەر لەبەردەم سێدارەدا بەسەری بەرزەوە وەستاوە و ، بە زمانی حاڵ ئەڵێت : **بێ باوەران ! سەنگی باڵە مێشوولەیەكتان بۆ دانانێم .. تازە بریارم داوە تەنها بۆ پەروەردگارم مل كەچ بكەم و سەر دابنەوێنم، بریارە و داومە و تا مردن ـ خوا كۆمەك بێت ـ كۆڵ نادەم .**

لەو كاتەدا خاڵۆی قەیصەر ئامادە بوو، و بە مامۆستای وت :

ـ داوای لێبوردنت لێ ئەکەم، وام ئەزانیی، کە ئێوە ئەو کارەتان بە مەبەستی سووکایەتی کردن پێم ئەنجام داوە ، بۆیە ئیجرائاتی یاساییم بەرامبەرتان ئەنجام دا، بەلاّم ئێستا بۆم دەرکەوت، کە ئێوە ئەو کارە بە فەرمانی ئیمانەکەتان جێبەجێ ئەکەن و ، ئەوەی عەقیدەکەتان فەرمانتان پێ ئەکات ئەنجامی ئەدەن، لەبەر ئەوە بڕیاری حوکم دانم بەرامبەرتان بەتالّ کردەوە، ئێوە شایانی هەموو ڕێز و پێ زانینێکن بە بۆنەی پیاوچاکیی و تەقواتانەوە، داوای لێ بووردن ئەکەم ، بێزارمان کردن و ، تکاشمان : ( داوای لێبووردن ئەکەم ) چەند جار دووبارە ئەکەمەوە .

ئەم ڕووداوە پڕ مەردایەتییە ئەفسەرێك بە پلەی نەقیب گێڕاویەتەوە ، کە هاوەڵی مامۆستا بووە، و بە چاوی خۆی دیویەتی .[٩٧]

[٩٧] الشعاعات : ٥٧١ ـ ٥٧٢ ، ئەم باسە لە گۆڤاری ( أهل السنة ) کە لە ئەستەنبوولّ دەرچوو ، لە ١٥ / ١٠ / ١٩٤٨ دا ، بە پێنووسی خاوەنی گۆڤارەکە پارێزەر ( عبدالرحیم زابصو ) بلاّوکراوەتەوە . سیرة ذاتیة : ١٣٠

## پێنجەم : بە تەنیا لەسەر رووباری ڤۆلگا

مامۆستا نوورسیی باسی ژیانی ئەو ماوەیە ئەکات و ئەڵێت :

لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ، لە شارێکی دووری باکووری خۆرهەڵاتی رووسیادا ، کە پێی ئەوترا ( کۆسترما ) دیل بووم .. لەوێ ، لەسەر لێواری ( ڤۆلگا ) ی بەناوبانگ مزگەوتێکی بچووکی تەتارەکان هەبوو .. منیش لە نێو ئەفسەرە دیلە هاوەڵەکانمدا بێزاریی سەری لێ دابووم ، بۆیە وام بە چاك زانیی گۆشەگیر بم .. بەڵام بەبێ ئیزن و مۆڵەت نەیان ئەهێشت بچمە دەرەوە .. پاشان بە زامنیی و کەفالەتی دانیشتوانی گەرەکی تەتارەکان ماوەم درا لەو مزگەوتەدا بمێنمەوە .. ئەوەبوو بە تەنیا تیایا ئەخەوتم و ، بەهاریش هاتە بەرەوە و، شەوگاری ئەو ناوچە دوورەش یەکجار درێژ بوو ..

زۆر جار لەو شەوە تاریك و رەشانەدا، کە خەم و خەفەتی رەشی غەریبییان لە خۆ پێچابوو ، خەوم ئەزرا ، لە کاتێكدا لە جگە لە خورەی خەمناکی رووباری ( ڤولگا ) و ، چرکەی ناسکی دڵۆپی باران و ، بێ تاقەتیی لێك دابران، کە لە گفەی باکانەوە ئەهات، هیچی تر نەئەبیسترا .. ئەمە هەر هەمووی ـ بە شێوەیەکی کاتیی ـ لە خەوی قووڵی بێ ئاگایی بێداری کردمەوە

جا هەرچەندە هێشتا خۆمم بە پیر لە قەڵەم نەئەدا ، بەڵام هەرکەس جەنگی جیهانیی ببینێ پیر ئەبێت ، چونکە بە ترس و لەرزی رۆژانی جەنگ منداڵان پیر ئەبوون ، هەروەك ئەو رۆژانە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەیان ﴿ يَوۡمًا يَجۡعَلُ ٱلۡوِلۡدَٰنَ شِيبًا ﴾ ( المزمل : ١٧ ) لە خۆ گرتبێ و ، لەگەڵ ئەوەشدا، کە تەمەنم نزیکی چل ساڵیی بوو بوویەوە ، کەچیی خۆمم وەك تەمەن هەشتا ساڵێك ئەهاتە پێش چاو ..

لەو شەوگارە تاريك و درێژ و خەمبارانەدا و ، لەو دەوروبەرەدا، كە نوقمی خەم و خەفەتی غەريبييە و ، لەو واقيعە پڕ ئێش و ژانە سەختەم دا ، نائومێدييەكی قورس بەرامبەر بە ژيان و نيشتمانم تەپی كوتايە سەر سنگم، ئيتر هەرچيی ئاورم بە لای دەستەوسانيی و بێ كەسيی خۆمدا ئەدايەوە هەموو هيوا و ئومێدێكم ئەبڕان، بەلاّم لە قورئانی پيرۆزەوە كۆمەكييم بۆ هات ..

ئەوەبوو زمانم ﴿ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴾ ( آل عمران : ١٧٣ ) ی دووپات ئەكردەوە و ، دڵيشم بە گريانەوە ئەی وت :

من غەريبم.. من تەنيام.. من لاوازم .. من دەستەوسانم .. هاواری ئەمانە داوای لێ بووردن ئەكەم .. دادی يارمەتييمە لە دەرگانەی تۆدا خودايە !

بەلاّم رۆحم، كە خۆشەويستانی دێرينی شارەكەمی هاتنەوە ياد و ، مردنی لەو غەريبييەدا هێنايە پێش چاو ، ئەوەبوو شيعرەكانی نيازيی ميصرييشی خوێندنەوە كە بە دوای دۆستدا ئەگەڕێن :

بەلای هەموو خەفەتێكی دونيادا گوزەرم كرد و،
بۆ بێ بەشيی دامە شەقەی باڵ ..
بە تاسەوە ئەفرييم و ،
لە هەموو ساتێكدا هاوارم ئەكرد :
دۆست .. ! دۆست .. !

بە هەر حاڵ .. ( دەستەوسانيی ) و ( لاوازييم ) لەو شەوگارە پڕخەم و، درێژانەدا، كە بە لێك دابڕان و دڵ ناسكيی و ئاوارەيی تاريك بوو بوون ، بوونە دوو هۆی نزيك كەوتنەوە لە دەرگانەی رەحمەتی خوايی ، بوونە دوو تكاكاريش لە حزووری خوای گەورەدا، بە رادەيەك، كە من تا ئێستاش لەوە سەرسامم چۆن دوای چەند رۆژێكی كەم توانييم هەڵ بێم و ، بە شێوەيەكی چاوەڕوان نەكراويش ئەوەندە

رێگا ببرم، کە مەگەر بە ساڵێکی تەواو بە پێ ببڕێت و ، لە زمـانی رووسـییش شارەزا نەبووم .. بە راستیی بە شێوەیەکی سـەیر و سەرسـوورهێنەر لـە دیلیـی رزگارم بوو، ئەمەش بە فەزڵی چاودێریی خوایی بوو، کە بە بۆنەی دەسەوسانیی و لاوازییمەوە فریام کـەوت و ، لـە رێـی ( وارشـۆ ) و ( ڤیـەننا )وە گەیشـتمەوە ئەستەنبوڵ .. بەم جۆرە لەو دیلییە ئەوەندە بە ئاسانیی رزگارم بوو، کـە مایـەی سەرسامیی بوو ..

ئەوەبوو ئەو گەشتە درێژەی هەڵ هاتنم بەوپەڕی سووك و ئاسانییەوە تەواو کرد، کە ئازاترین و زیرەك ترین و لێ هاتووترینی ئەو کەسانەی، کە شـارەزای زمـانی رووسییشن نەیان ئەتوانی ئەنجامی بدەن ..[٩٨]

## شەشەم : ئەندامی ( دار الحکمە )

[٩٨] اللمعات : ٣٥٤ ، سیرة ذاتیة : ١٣٠ ـ ١٣٣

مامۆستا نوورسیی لە نۆزدەی رەمەزانی پیرۆزی ساڵی ١٣٣٦ ك بەرامبەر بە هەشتی تەمووزی ساڵی ١٩١٨ ز گەیشتۆتەوە ئەستەنبوڵ و ، لەلایەن خەلیفە و، شێخولئیسلام و ، فەرماندەی گشتیی و ، قوتابیانی زانستە شەرعییەکانەوە بەوپەری رێز و ئیحترامەوە، کە شیاوی(بديع الزمان) بێت، پێشوازیی لێ کرا[99]

حکومەتی ( إتحاد و ترقي ) بە یەك دەنگیی رای وەها بوو کە مامۆستا نوورسیی سەرکەوتووترین کەسە تا دانایەتیی ئیسلامیی بە شێوەیەکی کاریگەر بە حەکیمانی ئەورووپا بگەیەنێت ،[100] ئەوەبوو لە ئەستەنبوڵ و ، لە ( دار الحكمة الإسلامية ) نزیکەی سێ ساڵ ، بۆ خزمەتی دین ، مایەوە[101]

بەڵێ ، بەبێ رەزامەندیی خۆی لە ( دار الحكمة ) دامەزرا .. ئەوەبوو بە پێشنیاری وەزارەتی جەنگ لە ٢٦ / ٨ / ١٩١٨ ز دا ، واتە لە کۆتایی دووهەم مانگی گەڕانەوەی لە دیلیی ، بە مووچەیەکی مانگانە کە بریتیی بوو لە پەنجا لیرەی زێر دامەزرا، پاشان ئەنوەر پاشای وەزیری جەنگ داوای لە مامۆستا ( مووسا کاظم ) ی ( شيخ الإسلام ) کرد تا داوا لە سوڵتان ( وحيد الدين خان ) بکات تا پلەیەکی زانستییانەی بەرز بە ( بديع الزمان ) ببەخشێ، سوڵتانیش لە ٩/ ٩ / ١٩١٨ دا رەزامەندیی لەسەر ئەوە نواند، بەڵام مامۆستا ، بە بۆنەی زەحمەت و مەینەتی دیلییەوە ، نەی ئەتوانی ئامادەی کۆبوونەوەکانی ( دار الحكمة ) ببێت ، ئەوەبوو چەند جارێك داوای کرد، کە لەو ئەندامێتییە دەست بەرداری بێن ، کەچیی داواکەی وەر نەئەگیرا ، سەرەنجام دەستی بە دەوام کرد ،[102]

---

[99] اللمعات : ٣٥٤

[100] الشعات : ٥١٥

[101] الكلمات : ٣٤٧

[102] لە حوزەیرانی ١٩١٩ ز دا دەستی بە دەوام کرد و، بە هەمووی دە مانگ چوار رۆژ کەمتر دەوامی کردووە .

بەلاّم لە مووچەکەی تەنها ئەوەندەی وەرئەگرت کە بە ناچاریی پێی بژیت و ، پێی خۆش بوو وەك خەڵکانی رەش و رووتی ناو کۆمەڵەکەی بژیت ، نەك چاو لە دەست بلاّوەکان بکات، ئیتر ئەوەی، کە ئەمایەوە ئەیدایە دەست عەبدوررەحمانی برازای تا بۆی هەڵ بگرێت، بەلاّم عەبدوررەحمان لەو پارەیەی خەرج ئەکرد بێ ئەوەی مامۆستا بزانێت، رۆژێکیان بەو خەرج کردنە ئەزانێت و نارەزایی دەرئەبرێت ، چونکە ئەو پارەیە هی ئوممەتی ئیسلامە و ، عەبدوررەحمان لە خەرج کردنی پارە نەخات .

دوای ماوەیەك مامۆستا ئەو دوانزە پەیامەی، کە نووسیی بوونی چاپ ئەکات و چیی پارەی پاشەکەوتیان هەبوو ئەیدا بە چاپ کردن و ، پەیامەکان ـ جگە لەیەك دوو پەیامیان ـ بەبێ بەرامبەر بەسەر موسڵماناندا دابەش ئەکات . عەبدوررەحمان پرسیاری لێ ئەکات بۆچ پەیەمەکان نافرۆشێت تا پارەکە بێتەوە دەستیان ، تێی ئەگەیێنێ، کە ئەو مووچەیەی ( دار الحكمة ) تەنها بەشی گوزەرانیان بۆیان حەلاّڵە و زیادەکەی پێویستە بگێرنەوە بۆ موسڵمانان ..[١٠٣]

بەمە ئەو مووچەیەی، کە مامۆستا لە ( دارالحكمة ) وەری گرتبوو ، بەشی زۆری گێرایەوە بۆ موسڵمانان ، کەمێکی نەبێ، کە بە نیازی ئەنجام دانی فەرزی حەج پاشەکەوتی کردبوو، ئەوەبوو مامۆستا ماوەی نەبوو بچێت بۆ حەج ، بەڵکو ئەو پارەیە ، هەرچەندە کەم بوو، بە بەرەکەتی قەناعەت و دەست پێوە گرتن، بەشی چەند ساڵێکی سەردەمی نەفیی کردنی کرد ، تا بەندەی خواناس دەست لە هیچ کەس پان نەکاتەوە

[١٠٣] تاريخ الحياة

مامۆستا نزیکەی دوو ساڵ مووچەی لە ( دار الحكمة ) وەرگرت ، کە نەوەد لیرەی زێری لێ پاشەکەوت کرد بوو، و لە ساڵی ١٩٤٦ دا دای بە چاپ کەرانی پەیامەکانی نوور تا لە مەسرەفی کرینی کاغەز و چاپ و ڕۆنیۆدا بەشداریی بکات .[١٠٤]

عەبدوررەحمانی برازایشی، کە لەو کاتەدا لەگەڵ مامۆستادا ئەژیت نامەیەك بۆ عەبدولمەجیدی مامەی ئەنێرێت و ئەڵێت :

لە ڕەفتاری مامە ( سەعید )م سەرسام بووم .. چیی ئاواتی دنیاییم هەبوون هەمووی دان بە بادا . حکومەت مووچەیەکی چاکی ئەداتێ و ، منیش هەرچیی لە مەسرەفی خۆمان ئەمایەوە پاشەکەوتم ئەکرد، چەند کتێبێکیشی دانابوون و ، جارێکیان بانگی کردم و وتی :

برۆ بەرێوەبەری فلانە چاپخانەم بۆ بانگ بکە، منیش ڕۆیشتم و ، کاتێك، کە کتێبەکانی دا بە بەرێوەبەرەکە پێمی وت : عەبدوررەحمان ! ئەو پارەیەی، کە پاشەکەوتت کردووە بی هێنە بۆم و ، بی دەرە خزمەتی بەرێوەبەری بەرێز، منیش کارەکەم ئەنجام دا، کە بەرێوەبەر ڕۆیشت هەردوو چاوم لە فرمێسك پڕ بوون ، بەڵام من دڵ خۆشیی خۆمم ئەدایەوە و ئەم وت :

ئەم کتێبانە چاپ ئەکرێن و ئەفرۆشرێن و ، پارەکە ئەگەرێتەوە دەستم و پاشەکەوتی ئەکەم، بەڵام ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێك جارێکی تر ناردمی تا بەرێوەبەرەکە بانگ بکەمەوە، ئەم جارەیان بە بەرێوەبەری وت : تکام وەهایە لەسەر کتێبەکانم بنووسیت : بەبێ بەرامبەر بەسەر ئوممەتی ئیسلام دا دابەش ئەکرێن، کە بەرێوەبەرەکە چووە دەرەوە هەستم کرد ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەی، کە بەرامبەر بە مامەی گەورەم هەستم پێ ئەکرد نەما و ، نەشم توانیی خۆم بگرم و

١٠٤ الملاحق ـ أميرداغ : ١ / ٢٣٧ ، المكتوبات : ٨٢ .

نەگرییێم، پێم وت : مامە گیان ! هەندێ پارەم پاشەکەوت کرد بوو تا ئەو خانووەمانی پێ تەعمیر بکەمەوە، کە جەنگ وێرانی کرد بوو ، بەلاّم ئێستا تۆ ئەو هیوایەمت لە ناو برد، ئایا شتی وەها ئەبێت ؟ مامەم زەردەخەنەیەکی کرد و وتی : کورەکەم ! عەبدوررەحمان گیان ! حکومەت مووچەیەکی زۆری پێمان ئەدا و، منیش جگە لە بەشی نەفسی خۆمان مافی ئەوەم نەبوو دەستی بۆ بەرم ، ئیتر هەرچیی لەوە زیاتر بێت ئەبێ بیگێرینەوە بۆ ( بیت المال ) ، بۆیە من ئەو پارە زیادەیەم گێرایەوە بۆ موسلمانان ، برواشم وەها نیە، کە تۆ لەوە تێ بگەیت ، بەلاّم ئەوەش بزانە، کە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو، ئەوا لە هەر شوێنێکی ئەم نیشتمانەدا بێت خانوویەکت پێ ئەبەخشێ . ( ش / ١٨٥ ـ ١٨٧ ، عن مجلة أهل السنة ٢ / ٤١ في ١ / ١١ / ١٩٤٨ ).

( دار الحكمة الإسلامية ) سەر بە مەشیەخەی گشتیی ئیسلامیی دەولەتی عوثمانیی بووە و ، تەنها زانا پایەدارەکانی لە خۆ گرتوون ، وەك موحەمەد عاکیف و ،[١٠٥] ئیسماعیل حەققیی ئیزمیرلیی و ، حەمدیی ئەلمالیلیی و غەیری ئەوانیش ..[١٠٦]

## حەوتەم : خەوێکی مانابەخش

---

[١٠٥] ( ١٨٧٣ ـ ١٩٣٦ ) شاعیری ئیسلام بووە لە تورکیا و ، سەرنووسەری گۆڤاری ( الصراط المستقیم ) و گۆڤاری ( سبیل الرشاد ) بووە، بۆ ئەندامی پەرلەمان لە ئەنقەرە هەڵ بژێرراوە

[١٠٦] مێژوونووس ئیسماعیل حەققیی ئەگێڕێتەوە، کە پرسیاری لە شێخولئیسلام موصطەفا صەبریی مامۆستای کردووە، کە لەبەر چ هۆیەك مامۆستا نوورسیی بۆتە ئەندامی ( دار الحكمة ) ؟ ئەویش وەلاّمی داوەتەوە کە نوورسیی یەکجار شارەزای زانستی فەرموودەی پێغەمبەر بووە ﷺ .( Aydınlar Konusuyor : ٣٠٢ لنجم الدين شاهين أر ) ، سيرة ذاتية : ١٣٣ ـ ١٣٥

با بەر لەوەی باسی ئەو خەوەی مامۆستا نوورسیی بکەین ، ئەوە بڵـێین، کـە مامۆستا بە بارودۆخی ناڵەباری موسڵمانان زۆر خەفەتی ئەخوارد ، کاتێکیش، کە دەربارەی ئەو ئێش و ئازارانەی، کە ئەیچەشتن بە هۆی موصیبەت و تێك شکانی دەوڵەتی عوثمانییە وە پرسیاری لێ ئەکرا ، وەڵامی ئەدایەوە :

**من ئەتوانم باری ئـێش و ئـازاری کەسـیی خـۆم هـەڵ بگـرم، بـەڵام ئـێش و ئازاری ئوممەتی ئیسلامیی هاریمی، من وەها هەست ئەکەم ئەو خەنجەرانەی، کە ئاراستەی جیهانی ئیسلامیی کراون ، یەکەم جار ئاراستەی دڵی من کراون . لەبەر ئەوە من بە دڵ تێك شکاو ئەبینن ، بەڵام بە ئیزنـی خـوا مـن نوورێـك ئەبینم، کە ئەم رۆژە رەشانەمان لەیاد ئەباتەوە .**[١٠٧]

ئەمەش خەوەکەیەتی : لە دوای تەواوبوونی جەنگی جیهـانیی یەکـەم و ، لـە ساڵی ١٩١٩دا مامۆستا نوورسیی لە حاڵـەت و بـارودۆخێکی یـەکجار دژواردا ژیاوە ، ئەوەیش بە بۆنەی ئەو دەست لە خۆ شۆردنەی کە بە هـۆی رووداوەکـانی رۆژگارەوە گەیشتبووە چڵەپۆپە، لە ناو ئەو تاریکاییە چرو پرانەدا بە دوای نوورێك دا ئەگەرا ، سەرەنجام لە خـەوێکی راسـتدا، کـە بەخەبـەربوونی راسـتەقینەیە، دەستی کەوت .

ئەو شەوە شەوی جومعە ئەبێت و مامۆستا ئەچێتە جیهانی ( مثـال ) ە وە بەرێزێك دێتە لای و پێی ئەڵێت :

ـ کۆرێکی بەویقاری پر سام و هەیبەت ، بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی چارەنووسی جیهانی ئیسلامیی و ، زانینی ئەو بارودۆخەی، کە بەسەریدا هاتووە ، گـیراوە و بانگت ئەکات .

---

[١٠٧] سورة ذاتية : ١٣٧

مامۆستاش ئەچێت و ، کۆڕێکی نوورانیی ئەبینێت کە پیاوچاکانی پێشیینە و، نوێنەرانی هەموو چەرخەکانی تێدا ئەبن، کە هێشتا لە دنیادا هاو وێنەی ئەوانەی نەدیی بوون .. مامۆستا سام و هەیبەتی کۆڕەکەی لێ ئەنیشێ و ، لەبەر ئەدەب و ڕێزلێنانی لە دەرگادا ئەوەستێ .

یەکێك لە دانیشتوان ڕووی تێ ئەکات و پێی ئەڵێت :

ـ ئەی پیاوی قەدەر ! .. ئەی پیاوی چەرخی نەگبەتیی و فیتنە و تیاچوون ! .. لەم باسەدا تۆش ڕای خۆت دەر ببڕە ، چونکە ئەبێ ڕای تۆشی تیا بێت .

مامۆستا، کە لە دەرگاکەدا وەستا بوو ئەڵێت : پرسیارم لێبکەن تا منیش وەڵام بدەمەوە

یەکێکیان ئەڵێت :

ـ سەرەنجامی ئەم تێك شکانە ـ کە بەسەر دەوڵەتی عوثمانییدا هاتووە ـ چۆن دێتە بەر چاوت و ، ئەگەر دەوڵەتی عوثمانیی سەر بکەوتایە بە تەما بوویت کاری بەرەو کوێ بروا ؟

مامۆستا لە وەڵامدا دەری ئەبڕێ، کە مەرج نیە هەموو موصیبەت و لێ قەومانێك شەر و خراپە بێت ، بەڵکو جاری وەها ئەبێت، کە بەختەوەریی لە بەلا و نەگبەتییدا بێت و ، بەلایش لە بەختەوەرییدا کەواتە دەوڵەتی عوثمانیی، کە بۆ پارێزگاریی لە جیهانی ئیسلامیی فەرزی جیهادی خستبووە ئەستۆی خۆی و ، ئالای خەلافەتی بۆ بەرزکردنەوەی فەرمایشتی خوا هەڵ گرت بوو ، ئەو موصیبەتەی، کە هاتە ڕێی ، بە هۆی ئەو بەختەوەرییەوە، کە لە دوارۆژدا جیهانی ئیسلامیی ئەیگاتێ ، بۆی ئەبژێرێتەوە

ئەو موصیبەتە برایەتیی ئیسلامیی گەشە پێ کرد ، بە رادەیەك لە کاتێكدا، کە دەوڵەتی عوثمانیی لە ئێش و ئازاردا بوو ، جیهانی ئیسلامیی فرمێسکی هەڵ ئەڕێژا. خۆ ئەگەر ئەورووپا ئازاری زیاتری بدانایە ئەوا جیهانی ئیسلامیی هاواری

ئەکرد خۆ ئەگەر بیست ملیۆن عوثمانیی تورك بمرن ئەوا سێ صەد ملیۆن موسڵمانی جیهان زیندوو ئەبنەوە، بەڵێ موسڵمانان بەم تێك شکانەی دەوڵەتی عوثمانیی بەختەوەرییەکی بە پەلەی تیاچوویان لە دەست دا ، بەڵام بەختەوەرییەکی هەمیشەیی و بەردەوام چاوەروانییان ئەکات ، دیارە ئەمەش قازانجی موسڵمانانە .

دەنگێك لە کۆرەکەوە هات :

ـ روونی بکەرەوە ! ئەوەی ئەیلێیت چاك دەری بخە !

مامۆستا دەری بریی، کە ئەگەر دەوڵەتی عوثمانیی سەر بکەوتایە ئەوا چاوی لە دەوڵەتە کافرە مل هورەکان ئەکرد و ، دەستی ئەدایە داگیرکردن و زۆرداریی لەوان خراپتر ، هەرچەندە ئەو کارە لەگەڵ سروشتی جیهانی ئیسلامییدا نەگونجاوە و ، لەگەڵ بەرژەوەندیی موسڵماناندا نیە و ، تەمەنیشی کورتە و زوو تیا ئەچێت . ئەو کاتە جیهانی ئیسلامیی بەرەو کارێکی نامۆ ئەبرا، کەواتە شارستانێتیی ئەوروپا، کە زیانەکانی یەکجار زۆرن و ، موسڵمانان جگە لە زەرەر و زیان هیچیان لێی نەدیوە و ، لە روانگەی شەرعەوە شتێکی نەویستراوە ، هەر ئەوەندەیە مرۆڤ چاو بکاتەوە ، ئیتر تیا ئەچێت و ئەرووخێت ..

یەکێك لە ئەندامانی کۆرەکە پرسیی :

ـ شەریعەت بۆچ ئەم شارستانیەتە ئەداتە دواوە ؟ [١٠٨]

مامۆستاش وەڵام ئەداتەوە، کە ئەو شارستانیەتە لەسەر پێنج بنچینەی سەلبیی دامەزراوە :

یەکەم : خاڵی پشت پێ بەستنی هێزە ، کە کاری هێزیش دەست درێژییە

---

[١٠٨] مامۆستا روونی ئەکاتەوە، کە ئەم شارستانیەتە هەندێکی چاکە و هەندێکیشی خراپە، بەڵام گەمژەکانی جیهانی ئیسلامیی ئەو خراپانەیان بە چاکە زانیی و ، موسڵمانانیان بەرەو هەڵ دێر برد و ، ئەوە بوو دوو جەنگی سەختی جیهانیی هەڵ گیرسان و ، سەرزەویی بووە، گۆمی خوێن و بە ملیۆنەها بەستەزمان ماڵ کاول و رەنجەرۆ بوون، بێ ئەوەی کەلکی بۆ مرۆڤ هەبێت، هیواداریین خوای گەورە ئیسلام بەهێز بکات تا سەرزەویی پاك بێتەوە و ، ئاشنایی باڵ بەسەر مرۆڤایەتییدا بکێشێت .

دووهەم : ئامانج و مەبەستی : کەڵك و قازانجی خۆیەتی و ، کاری ئەمەش پاڵ پاڵێنە

سێهەم : دەستووری ژیانی : بەرابەرکێ و زۆرانبازییە و ، کاری ئەمەش ناکۆکیی و دووبەرەکییە

چوارەم : پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان : رەگەزپەرستیی و نەتەوەگەریی سەلبییە، کە لەسەر حیسابی کەسانی تر گەشە ئەکات و ، کاری ئەمەش لێکدان و پێکدادانە

پێنجەم : خزمەتکردنی بۆ مرۆڤایەتیی خزمەتکردنێکی دڵرفێنە ، بەوەی، کە ئارەزووی بەرژەوەندیبازیی هەڵ ئەنێت و ، ئارەزوواتی نەفسی ئەمارە ئەورووژێنێ و ، ئاواتەکانی بۆ ئاسان ئەکات . جا ئەم ئارەزووبازییە مرۆڤ لە پلەی مەلائیکەتییەوە ئەخاتە ناو چاڵی ئاژەڵیی و سەگێتییەوە ، بەمە بە شێوەیەکی مەعنەویی مرۆڤ مەسخ ئەبێت .

بەم کارە سەلبییەی ئەم شارستانیەتە لە ٨٠٪ صەدا هەشتای مرۆڤ بەدبەخت بوون، و لە ١٠٪ صەدا دەشیان کەوتوونەتە ناو بەختیارییەکی ساختەوە و ، لە ١٠٪ صەدا دەکەی تریش لە نێوان هەردوولادا سەرسام وەستاوە، بەمە بەختەوەریی ئەم شارستانیەتە بۆ چینێکی یەکجار کەمە، لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز لە هیچ شارستانیەتێك رازیی نابێت ئەگەر بەختەوەریی پەخشانی تێکرای مرۆڤ ، یان بەشی هەرەزۆری نەکات .

کە ئارەزواتی مرۆڤیش بەرەڵا کران ، پێویستییەکانی لە چوار پێویستیی سەرەکییەوە زیادیان کرد بۆ صەد پێویستیی ئەمەش بۆتە هۆی هەژارکەوتنی مرۆڤ .. کەواتە پێویستە شەو و رۆژ هەوڵ بدا بۆ بەرامبەربوونەوە لەگەڵ مەسرەفە

پر لە ئیسرافەکان ، ئەمەش مرۆڤی ناچاری فروفێڵ و حەرام خواردن کردووە ، ئەمەش بووە هۆی رووخانی رەوشت .

جا لە کاتێك دا کە ئەم شارستانیەتە سامان و دەوڵەمەندیی بە کۆمەڵ و جۆری مرۆڤ ئەبەخشێ ، تاکە تاکەی مرۆڤەکان هەژار و رەوشت رووخاو دەرئەکات .

بەمە لە هیچ چەرخێك‌دا ئەوەندە بەدبەختیی و کلۆلیی بەسەر مرۆڤ دا نەهاتووە

شایانی باسە کە تێگەیشتوانی جیهانی ئیسلامیی هەرگیز رازیی نابن هیدایەتی خوایی، کە لە شەریعەتە پاك و بێگەردەکەیدایە ، تێکەڵ بە فروفێڵ و رەوشت نزمییەکانی رۆمان و یۆنان بکەن، چونکە شەریعەت تایبەتمەندیی سەربەخۆیی و نەتوانەوە بە شوێن‌کەواتوانی پێشکەش ئەکات .

ئەندامانی کۆرەکە لە مامۆستا ئەپرسن :

ئەی ئەو شارستانیەتەی، کە لە شەریعەتدایە کامەیە ؟

مامۆستاش ئەڵێت : بەڵام ئەو شارستانیەتەی، کە لە چوارچێوەی شەریعەتی پاك و بێگەردایە و ، شەریعەت فەرمانمان بەسەردا ئەدات تا هەوڵی بەرپاکردنی بدەین ، ئەوەیە کە بە رەواندنەوەی ئەم شارستانیەتەی ئێستا دەرئەکەوێت و ، چەندین بنچینەی ئیجابیی رێك و پێك لە جێی ئەو بنچینە کلۆرە گەندەڵە سەلبییانە دائەنێت .

بەڵێ ! خاڵی پشت پێ بەستنی شارستانیێتیی شەریعەت : ( حەق )ە لە بریی هێز، کاری حەقیش بریتییە لە، عەدالەت و هاوسەنگیی ، ئامانجیشی، رەوشت بەرزییە لە بریی کەڵك و قازانجی خۆی، رەوشت بەرزییش کاری بریتییە لە : خۆشەویستیی و کەمەندکێش کردن، لایەنی یەك بوون و ئەو پەیوەندییەش، کە کۆمەڵانی مرۆڤ بە یەکەوە ئەبەستێت، پەیوەندیی دینیی و ، نیشتمانیی و ، پیشەییە لە بریی رەگەزپەرستیی، کاری ئەمەش بریتییە لە: برایەتییەکی پاك و

بێگەرد و ، ئاشتیی و تەبایی و ، بەرگریی لـە ولأت لـە کـاتی دەسـت درێـژیی بێگانان‌دا، دەستووریشی لە ژیان‌دا، هاوکارییە لە بریی زۆرانبازیی و بەرابەرکێ، کاری هاوکارییش بریتییە: لە پالدان بە یەکەوە و یەك‌گرتن .

لە بریی هەوا و ئارەزوواتیش هیدایەت دائەنێت تا ببێتە دادوەر لەسـەر ئـەو خزمەتانەی، کە پێشکەشی مرۆڤ ئەکرێن و ، کاری هیدایـەتیش بریتییـە لـە : بەرزکردنەوەی مرۆڤایەتیی بۆ پلە بەرزەکانی کەمالأت، جا کە هیدایەت سنوورێك بۆ هەوا و ئارەزووات دائەنێت و ، ئاواتە نەفسانییەکان لە ئاستێك‌دا ئەوەستێنێ ، رۆح بێخەم ئەکات و وەهای لێ ئەکات، کە بۆ پلە بەرزەکان بە تاسەوە بێت .

بەو مانایە کە ئێمە بە تێك شکانمان لـە جەنگـدا کەوتینـە شـوێن تـەوژمی دووهەم، کە بریتییە لە تەوژمی ستەم لێکراوان و جەماوەری خەلك، جا ئەگـەر ستەم لێکراوان لە غەیری ئێمەدا لە ٨٠٪ صەدا هەشتایان پێك بهێنن ، ئەوا لە ناو موسـلمانان‌دا لـە ٩٠٪ صـەدا نـەوەد ، بگـرە لـە ٩٥٪ صـەدا نـەوەد و پێـنج ئەبن .....

دەنگی تەصدیق لە کۆرەکەوە بەرز بوویەوە و وتیان :

بەلێ ، هیوادار بن ، بەرزترین دەنگی کاریگەر لە ئالۆ و گۆڕییەکانی ئایندەدا بریتییە: لە دەنگی ئیسلام

یەکێکی تریشیان پرسیاری کرد :

بەلا و موصیبەت لە ئەنجامی تاوان‌دا دێت و ، پێشەکیی پاداشتە، جـا ئێـوە چیتان کردبوو هەتا قەدەری خوایی بریاری ئەم موصیبەتەی بۆتان دەرکرد، چونکە بەلا و موصیبەتی گشتیی بە هۆی هەلەی زۆربەی خەلکەکەوە بەسـەردا دێـت ؟ ئەی پاداشتی بە پەلەتان کامەیە ؟

مامۆستا نوورسیی ئەلێت :

پێشەکیی سێ پایە لە پایەکانی ئیسلامان پشت گوێ خستن: نوێژ، و رۆژوو، و زەکات، ئەوەبوو بەدیهێنەری پاك و بێگەرد بۆ ئەنجام‌دانی پێنج فەرزەی نوێژ لە بیست و چوار سەعات‌دا داوای تەنها یەك سەعاتی لێمـان کـرد، کەچـیی ئێمـە

تەممەڵییمان کرد لە ئەنجامدانی، ئەویش بە راهێنانێکی قورس و هەمیشەیی بیست و چوار سەعاتیی بۆ ماوەی پێنج ساڵی سەرەمر پاداشتی داینەوە، واتە ناچاری بەجێهێنانی جۆرە نوێژێکی کردین، هەروەها خوای پاك و بێگەرد داوای لێ کردین بۆ بەزەیی هاتنەوە بە خۆمان دا لە ساڵێك دا مانگێك بەرۆژوو بین، کەچیی دڵمان نەهات خۆمان نارەحەت بکەین ، ئەویش بۆ ماوەی پێنج ساڵ ناچاری رۆژووگرتنی کردین ، بۆ کەففارەتی تاوانەکانمان .. هەروەها خوای پاك و بێگەرد داوای زەکاتی لێکردین ، کە بریتییە لە دەیەك یان چل یەکی ئەو سامانەی، کە پێمانی بەخشیوە، کەچیی ئێمە بەخیلییمان کرد و ستەممان کرد ، ئەویش ناچاری کردین زەکاتێکی کەڵەکە بوو لەسەرمان بدەین، ( الجزاء من جنس العمل )

بەڵام پاداشتی بەپەلەمان بریتییە لەوەی، کە خوای پاك و باڵادەست پێنج یەکی ئەم ئوممەتە تاوانبارەی ـ واتە چوار ملیۆنیان ـ بەرز کردەوە بۆ پلەی ویلایەت و ، پلەی شەهیدیی و پلەی موجاهیدانی پێ بەخشین، ئیتر ئەوەبوو ئەو موصیبەتە گشتییەی، کە لە هەڵەی گشتییەوە بەسەردا هاتبوو تاوانەکانی رابووردووی لابردن .....[109]

## هەشتەم : دانانی ( الخطوات الست ) و وەڵامی کەنیسە

لە ١٣ / ١١ / ١٩١٩دا پەنجا و پێنج کەشتیی جەنگیی کەشتیگەلی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان ، بە پێی جەنگ وەستاندنی ( مۆندرۆس ) کە لە ٣٠ / ١٠ / ١٩١٨دا مۆر کرا بوو ، هاتنە ناو ئەستەنبوڵەوە ، کە بیست و دوو کەشتییان هی ئینگلتەرە و ، دوانزەیان هی فەرەنسا و ، حەڤدەیان هی ئیطالیا و ، چواریشیان

[109] سيرة ذاتية : ١٣٧ ـ ١٤٢

هی یۆنان بوون، ئەم کەشتییانە رووی تۆپەکانیان کردە کۆشکی خەلیفە، کە لە حوکمی دیل‌دا بوو، لە کۆشکی ( دۆلمە باخچە ) دا و ، لە ١٨ / ٣ /١٩٢٠یش‌دا ئینگلیز ئەستەنبوڵیان داگیر کرد

ئا لەو کاتەدا کەمینە ناموسڵمانەکان هاتنە دەرەوە و دەستیان دایە چەپڵە و هەل هەلە بۆ سەربازە داگیرکەرەکان، ئەو ناموسڵمانە نامەردانە چەند صەدە بوو بەوپەری رێز و مافەوە لە سایەی دەوڵەتی عوثمانییدا ئەژیان بێ ئەوەی کەسێك بۆی بێت دەستیان بۆ ببات، کەچیی لەو رۆژەدا شادمانیی خۆیان دەرئەبریی و لە یادیان چوو بوو، کە ئەوانە لە ژیان و گوزەرانی چاك‌دا ئەژیان و ، زۆریان بە پلە و پایەی وەزیریی ئەگەیشتن و ، لە خزمەتی سەربازییش چاپۆشی‌یان لێ کرابوو .

لە ئیسپانیا مەسیحییەکان دەستیان دایە کوشت و بڕی جوولەکە و ، دوای کوژرانی دەیان هەزاریان ، جوولەکە ناچار بوون پەنا بەرنە خاکی دەوڵەتی عوثمانیی، چونکە لە هیچ ولاتێك‌دا جێیان نەئەکرایەوە ، کە ئەو کاتە سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونیی بوو، رێی پێدان و هاتنە ولاتەکەیەوە و ، ئەوپەری ماف و رێزیشی بۆ دانان .

ئەرمەنیش بە درێژایی مێژوو لە ژێر ستەم و جەوردا نالاندوویانە کاتێك، کە لە ژێر دەسەلاتی مەجووسەکان‌دا بوون هەوڵیان دا بە زۆر بیان‌کەن بە مەجووسیی و ، کاتێکیش کەوتنە ژێر دەسەلاتی بیزەنطی یەکان هەوڵیان دا بە زۆر بیان‌بەنە سەر مەزهەبی ئەرثۆذۆکسیی . ئیتر جگە لە سایەی دەوڵەتی ئومەویی و عەبباسیی و عوثمانیی‌دا هیچ سەربەستییەکی عەقیدەیی و ژیان و گوزەرانی خۆشیان نەبووە

کاتێکیش موحەممەد فاتح ئەستەنبوڵی فتح کرد سەربەستییەکی تەواوی بە ئەرمەن دا، کە لە هەمان کات‌دا هاودینەکانیان لە ژێر ستەمی رووسیادا ئەتلانەوە، کەچیی، کە دەوڵەتی عوثمانیی لاواز کەوت ، ئەرمەن بوونە داردەستی

دوژمنان بە تايبەت رووسيا، و دەستيان دايە ئاژاوە دروست كردن، كاتێكيش كە ئەستەنبوڵ لە لايەن كافرانەوە داگير كرا ئەوان شادمانييان دەربريی .

هەروەها رۆمەكانيش ، لە سايەی دەوڵەتی عوثمانييدا ، ئەوپەری سەربەستييان هەبوو هەتا سوڵتان ( محمد فاتح ) چەند مافێكی جياوازی بەوان دابوو تا دينی خۆيان بە سەربەستيی بپەرستن .

جوولەكە و ئەرمەن رژانە شەقامەكان و بە شەبقەكانيان ئاماژەی سەركەوتنيان بۆ داگيركەران ئەكرد و ، چەپڵەيان بۆ لێ ئەدان و گوڵ بارانيان ئەكردن ..

رۆمەكانيش ئالأی يۆنانيی بچووكيان هەڵ گرت بوو و ، هاواريان ئەكرد زيتۆ ... زيتۆ ، واتە بژيی ، بژيی .

لە ناو هاوار و گالّەی ئەو ناموسڵمانە نامەردانەدا لە يەهوود و ئەرمەن و رۆم، فەرماندەی فەرەنسيی جەنەراڵ ( فرانس ديپەرێس ) بە شەقامی ( بەگ ئۆغلۆ ) دا، بە فيز و دەمارێكەوە ، بەرەو بينای باڵيۆزخانەی فەرەنسيی كەوتبووە رێ و سواری ئەسپێكی سپيی بوو بوو، و بە دەستی ئاماژەی بۆ پێشوازييكەران ئەكرد و لاسايی فەرماندە سەركەوتووەكانی مێژووی ئەكردەوە و ، بێ شەرمانە بە سواريی ئەسپەكەيەوە ئالأی دەوڵەتی عوثمانيی شێلا

بەلأم موسڵمانەكان بە دڵێكی زامداری پر ئێش و ژانەوە سەيری ئەو ديمەنە جەرگ‌برەيان ئەكرد، كە هەرگيز هەڵوێستی وەها بە بيريان‌دا نەهاتبوو و، هەرگيز چاوەروانی زەليليی وەهاشيان نەئەكرد .. فرمێسك لە چاويان‌دا قەتيس مابوو و، بەو هەموو ئێش و ژانەشەوە ئەتلانەوە

چەند رۆژێك دوای داگيركردن هەواڵ بلأو بوويەوە، كە دەسەلأتی داگيركەران لەسەر ئەوە سوورە چەند زەنگێكی كليسا بێنێت و لە مزگەوتی ( ئايا صۆفيا ) دا هەڵيان بواسێت .. هەواڵێكی دڵ تەزێن بوو، چونكە ئايا صۆفيا هێمای سەركەوتن و هێمای فەتحی ئەستەنبوڵ بوو .. ئا لەو كاتەدا سوڵتان ( وحيد الدين ) بەبێ

دەسەلاّت وەك دیلی باڵ بەستراو لە كۆشـكەكەیدا كـزی كردبـوو، و لـە بـەردەم داگیركەراندا جووڵەی نەئەكرد كەچیی، كە ئەو هەواڵەی بیست خۆی پێنەگیرا و نەیتوانی بێدەنگ بێت ، بەڵكو فەرمانی بەسەر یەكەیەكی سەربازیی لە پاسەوانە تایبەتییەكانی خۆیدا دا هەتا برۆن بۆ مزگەوتی ئایا صۆفیا و، نەهێڵن كاری وەها ئەنجام بدرێت ، ئەگەرچیی تاقیان برراوەتەوە

كە داگیركەران ئەم هەڵوێستەیان دیی ، وایان بە چاك زانیی لەو بریارە پەشیمان ببنەوە ، نەوەكو بزووتنەوەیەكی میلليی دروست ببێـت و گرفتیـان بـۆ دروسـت بكات .

دوای داگیركردنی ئەستەنبوڵ فەرمانداەی گشتیی سوپای ئینگلیز دەستی دایە دروست كردن و پەرەپێدانی ناكۆكیی لە نێوان موسـڵمانەكاندا ، هـەتا ئـەوەبوو ( شیخ الإسلام ) و هەندێ زانای تری خەڵەتاند و وای لیٚ كردن دژی یەكتر بدوێن . هەروەها ناجۆریی نێوان كۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) و كۆمەڵەی ( إئتلاف ) ی[١١٠] زیاتر كرد تا بارودۆخ بۆ سەركەوتنی یۆنان بەسەر توركیادا لەبار بێت، ئـا لـەم كاتە ناسكەدا مامۆستا نوورسیی كتێبی ( الخطوات الست ) ی دژی ئینگلیـز و

---

[١١٠] كە دەوڵەتی عوثمانیی لە جەنگی جیهانیی یەكەمدا لە بەردەم هێزی هاوپەیمانەكاندا تێك شكا ، سەرۆك و ناودارەكانی كۆمەڵەی ( إتحاد و ترقي ) بەرەو دەرەوەی ولاّت هەلاّتن، كۆمەڵەی ( إئتلاف ) یـش دوای جـەنگی جیهانیی یەكەم وەك تەوژمێكی سیاسیی دەركەوت، كە دژی ( إتحاد ) یەكان و نۆكەری ئینگلیز بوون .

یۆنان دائەنێت و ، ئەشرەف ئەدیب یش [١١١] چاپی ئـەكات و بـڵاوی ئەكاتـەوە بـەمـە نـەخشەی گڵاوی ئەو فەرماندە ئینگلیزیەیە پووچەڵ ئەكاتەوە . [١١٢]

هەركە فەرماندە ئینگلیزییەكە هاتە ئەستەنبوڵەوە پەیامی ( خطوات ستة ) ی تەسلیم كرا ، كە هێرش ئەكاتە سەریان و ، بیرو بۆ چوونە هەڵەكانیان ئەداتە دواوە و غیرەت ئەخاتە بەردەم موسڵمانان، هەروەها لە چالاكیی ( بدیع الزمان ) ئاگادار كرا، كە چەندە دژی داگیركەرانە

فەرماندەی ئینگلیز هاتە سەر ئەو بریارە، كە مامۆستا لەناو بەرێت ، بەڵام، كە ئاگادار كرا بریاری وەها رقی جـەماوەر هـەڵ ئەسـتێنێ و ، دەسـت ئەدەنـە دژایەتیی، لەو بریارە پاشگەز بوویەوە، بەڵام وازیان لێ نەهێنا

كە فەرماندەكانی ئەنقەرە هەواڵی كاریگەریی ئەو پەیامەیان زانیی و ، زانییان ( بدیع الزمان ) چۆن دەوری كاریگەری دژی داگیركەران دیوە ، دوو جار بانگیـان كرد بۆ ئەنقەرە ، تا پاداشتی ئەو كارە مەردانانەی بدەنەوە، بەڵام مامۆستا وای بە چاك زانیی لە ئەستەنبوڵدا بمێنێتەوە، و نەچوو بە دەم بانگ كردنەكەیانەوە و، پێی وتن :

پێم خۆشە لەو شوێنەدا جیهاد بكەم، كە لە هەموو شوێنێك زیاتر مەترسـیی دارە، نەك لە سەنگەردا .. جا من وەهای ئەبینم، كە ئـەم شـوێنەم لـە ئـەنادۆڵ مەترسییدارترە [١١٣]

---

[١١١] یەكێك بوو، لە موسڵمانە بەغیرەتەكانی ئەو سەردەمە و ، سەرنووسەری گۆڤـاری ( سـبیل الرشـاد ) ی ئیسلامیی بووە . لە ل ٤٥٥ – ٤٥٨ ی ( سیرة ذاتیـة ) دا باسـێكی قەشـەنگی دەربـارەی مامۆسـتا نوورسـیی نووسیوە

[١١٢] لە توركیا دوو حكومەت لەو كاتەدا دامەزرابوون، حكوومەتی عوسمانیی لە ئەستەنبووڵ، كـە لـە ژێـر دەسەڵاتی هاوپەیمانەكان دا بوو، بە تایبەت ئینگلترە و ، حكومەتێكی نیشتمانییش لە ئەنقەرە بە سـەرۆكایەتیی موصطفا كەمال .

## نۆهەم : وەڵامی کەنیسە

کە ئەستەنبوڵ داگیر کرا و ، ئینگلیز تۆپەکانی لە گەرووی ئەستەنبوڵدا تێك شکاند ، لەو رۆژانەدا سەرۆکی قەشەکانی کەنیسەی ئینگلیکیی شەش[١١٤] پرسیاری ئاراستەی مەشیەخەی ئیسلامیی کرد ، لەو کاتەدا حەیدەریی زادە ئیبراهیم ئەفەندیی ( شیخ الاسلام ) بوو، و پرسیارەکانی ئاراستەی ( دار الحكمة الإسلامية ) کرد و ، سەرەرای مامۆستا نوورسیی زانای تریش وەك تەفسیرکار ئیسماعیل حەققیی ئەزمیرلیی و شێخ عەبدولعەزیز چاویش بە درێژە وەڵامیان دایەوە

لەو کاتەدا مامۆستا نوورسییش ئەندامی ( دار الحكمة ) بوو و پرسیارەکانی ئاراستە کران هەتا بە(٦٠٠) شەش‌سەد وشە وەڵامیان بداتەوە

ئەویش لە وەڵامدا وتی : ئەم پرسیارانە نە بە شەش‌سەد وشە و ، نە بە شەش وشە و ، نە بە یەك وشە وەڵام نادرێنەوە ، بەڵکو وەڵامیان یەك تفە ..

چونکە کاتێك، کە ئەو دەوڵەتە ئاوەکانی ئێمەی داگیر کرد و ، دەستی نایە قورگمان وەك ئەبینن ، پێویستە تف بکرێتە ناوچاوی سەرۆکی قەشەکانیان بەرامبەر بەو پرسیارانەی، کە بە هەموو غرووریکەوە پرسیونی .

بۆیە مامۆستا فەرمانی دا تف بکرێتە ناوچاوی پیسی زاڵمان ..[١١٥]

ئەمانەش پرسیارەکانی بوون، کە مامۆستا نوورسیی وەڵامی دابوونەوە :

---

[١١٣] سیرة ذاتية : ١٤٤

[١١٤] لە ( الكلمات ) دا ل٨٩٥ پرسیارەکان دەربارەی چوار شت کراون ، واتە چوار پرسیار بوون .

[١١٥] المكتوبات : ٥٣٨

پرسیاری یەکەم : دینی موحەمەد ﷺ چیە ؟

وەلاَم : قورئانی پیرۆزە، کە بنچینەی مەبەستی چەسپاندن و دامەزراندنی شەش پایەکەی ئیمان و ، قووڵ کردنەوەی پێنج پایەکانی ئیسلامە .

پرسیاری دووهەم : چیی بە فیکر و بە ژیان پیشکەش کردووە ؟

وەلاَم : یەكرایی بە فیکر و ، راستڕەویی بە ژیان پێشکەش کردووە شاهیدیش لە سەر ئەوە فەرمایشتی خوای گەورەیە : ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ و ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ ( هود : ١١٢ ) .

پرسیاری سێهەم : مل ملانێی ئەم چەرخە چۆن چارەسەر ئەکات ؟

وەلاَم : بە حەرام کردنی ریبا و ، فەرزکردنی زەکات ، شاهیدیش بۆ ئەمە فەرمایشتی خوای گەورەیە : ﴿ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ ﴾ ( البقرة : ٢٧٥ ) و ﴿ يَمْحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰا۟ ﴾ ( البقرة : ٧٦ ) ، و ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ ( النور : ٥٦ ) .

پرسیاری چوارەم : ئیسلام چۆن ئەروانێتە ئاژاوە و پشێوییەکانی مرۆڤ ؟

وەلاَم : هەوڵ و کۆشش بناغەیە ، ئەگەرنا سامانی مرۆڤ لە دەستی زاڵماندا کۆ ئەبێتەوە و ، بەشی کەسی لێ نادەن، شاهێدیش فەرمایشتی خوای گەورەیە ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ ( النجم : ٣٩ ) . و ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ( التوبة : ٣٤ ) [١١٦]

[١١٦] الكلمات : ٨٩٥ ، الشعاعات : ٤٧٤

بەشی چوارەم

# لە دایك بوونی سەعیدی نوێ

## یەکەم : هۆشیاریی رۆح و سەرکەوتنی دڵ

مامۆستا باسی ئەو قۆناغەی ژیانی ئەستەنبوڵ ئەکات :

(( کە لە دیلیی گەرامەوە ، لەگەڵ ، ( عەبدورڕەحمان ) ی برازامدا لە کۆشکێکی سەر لووتکەی ( چامڵچە ) لە ئەستەنبوڵ نیشتەجێ بووبووین ئەگونجا ئەو ژیانەی، کە من بەسەرم برد لەلایەنی دنیاوە بۆ ئێمەمانان بە ژیانێکی نموونەیی لە قەڵەم بدرایە ، چونکە لە دیلیی رزگارم بوو بوو، و .. دەرگای هۆیەکانی بلاَوکردنەوە لە ( دار الحكمة الإسلامية ) دا ، بە گوێرەی پیشە و ئەرکی زانستییانەی سەرشانم لەبەر دەممدا خرابوویە سەر پشت و .. شۆرەت و ناوبانگ و رووڵێنانی خەڵکییش بە رادەیەك دەورەیان لێ دابووم، کە من شایستەیان نەبووم و .. لە جوانترین ناوچەی ئەستەنبوڵدا ( چامڵچە ) نیشتەجێ بووبووم و .. هەموو شتێك بۆ من بە گوێرەی دڵ بوو، چونکە ( عەبدورڕەحمان ) ی برازام ـ رەحمەتی خوای لێبێ ـ لە گەڵمدا بوو، کە لەگەڵ ئەوەشدا لەوپەری زیرەکیی و وریاییدا بوو، قوتابییەکی خۆبەختکەر و خزمەتگوزار و نووسەر بوو، هەتا من بە کوڕێکی مەعنەویی خۆمم ئەژمارد

لە کاتێکدا، کە وا هەستم ئەکرد من بەختیارترین مرۆڤم لە جیهاندا ، سەیرێکی ئاوێنەم کرد .. چەند تاڵە موویەکی سپییم لە سەر و ریشمدا بەدیی کردن .. ئەبینم وا ئەو بێدارییە رۆحییەی، کە لە دیلییەکەمدا لە مزگەوتەکەی

( كۆسترما ) هەستم پێ كرد ، خەريكە سەر هەڵ ئەداتەوە . ئيتر منيش دەستم دايە سەنج‌دان و بە وردیی بیرکردنەوە لەو حاڵەتانە، كە بە دڵ وابەستەيان بوو بووم، و واشم ئەزانيی ئەوانە سەرچاوەی بەختياريی دنيان .. جا هەر حاڵەتێك و هەر هۆيەك بە وردیی سەرنجم دابێ ، ئەوا بۆم دەركەوتووە، كە هۆيەكی هيچ و پووچ و دەست برە ، كە شايستەی خۆ پێوە هەڵواسين و پەيوەنديی پێوەكردن نيە .. سەرەرای ئەوەش لەو ماوەيەدا لە دۆستێكی گيانيی بە گيانييمەوە ، كە لە بەوەفاترين دۆستەكانم ئەژمێررا و ، بە شێوەيەكی چاوەروانيی نەكراو ، بە جۆرێك كە بە بیردا نەئەهات ، بێ وەفايی و ناكەسييەكم بۆ دەركەوت .. ئەمە هەر هەمووی بووە هۆی بێزاربوونم و لەبەرچاوكەوتنی ژيانی دنيا ، ئەوەبوو بە خۆمم وت :

ـ تۆ بڵێی من يەكجار خەڵەتاو بم ، وا ئەبينم، كە زۆربەی خەڵك بە چاوی ئاوات پێخواستنەوە سەيری ئەو ژيانەمان ئەكەن، كە لە روانگەی راستييەوە شايستەی شيوەن و گريانە ؟ ئايا ئەو هەمووە خەڵكە شێت و لێوە بوون ؟ يان من خەريكم شێت ئەبم ، بەوەی، كە ئەو دونياپەرستانەم بە شێت و لێوە دێتە بەرچاو؟! بە هەر حاڵ .. ئەو بێدارييە توندەی كە بە بينينی پیریی لە لام سەری هەڵ دا ، وای لێ كردم، كە پێش هەموو شتێك بەفەناچوونی ئەو شتانە ببينم، كە من پەيوەنديم پێيانەوە هەيە و تياچوون و بەفەناچوونيان لێ چاوەروان ئەكرێ ..

پاشان ئاورم بەلای نەفسی خۆمدا دايەوە ، ئەبينم لەوپەری دەسەوسانييدايە ! ئەوەبوو رۆحم ، كە داخوازیی هەميشە مانەوە و بەفەناچوونی هەيە هاوارێكی لێ بەرز بوويەوە و ، دەسەدامێنی شتە فانييەكانيش بوو، و وا وەهمی ئەبرد، كە هەميشە ئەمێنێتەوە هاواری لێ بەرز بوويەوە : (( **مادەم من خۆم بە لاشە فانييم ، ئەبێ بە هيوای چ كەڵكێك بم لەو شتە فانييانە، و مادەم**

دەستەوسانیشم ئەبێ چاوەروانی چیی بم لە دەستەوسانان ؟ کەواتە دەردی من دەرمانی تەنها لای خوای باقیی و سەرمەدیی، و لای خوای خاوەن دەسەلأت و ئەزەلییە )) . ئیتر دەستم دایە گەران و هەواڵ پرسین .. پێش هەموو شتێك بەو زانستانەدا چوومەوە، کە لەوبەر دەستم خستبوون و ، لە دووتوێیان دا بە دوای دڵ دانەوە و ئومێددا ئەگەران .. بەلأم ـ بە داخەوە ـ تا ئەو کاتەش شان بە شانی زانستە ئیسلامییەکان زانستە فەلسەفییەکانیشم وەرگرتبوون ، چونکە بە زەننی خۆم ـ کە زەننێکی یەکجار هەڵە بوو ـ وام دائەنا، کە ئەو زانستە فەلسەفییانە سەرچاوەی پێش کەوتن و کامڵ بوونن و تەوەرەی رۆشنبیریی و رووناك کەرەوەی بیر و فیکرن ، کەچیی ئەو مەسەلە فەلسەفییانە بوون، کە رۆحمیان یەکجار چەپەڵ کرد ، بەڵکو بوونە کۆسپ لەبەردەم بەرزیی مەعنەوییم‌دا

بەڵێ ، کە من لەم حاڵەتەدا بووم ، هەر ئەوەندەم زانیی ، بە سۆز و فەزڵ و بەخشندەیی خوای بالأدەست و بەتوانا ، حیکمەتی پیرۆزی قورئان بە فریامەوە هات .. چڵك و چەپەڵیی ئەو مەسەلە فەلسەفییانەی شۆرد و ـ وەك لە زۆربەی پەیامەکان‌دا روون کراوەتەوە ـ رۆحمی لێیان پاك کردەوە، چونکە ئەو تاریکاییە رۆحییەی کە لە زانستە فەلسەفییەکانەوە هەڵ قولأوە خەریك بوو، رۆحم نوقم بکات و لە نێو بوونەوەران‌دا ونی بکات، جا لەو مەسەلانەدا رووم لە هەر کوێ ئەکرد نە نوور و نە شۆڵەم نەئەبینی و ، نەشم ئەتوانیی پر بە سنگم هەناسە بدەم ، هەتا ئەو نوورە گەشاوەی تەوحید، کە لە قورئانی پیرۆزەوە بەرز ئەبوویەوە و ﴿ لا إله إلا هو ﴾ ی ئەخستە سەر زمان هات و ، ئەو تاریکاییەی لەت و پەت کرد و رەواندیەوە . ئەوەبوو بەوپەری ئاسوودەیی و دڵ متمانەییەوە سنگم کرایەوە و ، هەناسەم هەڵ مژیی .. بەلأم نەفس و شەیتان بە هۆی ئەو ئامۆژگاریی و دەرسانەوە، کە لەلای ئەهلی گومرایی و فەلسەفە وەریان گرتبوون هێرشێکی توند

و تيژيان كردە سەر عەقڵ و دڵم .. ئيتر لەم هێرشەدا بەرابەركێی دەروونيی سەری هەڵ دا ، تا ئەوەبوو ـ سوپاس و منەت بۆ خوا ـ بە سەركەوتن و بردنەوەی دڵ كۆتايی هات )) ..[١١٧]

## دووهەم : هەرەشەی پيريی و يادی مردن

دەربارەی پيرييش ئەڵێت :

(( كاتێك، كە لە بەرەبەيانی پيرييدا ، لە خەوی شەوگاری لاوێتيی بێدار بوومەوە ، بە وردیی سەرنجی خۆمم دا ، ئەبينم وەك ئەوە وايە لە شوێنێكی بەرزەوە بەرەو گوێی قەبر بە پەلە هەنگاو هەڵ بگرم ، بەو شێوەی، كە نيازيی ميصريی[١١٨] وەسفی كردووە، كە ئەڵێت :

بناء العمر يذوي حجراً إثر حجر     غافلاً يغط الروح وبناؤه قد اندثر[١١٩]

جا ئەو لاشەيەی، كە ماوای رۆحمە ، بە درێژايی رۆژگار يەك لە دوای يەك بەردەكانی داكەوتن و ، ئەو هيوايانەشم، كە بە توندیی منيان بە دنياوە بەستبوويەوە ، هەموو تێك شكان و پچر پچر بوون، بۆيە هەستم بە نزيك

---

[١١٧] پەيامی پيران : ٣١ ـ ٣٣

[١١٨] نيازيی ميصريی : شاعيرێكی توركيی صۆفييە . ( ١٦١٨ ـ ١٦٩٤ ) ، لە گوندێكی نزيكی ( ملاطيە ) لە دايك بووە، خوێندنی لە ئەزهەری شەريف تەواو كردووە ، لەبەر ئەوە نازناوی ( ميصريی ) لێ نراوە .. ديوانێكی شيعر و چەند دانراوێكی هەيە ، كە لەوانە : ( رسالة الحسنين ، موائد العرفان و عوائد الإحسان، وهداية الإخوان ) . لە قوتابخانە زانستييەكانی ئەستەنبوڵدا دەستی بە ( ئيرشاد ) كردووە . ـ وەرگێڕی عەرەبيی .

[١١٩] شاعير دەری ئەبڕێ كەوا بينای تەمەنی لە ڕووخاندايە و بەردەكانی يەكتر ئەڕووخێنن ، خۆيشی بێ ئاگايە و لە پرخەی خەودايە و وا بيناكەشی مەحو بوويەوە . ـ وەرگێڕ .

بوونەوەی کاتی لێکدابرانم لە خۆشەویست و دۆستانێکی لەژمارە نەهاتوو کرد و ، دەستم دایە گەران بە دوای تیماری ئەم زامە قووڵە مەعنەوییەدا، کە وەك دەر نەکەوێ ئومێدی ئەوەی لێ ناکرێ دەرمانێکی شیفابەخشی ببێت ! ئەوەبوو نەم توانیی چارەسەرییەکی بۆ بدۆزمەوە ، دیسان وەك نیازیی میصریی منیش وتم :

حكمة الإله تقضي فناء الجسد والقلب تواق إلى الأبد

لهف نفسي من بلاء وكمد حار لقمان في إيجاد الضمد [١٢٠]

کە من لەم حاڵەتەدا بووم ، لە پرێكدا نووری پێغەمبەری بەرێز ﷺ ، کە رەحمەتی خوایە و بەسەر ( عالمین ) دا باریوە و ، نموونەی ئەو سۆزەیە، کە دەری ئەبرێ و ، بانگەوازکەرە بۆ لای و ، زمانی ئەو رەحمەتەشە .. لە پرێكدا شەفاعەتەکەشی و ، ئەو دیارییەش، کە بۆ هیدایەتی مرۆڤایەتیی هێنا ، بوونە دەرمانێکی شیفابەخش و دەوایەکی زۆر سەرکەوتوو بۆ ئەو دەردە قورسەی، کە وام ئەزانیی دەرمانی نیە و ، ئەو هیوابرینە یەکجار رەشەش، کە دەوری دابووم گۆرییان بۆ ئومێدێکی پرنووری گەشاوە )) .. [١٢١]

(( کاتێك، کە پێم نایە ناو دەرگای پیرییەوە ، تەندروستیی لەشیشم ، کە جڵەو بۆ غەفڵەت و بێئاگایی شل ئەکات و کۆمەکیی ئەکات ، شێوا بوو .. ئیتر ئەوەبوو پیریی و نەخۆشیی هەردووك لەسەر ئەوە یەکیان گرت، کە هێرش بکەنە سەرم و ، تا ئێستاش هەردووکیان پێکەوە جار لە دوای جار بە تەوقەسەرمدا ئەکێشن ، تا

[١٢٠] شاعیر دەری ئەبرێ حیکمەتی پەروەردگار بەو جۆرەیە، کە لاشە فانیی بێ ، کەچیی دڵیش حەزی لە ژیانی هەمیشەیی و هەتا هەتاییە و ، دەروونیشی بە دەست بەڵا و خەم و خەفەتەوە تووشی نەخۆشییەکی وەها بووە، کە لوقمانی حەکیمیش لە دۆزینەوەی چارەسەریدا سەرسام بووە . ـ وەرگێڕ .

[١٢١] پەیامی پیران : ٥ ـ ٦

ئەوەبوو خەوی غەفڵەتیان لێم دوور خستەوە، منیش لە ماڵ و منداڵ و وێنەیان هیچ شتێکم نەبوو تا بە دنیاوە پەیوەستم بکەن ، لەبەر ئەوە ئەبینم وا دەستهاتی ئەو تەمەنەم، کە بە بێئاگایی لاوێتیی لە دەستمدا بریتییە لە: گوناه و تاوانەکان، ئیتر ئەوەبوو منیش بە شێوەی هاوارکردنەکەی ( نیازیی میصریی ) هاوارم کرد :

تەمەنم بە با چوو و ، هیچم لێی دەست نەکەوت ..
هاتم و رێگام گرتە بەر ، بەڵام
کاروان باری کرد و دوور کەوتەوە
منیش مامەوە
منی تەنیا و غەریب
دەستم بە گریان کرد
ویستم بە تەنیا و بە سەرگەردانیی رێ ببڕم و ،
چاوەکانیشم بووبوونە جۆگەلەی فرمێسك و ،
سنگیشم بە تاسەوە ئەبرژا
ئیتر عەقڵم سەرسام ما !

ئەو کاتە لە غەریبییەکی سەختدا ئەتلامەوە .. ئەوەبوو بۆ لە دەست چوونی تەمەنم هەستم بە خەفەتێکی هیوابڕ و ، داخێکی پڕ لە پەشیمانیی و ، هەناسە ساردییەکی پڕ ژان کرد لە قووڵایی دڵمەوە هاوارم کرد و داوای کۆمەکیی و یارمەتیی و ، رووناکیی ئۆمێدم ئەکرد .. لە پڕێکدا قورئانی پیرۆزی خاوەن موعجیزە کۆمەکیی بۆ ناردم و ، هات بە هانامەوە و دەرگای ئۆمێدێکی مەزنی لەبەر دەممدا خستە سەر پشت و ، نوورێکی گەشاوەی هیوا و ئۆمێدی وەهای

پێشکەش کردم، کە بتوانێ چەند قات چەند قاتی بێ هیواییەکەم لەناو بەرێت و، بۆی بکرێ ئەو تاریکییە یەکجار ڕەشانەی دەوروبەرم بڕەوێنێتەوە )) .. [١٢٢]

(( کاتێك، کە چەند تاڵە موویەکی سەرم سپیی بوون، کە نیشانەی پیرییە و ، ترس و بیمی جەنگی جیهانی یەکەم و ئەو شوێنەوارە قووڵەی، کە دیل بوونم لە دەستی رووس دا کردیە سەر ژیانم ، خەوی بێ ئاگایی لاوییمیان قورس‌تر کرد، دوا بە دوای ئەوەش کە لە دیلیی گەرامەوە ئەستەنبووڵ چ لە لایەن خەلیفەوە ، یان ( شیخ الاسلام ) ەوە ، یان فەرماندەی گشتییەوە ، یان لە لایەن قوتابیانی زانستە شەرعییەکانەوە پێشوازییەکی گەرم و گورم لێ کرا و ، زیاتر لەوەش کە من شایانم ڕێزم لێگیرا .. ئەمە هەموو ، سەرەرای مەستیی و بێ ئاگایی لاویی، حاڵەتێکی ڕۆحیی بۆ دروست کردم و ، ئەو خەوەشی زیاتر لەلام قورس کرد، بە رادەیەك، کە وام ئەزانی دنیا هەمیشەیی و باقییە و ، خۆیشم لە حاڵەتێکی سەیردا بینی، کە وەها باوەشم بە دنیادا کرد بوو هەروەك نەمرم .

ئا لەم کاتەدا ، ڕۆیشتم بۆ مزگەوتی بایەزید لە ئەستەنبووڵ ، ئەمەش لە مانگی رەمەزانی پیرۆزدا بوو، تا لە دەمی قورئان خوێنە خاوەن ئیخلاصەکان قورئانی پیرۆز ببیستم .. لە زمانی ئەو قورئان خوێنانەوە گوێم لەو فەرمایشتە بەرزەی ئاسمان بوو، کە قورئانی خاوەن موعجیزە ، بەوپەری هێز و توندییەوە ، دەربارەی مردن و نەمانی مرۆڤ و ، کار تەواوکردنی هەموو گیان‌دارێك و مردنی رایگەیاند ، ئەوەش بە پێی دەقی ئایەتی پیرۆز : ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِ ﴾ (آل عمران : ١٨٥ ) .

---

[١٢٢] پەیامی پیران : ٧ ـ ٨ .

ئەم راگەياندنە توند و بەهێزە لە پەردەی گوێمەوە تێپەری و هەموو چینە چڕ و ئەستوورەکانی خەو و بێئاگایی و مەستییمی بریی و لە قوڵایی ناوجەرگەی دڵمدا نیشتەجێ بوو ..

لە مزگەوت هاتمە دەرەوە و ، بۆ ماوەی چەند رۆژێك وەهام ئەزانی، کە گەردەلوولێکی گەورە لە سەرم دا گر ئەگرێت و ، ئەو خەوە قووڵەی، کە ماوەیەکی دوور و درێژە تیامدا جێگیر بووە، لە ناوی ئەبات، و خۆشم وەك کەشتییەك ئەهاتە پێش چاو، کە لە نێوان شەپۆلەکانی دەریادا سەرگەردان بوویێت و قیبلەنوماکەشی تێك چوو بێت .. دەروونیشم بە ئاگرێکی چەرە دووکەڵاویی هەڵ ئەقرچا و ، هەرچیی سەیری ئاوێنەشم ئەکرد ، مووە سپییەکان پێیان ئەوتم : وریا بە !!!

بەڵێ ، بە پەیدابوونی ئەو مووە سپییانە و وریا کردنەوەیان هەموو شتێکم لە لا رۆشن بوویەوە ، چونکە بۆم دەرکەوت ئەو لاوێتییەی، کە زۆرم ئەنازیی پێیدا ، بگرە شەیدای تام و چێژی بووم بووم ، پێم ئەڵێ : خواحافیز ! هەروەها ئەو ژیانی دنیایەی، کە من بەندی خۆشەویستیی بوو بووم بەرە بەرە دەستی بە کوژانەوە کرد، و ئەو دنیایەش، کە من دەستەدامێنی بوو بووم ، بگرە بۆی بەتاسەوە بووم و شەیداشی بوو بووم ، ئەبینم پێم ئەڵێ : خواحافیز !! خواحافیز !! بەمە تێی گەیاندم کە من لەم خانەی میوان دارییە کۆچ ئەکەم و ، بەم نزیکانەش بە جێی ئەهێڵم .. هەروەها ئەم بینی دنیا خۆیشی ئەڵێت : خواحافیز و ، خۆی ئامادەی کۆچ کردن ئەکات . ئەوەبوو هەمەکییەتیی و گشتگیریی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە : ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾ ئەو مانایەی، کە وا تییدا لە رووی دڵمدا کرایەوە، کە ئەمەیە :

تێکرای مرۆڤایەتیی وەك یەك نەفس وەهان و ، ئەبێ بمرن تا سەر لە نوێ زیندوو بکرێنەوە .. هەروەها گۆی زەوییش نەفسێکە و هەر ئەبێ بمرێت و تیا

بچێت ، تا شێوەی هەمیشە مانەوە و وێنەی نەمریی وەرگرێت .. هەروەها دنیاش نەفسێکە و ئەمرێت و بەسەر ئەچێت تا لە شێوەی ( ئاخیرەت ) دا دروست ببێتەوە

بیرم لەو بارە کردەوە، کە منی تێدام ، ئەبینم :

ئەو لاوێتییەی، کە خولگەی چێژ و لەزەتەکانە ، وا خەریکە بەرەو نەمان ئەچێت و، شوێن بۆ ئەو پیرییە چۆڵ ئەکات، کە کانگای هەموو خەم و خەفەتێکە و، ئەم ژیانە پرشنگدار و گەشاوەیەش لە کۆچ کردن دایە و ، مەرگی تاریك و ترسناکیش ـ بە رواڵەت ـ خۆی بۆ ئەوە ئامادە ئەکات، کە شوێنی ژیان بگرێتەوە

دنیاشم ئەبینی، کە خۆشەویست و شیرینە و بێ ئاگایان شەیدای بوون، و واش ئەزانرێ، کە هەمیشەییە ، ئەم بینی بە پەلە بەرەو نەمان ئەڕوات .. جا بۆ ئەوەی نوقمی ناو بێ ئاگایی ببم و ، خۆم بخەڵەتێنم رووم کرد بە لای چێژەکانی ئەو پایە و پلە بەرزە کۆمەڵایەتییانەوە کە لە ئەستەنبوڵدا دەستم کەوتن و ، نەفسم پێیان خەڵەتا و، ئەوەندە خۆشیی دەربڕین و ڕێز و دڵ دانەوە و رووتێ کردن و دڵ پێ خۆش بوونی خەڵکییان تێدا بوو، کە لە شان هەڵ گرتنی من زیاتر بوون .. ئەبینم هەموو ئەمانە تا دەرگای ئەو قەبرەی، کە لێمەوە نزیکە دێن و ، لەوێ ئەکوژێنەوە

هەروەها ئەم بینی، کە ریایەکی رەزا قورس و ، خۆپەرستییەکی سارد و سڕ و، بێئاگاییەکی کاتیی لە ژێر ئەو پەردە رازاوەیەی ناو و ناوبانگییدا خۆی حەشار داوە، کە بەرزترین ئاواتی ئەهلی شۆرەت و شەیدایانیەتی .. ئیتر تێ گەیشتم، کە ئەم شتانەی هەتا ئێستا منیان خەڵەتاندووە هیچ دڵ خۆشییەکم پێ نابەخشن و، شۆڵەیەکی نووریشم لێیانەوە دەست گیر نابێت .

جا بۆ ئەوەی لەو بێ ئاگاییەم جارێکی تر بەخەبەر بێم و بە یەکجاریی لێی بێدار ببمەوە ، گوێم لەو قورئان خوێنە بەرێزانەی مزگەوتی (( بایەزید )) گرت تا دەرسی ئاسمانیی قورئانی پیرۆز وەربگرم .. ئیتر ئەوەبوو مژدەکانی ئەو برایەتیە ئاسمانیەم لە دوو توێی پەروەردگارییە پیرۆزەکانی فەرمایشتی خوای گەورە ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟.. ﴾ . ( البقرة : ٢٥ ) ەوە بیستن ..

ئەوەبوو بەو بەرەکەتەی کە لە قورئانی پیرۆزەوە دەستم کەوت ، بە دوای دڵ دانەوە و ئومێد و نووردا ئەگەرام ، ئەویش لەو کارانەدا، کە سەرم لێیان سوور ئەما و سەرسامیان کردبووم و ، هیوا برراو و بێ کەسیان خستبووم ، نەك لە هیچ کارێکی تردا جا هەزار و یەك شوکرانە بۆ بەدیهێنەری بەخشندەم، کە کۆمەکیی کردم تا هەر لە دەردەکەدا دەرمان بدۆزمەوە و ، لە تاریکیش‌دا ڕووناکیی ببینم و ، لە خودی ئازار و ترس و لەرزیش‌دا هەست بە دڵدانەوە بکەم .

یەکەم جار سەیرێکی ئەو روخسارەم کرد، کە هەموان ئەترسێنێ و ، دەرئەکەوێ کە زۆر سامناکە کە ئەویش روخساری (( مردن )) ە .. ئەوەبوو بە هۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بۆم دەرکەوت، کە روخساری راستەقینەی مردن بەش بە حاڵی ئیمان داران روخسارێکی گەشاوەی نوورانییە ، هەرچەندە رووی دەرەوەی تاریکە و، بە پەردەیەکی رەشی ناشیرینی سامناکیش داپۆشراوە .. جا لە زۆربەی پەیامەکان‌دا ئەم راستییەمان بە شێوەیەکی گومان بڕ چەسپاندووە و روون کردۆتەوە ، بە تایبەت لە (( وتەی هەشتەم )) و (( مەکتووبی بیستەم )) دا ، کە مردن لە ناودانی یەکجاریی و ، لێك دابرانی هەتا هەتایی نیە ، بەڵکو پێشەکیی و سەرەتا و دەست پێکردنی ژیانی هەتا هەتایی و ، کۆتایی هێنان و پشوودان و حەسانەوە و دەست هەڵ گرتنە لە ئەرك و مەینەتی کار و فەرمان‌بەریی ژیان و ، بریتییە لە شوێن گۆڕین و ، هەروەها بە یەك گەیشتنەوەیە لەگەڵ ئەو دۆست و

خۆشەویستانەدا، کە بۆ جیهانی بەرزەخ کۆچیان کردووە .. ئا بەم شێوەیە .. بە وێنەی ئەم راستییانە روخساری جوانی گەشاوەی مردنم بینیی .. دیارە بە ترس و لەرزەوە سەیرم نەکرد ، بەڵکو ـ لە لایەنێکەوە ـ بە جۆرە تاسەمەندییەکەوە سەیرم کرد ، ئیتر ئەوەبوو لەو کاتەدا یەکێ لە نهێنییەکانی (( رابطة الموت )) م بۆ دەرکەوت، کە پەیرەوانی تەریقەتەکانی ( تصوف ) بە جێی ئەهێنن ..

پاشان لە (( سەردەمی لاویی )) ورد بوومەوە ، ئەبینم بە نەمان و بەسەرچوونی، هەمووان خەمبار ئەکات و، واش لە هەمووان ئەکات، کە بۆی تاسەمەند بن و پێی دڵ خۆش بن و ، ئەو سەردەمەیە، کە بە غەفڵەت و تاوان کردنەوە بەسەر ئەچێ ئەوەبوو لاوێتیی منیش بەو شێوەیە بەسەر چوو! سەیرم کرد روخسارێکی زۆر ناشیرین ، بگرە مەست و سەرسام لە ژێر ئەو بەرگە رازاوە بریقەدارەدا دیارە ، کە بەسەریا کێشراوە خۆ ئەگەر پەیم بە راستیی لاویی بردایە ئەوا سەرانسەری ژیانی دنیام ، ئەگەرچیی صەدساڵیش بژیامابایە ، ئەیگریاندم و خەم و خەفەتی پێ ئەچەشتم ، ئەویش بەرامبەر بە چەند ساڵێك، کە بە خۆشیی و پێکەنینەوە بەسەر ببرێت ، وەك ئەو شاعیرەی کە بەوپەری ئاه و حەسرەتەوە بۆ سەردەمی لاوێتیی خۆی ئەگریی و ئەڵێت :

ألا ليتَ الشبابُ يَعودُ يوماً فَأُخبِرُهُ بِما فَعَلَ المَشيبُ [١٢٣]

بەڵێ ، ئەو پیرانەی، کە لە نهێنیی و چیەتیی لاوێتیی نەگەیشتوون ، ئەوا وەك ئەم شاعیرە سەردەمی پیرییان بە داخ و خەفەت و گریە شیوەنەوە بۆ سەردەمی لاوێتییان بەسەر ئەبەن .. لە راستییشدا ئەگەر لێهاتوویی و گەشاوەیی تافی

---

[١٢٣] شاعیر هەناسە هەڵ ئەکێشێ و ناوات ئەخوازێ، کە رۆژێ لە رۆژان سەردەمی لاوێتیی ئەگەرایەوە هەتا شکاتی لە پیریی بکردایە، کە چیی پێ کردووە .

لاویی لە دڵی ئیمان‌دارێکی ئاسوودەی ژێری دڵ دامەزراوی بەویقاردا جێی خۆی بکاتەوە و ، وزە و هێزی لاوەکان روویـان لـە خواپەرسـتیی و کـردەوەی چـاك و بازرگانیی قیامەت بنرێت ، ئەوا ئەبنە گەورەترین هێزی خێر و چاکترین رێ بۆ ئەو بازرگانییە ، جوان‌ترین و بگرە بەلەزەتترین هۆ بۆ ئەنجام‌دانی کردەوە چاکەکان .

بەڵێ ، لە راستییدا بۆ کەسێك، کە ئەرکی موسڵمانانەی سەرشانی خۆی بزانێ و ، سەردەمی لاویی خراپ بەکار نـەهێنێ ، ئـەوا ئـەو سـەردەمە زۆر بـەنرخ و بەبەهایە و ، نیعمەتێکی خوایی مەزنە و ، کەیف و خۆشییەکی بەلەزەتە ، بەڵام لاوێتییەك، کە رەوشت جوانیی و ، داوێن پاکیی و تەقوای لەگەڵ دا بێت ، ئـەوا چەندین چەرمەسەریی سامناکی لە رێدا ئەبێت .. چونکە هەڵەشـەیی و هـەوا و ئارەزووەکانی ئەبنە مایەی لەدەست‌دانـی بەختـەوەریی هەمیشـەیی و ، ژیـانی قیامەتی ئەو کەسە و ، لەوانەیە ژیانی دنیاشی لە نـاو ببـەن و ، بـە درێـژایی تەمەنی پیریی و پەك کەوتەییشی ، بە هۆی چێژ و لەزەتی چەند ساڵێکەوە ، ئێش و ئازارێکی پڕ خەفەتی دەرخوارد ئەدەن ..

جا لەبەر ئەوەی، کە سەردەمی لاویی زۆربەی خەڵکیی بێ زەرەر و زیان بەسەر نابرێت، ئەوا ئێمەی پیران لەسەرمان پێویستە شوکرانەیەکی زۆری خوا بکەین کەوا لە چەرمەسەریی و زەرەر و زیانی لاوێتیی رزگاری کردووین .. خۆ دیارە و گومانی تێدا نیە، کە لەزەتی لاوێتیی ، وەك هەموو شتێکی تر ، لـەناو ئەچـێت .. جـا ئەگەر سەردەمی لاوێتیی رووی لە خواپەرستیی بکرێـت و ، لـە پێنـاوی خێـر و چاکەدا بەخت بکرێت ، ئەوا بەروبوومێکی نـەبراوە و هـەتا هـەتایی پێشـکەش ئەکات و ، ئەش بێتە هۆی بەدەست هێنانی لاوێتییەکی هەمیشەیی و بەردەوام لە ژیانێکی هەتاهەتاییدا

پاشان سەیرێکی ئەم دنیایەم کرد، کە زۆربەی خەڵکیی شەیدای بوون و ، گیرۆدەی داوی بوون ، بە هۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بۆم دەرکەوت، کە سێ دنیای هەمەکیی هەن و ، چوون بە ناو یەکدا :

یەکەم : ئەو دنیایەیە، کە ئەروانێتە ناوە جوانەکانی خوا و ، ئاوێنەی ئەو ناوانەیە

دووهەم : ئەو دنیایەیە، کە ئەروانێتە قیامەت و ، کێڵگەیەتی .

سێهەم : ئەو دنیایەیە، کە ئەروانێتە دنیاویستان و ئەهلی گومرایی و ، جێ یاریی و گاڵتە و رابواردنی بێ ئاگایانە ..

هەروەها بۆم دەرکەوت کە هەر کەسێك لەم دنیادا دنیایەکی مەزن و تایبەتیی خۆی هەیە کەواتە ئەوەندە ژمارەی مرۆڤەکان دنیای بە ناو یەکدا چوو هەن .. بەڵام دنیای هەموو کەسێك بریتییە: لە ژیانە تایبەتییەکەی خۆی، ئیتر هەر کاتێك لاشەی کەسێك تێك شکا ئەوا دنیاکەشی ئەرووخێ و قیامەتی دەست پێ ئەکات جا لەبەر ئەوەی بێ ئاگایان بەو پەلە و ناخلۆفییە هەست بە رووخانی دنیا تایبەتییەکەیان ناکەن، ئەوا شەیدای ئەبن و ، وا ئەزانن ئەو دنیا تایبەتییەی ئەوان وەك دنیا گشتییە دامەزراوەکەی دەوروبەریان وەهایە

منیش ورد بوومەوە و وتم : بێ گومان منیش دنیایەکی تایبەتیی خۆمم ـ بە وێنەی دنیای کەسانی تر ـ هەیە، کە بە خێرایی ئەرووخێ .. دەی کەواتە ئەم دنیا تایبەتییە لەم تەمەنە یەکجار کورتەمدا ، ئەبێ کەڵکی کامە بێ ؟ ئەوەبوو بە هۆی نووری قورئانی پیرۆزەوە بۆم دەرکەوت، کە ئەم دنیایە ـ بەش بە حاڵی منیش و غەیری منیش فرۆشگایەکی کاتیی و ، میوانخانەیەکە، کە هەموو رۆژێ خەڵك پۆل پۆل دێن و پۆل پۆل چۆڵی ئەکەن .. ئەم دنیایە بازارێکە بۆ بازرگانیی هات و چۆکەران لە سەرە رێیاندا بەرپا کراوە .. ئەم دنیایە کتێبێکی کراوەی خوای گەورەیە، کە نوێ ئەبێتەوە ، بەوەی، کە خوای گەورە بە حیکمەتی خۆی ئەوەی بیەوێ تێیدا ئەی کوژێنێتەوە و ئەوەش بیەوێ ئەی هێڵێتەوە .. ئەم دنیایە هەموو

بەهارێکی نامەیەکی بە زێـر هۆنراوەیــە و ، هــەموو هاوینێکیشــی چـامەیەکی هــۆنراوەی قەشــەنگە .. ئــەم دنیایــە چــەندین ئاوێنــەن، کــە نــوێ ئەبنــەوە و درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی دروست کەری مەزن دەرئەخەن .. ئەم دنیایە کێڵگە و باخچەی نەمامەکانی قیامەتە و ، گوڵدانی سـۆز و رەحمــەتی خواییــە .. ئــەم دنیایە کارگەیەکی کاتییە بۆ ئامادەکردنی تابلۆ پەروەردگارییە هەمیشەییەکان، کە لە جیهانی هەمیشە مانەوە و نەمرییدا دەرئەکەون .. ئیتر سوپاسێکی زۆر و زەبەندەی خوای بەدیهێنەری بەخشندەم کرد وا دنیای بەم شێوەیە بەدیی هێناوە بەڵام ئەو مرۆڤەی، کە خۆش‌ویستنی هەردوو رووە راستەقینە جوان و بەتامەکەی دنیای پێ بەخشرا بێ، کە دەروانننە ناوە جوانەکانی خـوا و دەروانننــە قیامــەت، کاتێك، کە ئەو خۆش‌ویستنەی لە جێی خۆیدا بەکار هێنا ، نیشانەکەی نەپێکا و کەوتە هەڵەوە .. ئەوەبوو رووی ئەو خۆش‌ویستنەی لە رووە فانییە ناشیرینە بــێ ئاگا و زیان‌بەخشەکەی دنیا نا ، تا کەوتــە بــەر بریــاری فــەرموودەی شــەریف : (( حُبُّ الدُّنيا رَأْسُ كُلِّ خَطِيئَةٍ )) .[١٢٤]

---

[١٢٤] ئەفەرموێ : خۆش ویستنی دنیا بناغەی هەموو تاوانێکە، رواه البيهقي في الشعب بإسناد حسن إلى الحسن البصري رفعه مرسلاً ، وذكر الديلمي في الفردوس وتبعه ولده بلا سند عن علي رفعه ، قال إبن الفرس : الحديث ضعيف، ورواه البيهقي أيضاً في الزهد وأبونعيم من قول عيسى إبن مريم وآخرون يعدونه من كلام إبن مسعودأو جندب البجلي رضي الله عنهم ، أنظر تفصيله في كشف الخفاء ١٠٩٩ وتخريج الإحياء للعراقي والدرر المنتثرة ٩٧ وحلية الأولياء ٦ / ٣٨٨ والمشكاة ٥٢١٢٥ والأحاديث المشكلة ص١٢١ وأحاديث القصاص برقم ٧ وضعيف الجامع الصغير وزيادته ٢٦٨١ . پەیامی پیران : ١٨ ـ ٢٣

## سێهەم : ڕێنمایی قورئانی پیرۆز

**دەربارەی ئامۆژگاریی شێخی گەیلانییش ئەڵێت :**

(( دوای ئەوەی، کە لە دیلیی گەرامەوە ، بە درێژایی ئەو دوو ساڵەی ژیانی ئەستەنبوڵم جارێکی تر غەفڵەت و بێ ئاگایی سەری تێ کردمەوە .. ئەوەبوو بار و تەوژمەکانی سیاسەت لەوە لایان دام، کە سەرنجێکی خۆم بگرم و ، مێشك و بیریشمیان پەرتەوازە کرد

ڕۆژێکیان، کە لە شوێنێکی بەرزی قەبرستانی ئەبوئەییووبی ئەنصارییدا ـ خوا لێی ڕازیی بێ ـ کە بەسەر دۆڵێکی قووڵدا ئەی ڕوانیی ، دانیشتبووم و ، سەرنجی ئاسۆکانی سەرکەلی دەوروبەری ئەستەنبوڵم ئەدا ، لە ناکاو دنیا تایبەتییەکەی خۆمم وەها هاتە پێش چاو، کە لە سەرەمەرگدا بێت ، بە ڕادەیەك کە ـ بە ئەندیشە ـ وەهام هەست ئەکرد، کە لە هەندێ لامەوە ڕۆحم ئەکێشرێت .. منیش وتم : تۆ بڵێی نووسراوەکانی سەر کێلی ئەم قەبرانە بۆ ئەم جۆرە ئەندیشەیە هانیان دابم ؟

چاوم لە دەرەوە و ئاسۆ دوورەکان کلا کرد و ، بە وردیی چاوم برییە قەبرستانەکە و، ئەوەبوو ئەمەم بە دڵدا هات : (( ئەم قەبرستانەی چواردەورت صەد ئەستەنبوڵی تێدایە ! بە واتا صەد جار ئەستەنبوڵی تێ هەڵ ڕێژراوە ، کەواتە تۆیش بە تەنیا لە حوکمی ئەو حاکمە بەتوانایە، کە هەر هەمووی دانیشتوانی ئەستەنبوڵی لێرەدا هەڵ ڕێژاوە ، جیا ناکرێتەوە .. چار نیە و تۆیش وەك ئەوان ئەبێ کۆچ بکەیت .. ! ))

بەم خەیاڵە سامناکەوە قەبرستانەکەم بەجێ هێشت و ، چوومە ناو ئەو ژوورە بچکۆلەی مزگەوتی ئەبوئەییووبی ئەنصارییەوە ـ خوا لێی ڕازیی بێ ـ کە لەوەو پێش جار لە دوای جار ئەچوومە ناویەوە و ، بە قووڵیی بیرم لە نەفسی خۆم

کردەوە، ئەبینم، من میوانم ! لە سێ رووەوە میـوانم ، هـەروەك مـن لـەم ژوورە بچکۆلەدا میوانم ، ئەوا لە ئەستەنبوڵیش‌دا میوانم و ، بگرە لە دنیـایش‌دا هـەر میوانم و بەجێیشی ئەهێڵم و پێویستە میوانیش بیرێك لـە رێ و سـەفەری خـۆی بکاتەوە

بەڵێ ، هەروەك لەم ژوورەدا ئەچمە دەرەوە و بەجێی ئەهێڵم ، ئەوا رۆژێك لـە رۆژان لە ئەستەنبوڵیش دەرئەچم و بەجێی ئەهێڵم و ، هەروەها رۆژێکیش دێت، کە دنیا بەجێ بهێڵم

بەم شێوەیە ، کە من لەم حاڵەدا بووم ، حاڵەتێکی پڕ ئێش و ژان و خەمبار و لێڵ دڵ و بیرمی داگیر کردن .. سەیریش نیە، چونکە من چـەند خۆشەویسـتێکی کەم بەجێ ناهێڵم و بەس ، بەڵکو هەزارەها خۆشەویستیش لە ئەستەنبوڵدا بەجێ ئەهێڵم ، بگرە ئەستەنبوڵی خۆشەویستیش خۆی بە جێ ئـەهێڵم و ، لـە صـەدان هەزار لە خۆشەویستانیش دائەبڕێم ، هەروەك ئەم دنیا جوانەش، کە پێی تـاقیی ئەکرێینەوە بەجێ ئەهێڵم ..

جارێکی تر سەرکەوتمەوە سەر هەمان بەرزاریی قەبرستانەکە و ، دانیشـتوانی ئەستەنبوڵم بە شێوەی جەنازە، کە بە پێوە بەرێوە بچن بۆ دەرکەوتن ، هەروەك لە فیلمە سـینەماییەکان‌دا مـردووان لـە شـێوەی کەسـانێکی جـم و جـووڵ کـەردا دەرئەکەون .. ئەوەبوو منیش جار بـە جـار بـۆ پەنـد و ئامۆژگـاریی ئەچـوومە سەیریان ! خەیاڵم پێـی وتم : مـادەم بەشـێك لەمانـەی، کـە لـەم قەبرسـتانەدا نووستوون، ئـەگونجێ وەك ئەوانـەی فیلمـە سـینەماییەکان بـە جـم و جووڵـەوە دەربکەون ، دەی وەها بیر بکـەرەوە کـە ئـەو خەڵکـەش بـە حـەتمیی دێنـە نـاو قەبرستانەوە و ، هەر لە ئێستەوە وایان دابنێ، کە هاتوونەتە ناویەوە ..

لە کاتێکدا، کە لەم حاڵەتە خەمبارە پڕ ئێش و ژانەدا ئەتلامەوە ، لە ناکاو نوورێکی قورئانی حەکیم ، بە رابەریی شێخی گەیلانیی ( قدس سره ) ئەو حاڵەتە خەمبارەی هەڵ گێڕایەوە و بە حاڵەتێکی شادمان و گەشاوەی ، خۆش و بەلەزەتی گۆڕیی، ئەوەبوو ئەو نوورەی، کە لە قورئانی پیرۆزەوە بۆم هات ئاگاداری کردم و ئەمەی خوارەوەی خستەوە یادم :

کاتێك، کە لە ( کۆسترما ) لە باکووری خۆرهەڵاتی رووسیا دیل بوویت لە ناو ئەفسەرە دیلەکاندا یەك دوو دۆستت هەبوون و ، بە حەتمیی ئەشتزانیی هەردووکیان ئەگەرێنەوە بۆ ئەستەنبوڵ، جا ئەگەر یەکێکیان تۆی سەرپشك بکردایە و بی وتایە ئایا ئەگەڕێیتەوە بۆ ئەستەنبوڵ یان ئەتەوێ لێرە بمێنیتەوە ؟ بێ گومان ئەگەر تۆش تۆسقاڵێك ژیرییت ببێ ، ئەوا بە خۆشیی و شادمانییەوە گەرانەوە بۆ ئەستەنبوڵ هەڵ ئەبژێریت ، چونکە لە نێوان هەزار و یەك خۆشەویستتدا ئێستە نۆصەد و نەوەد و نۆیان لە ئەستەنبوڵدان و ، جگە لە یەك دوو خۆشەویست کەست لێرە نیە و ، ئەوانیش بۆ ئەوێ کۆچ ئەکەن .. کەواتە گەرانەوە بۆ ئەستەنبوڵ بۆ کەسێکی وەك تۆ نابێ مایەی خەفەت و ئازار بێت .. ئا ئەوەتای گەراویتەوە ئەستەنبوڵ ، ئایا رازیی نەبوویت و شوکری خوات نەکرد ؟ وا لە وڵاتی دوژمنان و ، لە شەوە دوور و درێژە تاریکەکانی و ، لە زستانە سەخت و ساردەکەی رزگارت بوو، و گەرایتەوە ئەستەنبوڵی رازاوەی جوان ، کە ئەڵێی بەهەشتی سەرزەمینە ! بە هەمان شێوەش لە صەدا نەوەد و نۆی ئەوانەی، کە لە منداڵییتەوە هەتا ئێستا خۆشت ویستوون کۆچیان کرد بۆ ئەو قەبرستانەی، کە بە سامناك و سەرسامت لێوە دەرئەکەوێ و ، جگە لە یەك دوانێکیان کەسیان لەم دنیادا نەماونەتەوە و ، ئەوانیش لە رۆشتندان بۆ ئەوێ .. کەواتە کۆچ کردنت لەم

دنیایە لێك دابران و لێك جویێ بوونەوە نیە ، بەڵکو پێ گەیشتنەوە و شادبوونەوەیە بەو ئازیز و خۆشەویستانە

بەڵێ ، ئەوانە ـ واتە رۆحە نەمرەکان ـ ماوا و مەنزڵە رووخاوەکەی ژێر زەوییان بەجێ هێشت و ، بەشێکیان خەریکی گەشتی ناو ئەستێرەکانن و، بەشێکی تریان لە ناو چینەکانی جیهانی بەرزەخدان ..

ئا بەم شێوەیە نوورە قورئانییەکە ئەوەی خستەوە یادم .. هەر یەکە لە قورئانی پیرۆز و ئیمانیش بە شێوەیەکی گومان بر ئەم حەقیقەتەیان وەها چەسپاندووە، کە ئەگەر کەسێك دڵ و رۆحی خۆی لە دەست نەدابێ ، یان گومرایی نوقمی نەکردبێ، ئەوا وەك بە چاوی خۆی بیبینێ بڕوای پێ ئەکات .. چونکە ئەوەی، کە ئەم دنیایەی بە چەندین جۆری لوتفی خۆی، کە لە سنوور بەدەرن و ، بە چەندین شێوە ناز و نیعمەتی، کە لە ژمارە بەدەرن رازاندۆتەوە ، تا پەروەردگارییە بەخشندە و خاوەن سۆزەکەی پێیان دەربخات و ، تا پارێزگاریی هەتا لە شتە بچووکە زۆر هەندەکییەکان ـ بۆ نموونە تۆوەکان ـ بکات . ئا ئەو دروست کەرە بەخشندە و بەسۆزە ، پێویستە ـ بەڵکو بەڵگەنەویستە ـ ئەم مرۆڤە، کە بە لایەوە کامڵترین و بەرێزترین و کۆترین و گرنگ ترین و خۆشەویست ترین بەدیهێنراویەتی ، لە ناوی نادات و ، ـ وەك بە رواڵەت دەرئەکەوێ ـ بەبێ بەزەیی پێدا هاتنەوە و بەبێ ئەنجام بە فەنا و لەناوبردنی یەکجارەکیی نای فەوتێنێ و ، هەرگیز زایەی ناکات .. بەڵکو بەدیهێنەری بەسۆز ئەم بەدیهێنراوە خۆشەویستەی بە شێوەیەکی کاتیی

ئەخاتە ژێر ئەو گڵەوە، کە دەرگای رەحمــەتی خۆیــەتی ، تــا لــە ژیــانێکی تــردا بەرووبوومەکانی پێشکەش بکات ، وەك جوتیار تۆو ئەکاتە ناو زەوییەوە [١٢٥]

دوای ئەوە، کە ئەم ئاگادارییە قورئانییەم وەرگرت ، زیاتر لە ئەستەنبوڵ خۆی دڵم بەو قەبرستانە ئەکرایەوە و ، تەنیایی و گۆشەگیرییم لە تێکەڵیی و هاودەمیی بە لاوە خۆشتر بوو، تا هاتمە سەر ئەوە، کە لە ( صاري ير ) لەسەر کەناری بوسفۆر شوێنێك بۆ گۆشەگیرییم پەیدا بکەم و ، شێخی گەیلانییش ـ خوا لێی رازیی بێ ـ بە هۆی کتێبی « فتوح الغیـب » ەوە بــووە مــامۆســتا و پزیشــك و رابــەرم و ، ئیمامی رەببانییش ـ خوا لێی رازیی بێ ـ بە هۆی کتێبی « مکتوبات » ەوە بووە مـامۆستای دڵ دەرەوە و خاوەن سۆز و شەفەقەت بۆم .. ئیتر منیش بە پیربوونم و، خۆدامالێنم و کشانەوەم لە ژیانی کۆمەڵایەتیی بە تەواویی رازیی و منــەت بــار بووم ، ئیتر ئەوەبوو لەسەر ئەوە سوپاسێکی زۆری خوام کرد » . [١٢٦]

### چوارەم : یەکلایی کردنەوەی قیبلە

لە ساڵی ١٣٣٩ك مامۆستا نوورسیی بە قــەیرانێکی رۆحیــی ســەختدا تــێ پەریی و ، تووشی دڵەراوکەیەکی سامناك و شڵەژاوییەکی فیکریی سەخت هات . جا بۆ دەربازبوون لەم هەڵوێستە پرمەترسییە داوای مەدەد و کۆمەکییەکی توندی لە شێخی گەیلانیی کرد .. ئەویش بە هیممەتیی و بە کتێبەکەی ( فتوح الغیب ) کۆمەکییەکی رۆحیی وەهای کرد، کە لەو قەیرانە دەرباز بێت . [١٢٧]

---

[١٢٥] ئەم حەقیقەتە بە شێوەیەکی گومان بڕ بە وێنــەی بێگومــانیی ( دوو کــەڕەت دوو ئەکاتــە چــوار ) لــە پەیامەکانی تردا چەسپاوە ، بە تایبەت لە وتەی دەهەم و وتەی بیست و نۆهەم دا . ـ دانەر .

[١٢٦] پەیامی پیران : ٢٧ ـ ٣٠

[١٢٧] اللمعة الثامنة .

ئەوەبوو بە تەفائول کتێبەکەی کردەوە ئەبينێ تيايا نووسراوە : تۆ وای لە ( دار الحكمة ) دا ، دوکتۆرێك پەيدا بکە هەتا دڵەکەت دەرمان بکات .[١٢٨] ئەويش بريار ئەدات کە شێخی گەيلانيی بکاتە تيمارکەری دڵەکەی و ، دەست ئەداتە خوێندنەوەی کتێبەکە ، کە ئەو کاتە کتێبی ( فتوح الغيب ) و ( الفتح الرباني ) پێکەوە چاپ کرابوون، هەرچەندە لێی ورد ئەبوويەوە وەها ئەچووە دڵيەوە، کە شێخ لەگەڵ ئەويەتی .. بە بێ رەحمانە غروور و ئەنانيەتی ريشەکەن ئەکرد و ، پەروەردەيەکی چاکی دەروونی بۆ ئەکرد ، بەڵام مامۆستا نوورسيی بەرگەی ئەو هەمووە زام و زۆخەی نەئەگرت ، لەبەر ئەوە تا نيوەی بۆ خوێندرايەوە و ، تا ماوەيەك لەسەری وەستا ، هەتا ئازاری زامەکانی نەما و چەندين لەزەتی رۆحيی سەير لە جێياندا بەجێ مان .

دوای ماوەيەك گەرايەوە سەر کتێبەکە و تەواوی کرد و کەڵك و سودێکی زۆری لێ وەرگرت .

پاشان رێی لە کتێبی مەکتووباتی ئيمام رەببانيی کەوت ، کە بە راستيی نوێخوازی هەزاری دووهەمی کۆچييە ، ئەويشی بە تەفائول کردەوە ، شتێکی سەيری تيايا بەرچاو کەوت .. ئەوەبوو لە دوو نامەدا لەفزی (( ميرزا بديع الزمان )) هاتبوو .. مامۆستا هەستی بەوە کرد، کە ئيمام رەببانيی راستەوخۆ لەگەڵ ئەويەتی ، چونکە باوکيشی ناوی ميرزايە، جا ئەو نامانە هەردووکيان ئاراستەی (( ميرزا بديع الزمان )) کرابوون، مامۆستا يەکجار سەرسام ئەبێت ، هەروەك ئيمام رەببانيی ئامۆژگاريی تايبەتيی بکات ، بە تايبەت، کە لەو دوو

---

[١٢٨] برگەکە بەم شێوەيە : ( يا عباد الله أنتم في دار الحكمة ، لابد من الواسطة ، أطلبوا من معبودكم طبيباً ، يطب أمراض قلوبكم ، و مداوياً يداويكم ) . المجلس الثاني والستون ص ٢٤٥ من كتاب الفتح الرباني .

نامەيەدا و لە نامەی تريش‌دا ( وحد القبلة ) ی ئەكردە ئامۆژگاريی بۆی ، واتە شوێن يەك رابەر بكەوە و خۆت بە شتی ترەوە خەريك مەكە

ئەو كاتە مامۆستا لە مەبەستی ( وحد القبلة ) نەگەيشت ، چونكە كەڵكی لە گەيلانييش و رەببانييش وەرگرتبوو و ، دڵی نەئەهات دەست‌بەرداری يەكێكيان ببێت .. بەلاّم ئەوەی خۆی بفرۆشێت بە خوا ، خوا فريای ئەكەوێت، جا لە كاتێك دا، كە مامۆستا لە سەرساميیەكی يەكجار زۆردا ئەتلايەوە ، خورپەيەكی رەحمانيی لەلايەن خوای گەورەوە هات بە دڵيدا و تێی گەياند كە :

سەرەتای هەموو رێبازەكان و ، سەرچەمەی هەموو جۆگەكان و ، خۆری ئەستێرە گەرۆكەكان قورئانی پيرۆزە، كەواتە خۆ يەك‌لايی كردنەوە بريتييە لە شوێن‌كەوتنی قورئانی پيرۆز .. چونكە قورئان بەرزترين ئيرشادكار و ، پيرۆزترين مامۆستايە .. ئەويش بە جوانيی رووی كردە قورئان و دەستی پێوە گرت و ، داوای كۆمەكيی لێ ئەخواست .. [129]

## پێنجەم : دەست بەرداربوونی ژيانی كۆمەلايەتيی

هەروەها بۆمان باس ئەكات :

« دوای دەربازبوونم لە ديليی رووس لە جەنگی جيهانی يەكەم دا بۆ ماوەی سێ ساڵ ، بە نيازی خزمەت‌كردنی دين لە « دار الحكمة الاسلامية » دا ، لە ئەستەنبوڵ مامەوە . بەلاّم بە رێنموونيی قورئانی پيرۆز و ، بە هيممەتی شێخی گەيلانيی و ، بە بێداربوونەوەم بە پيريی ، سەبارەت بە ژيانە كۆمەلاّيەتييە دلاّراكەی هەڵ كرد .. ئيتر ئەو شەوق و تاسەمەندييەی كە پێی ئەوترێ : « دەردی

---

[129] سيرة ذاتية ١٦١ـ ١٦٢ ، ١٦٨

غەریبیی » هانی دام تا بگەڕێمەوە بۆ شارەکەم ، ئەوەبوو ئەم وت : مادەم هەر ئەمرم ، دەی کەواتە با لە شارەکەی خۆمدا بمرم » ..[١٣٠]

« بەڵێ ، بەم شێوەیە ، بە بۆنەی وردبوونەوە و سەرنج دانم لەو چەند تاڵە مووە سپیەی سەر و ریشم و ، لەو بێ وەفاییەی، کە لە دۆستە بەوەفا دڵسۆزەکەمەوە دەرکەوت ، لەو ژیانە دڵارایەی ئەستەنبوڵ، کە لە رواڵەت دا پڕ لە لەزەت بوو ، بێزاریی رووی تێ کردم ، بە رادەیەك نەفسم دەستی دایە پشکنین و گەران بە دوای چێژی مەعنەوییدا لە بریی ئەو چێژانەی کە پێیانەوە دەست خەرۆ بوو بووم .. ئەوەبوو دەستم دایە گەران بە دوای نوور و دڵ دانەوەدا تا لەو پیرییەوە دەستم بکەوێ کە بە لای بێ ئاگایانەوە قورس و بێزارکەر و قیزەونە، جا سوپاس و منەت و هەزار و یەك شوکرانە بۆ خوای پاك و بێ گەرد وا یارمەتیی دام تا لە ( لا إله إلا هو ) و لە نووری تەوحیددا لە بریی ئەو چێژە دنیاییانەی، کە هیچ راستییەك و هیچ لەزەتێکیان تێدا نیە ، بگرە خێریش لە دوائەنجامەکانیدا نیە ، ئەو چێژە ئیمانییە راستەقینە هەمیشەییانەم دۆزینەوە .. هەروەها سوپاسی ئەکەم، کە یارمەتیی دام پیریم بە شتێکی ئێسك سووك بێتە بەرچاو و، بە گەرمیی و رووناکییەکەی بحەوێمەوە ، بە پێچەوانەی ئەو قورسیی و سارد و سرییەوە، کە بێ ئاگایان ئەیبینن »[١٣١]

« لە سەرەتای پیریمدا و ، بە بۆنەی حەزکردنمەوە لە گۆشەگیریی و کەنارگرتن لە خەڵکیی، رۆحم بە دوای ئاسوودەییەکدا ئەگەرا، کە لە تەنیایی و کەنارگیرییدا لەسەر گردی « یووشەع » ، کە بەسەر بوسفۆردا ئەی روانی ، دەستی بکەوێ .. رۆژێکیان، کە لەسەر ئەو گردە بەرزەوە سەرنجی ئاسۆی سەرکەلم ئەدا ، بە هۆی ئاگادارکردنەوەی پیرییەوە تابلۆیەك لە تابلۆکانی تیاچوون و لێك دابرانم بینیی، کە

---

[١٣٠] پەیامی پیران : ٤٥

[١٣١] پەیامی پیران : ٣٨

خەفەت و ناسكييان لىٚ دائەچۆريى .. ئـەوەبوو لەسـەر چـڵەپۆپەی لقـى چـل و پێنجەمينى تەمـەنمەوە چاوم گێرا هەتا گەيشـتمە قـووڵايى چينەكانى ژێـرەوەی تەمـەنم ، ئەبينم وا لـە هەر لقێك لەو لقانـەی ئەوێـدا ، لـە هـەموو سـاڵێكدا ، چەندين تەرمى لە ژمارە نەهاتوو هەن، كە هى خۆشەويستانم و دۆستانم و هەموو ئەوانە بوون، كە پەيوەندييان پێمەوە هەيە، ئيتر بۆ لێك دابـڕان و جيابوونـەوەی خۆشەويستان يەكجار دڵ تەنگ بووم و ، بـە وێنـەی گريـە و زاريـى « فضـولي البغدادي » لە كاتى جيابوونەوەی لە خۆشەويستانيدا ، منيش دەستم بە گۆرانيى كرد و ئەم وت :

كلما حنَّ الوصال        عَذبٌ دمعي مادام الشهيق

ئەوەبوو، لە ناوەند ئەو هەناسە هەڵ كيشانە قووڵانـەدا بـە دوای دەرووپـەكى ئومێد و، كلاورۆژنەيەكى نووردا ئەگەرام ، تا دڵمى پىٚ خۆش بكەم ، لە پڕ نوورى ئيمان بە قيامەت فريام كەوت و بە نـوورێكى گەشـاوە كۆمـەكيى كـردم .. بـە راستيى نوورێكى پىٚ بەخشييم، كە هەتا هەتايە ناكوژێتەوە و ، ئومێدێكيشى پىٚ بەخشييم، كە هەرگيز هيوا بڕاو نابێت » .[١٣٢]

---

١٣٢ پەيامى پيران : ٩ ـ ١٠

بەشی پێنجەم

# لە ئانقەرەدا

کاتێك، کە مامۆستا نوورسیی لە سەعیدی کۆنەوە گۆڕرا بۆ سەعیدی نوێ ، ئەمەش لە سەرەتای پیرییدا و ، خۆشیی و زەردەخەنەکانی یەکەم گۆڕران بۆ شیوەن و گریانی دووهەم ، کاربەدەستانی ئانقەرە بانگیان کرد بۆ ئەوێ ، چونکە هێشتا حیسابی سەعیدی کۆنیان بۆ ئەکرد، مامۆستایش رۆیشت بۆ ئەوێ .[133]

ئەوەبوو موصطفا پاشا دوو بروسکەی نارد بۆ تەحسین بەگ، کە پێشتر والیی شاری ( وان ) بوو و ، دۆستی مامۆستا بوو، تا مامۆستا ئاگادار بکات و ، بچێت بۆ ئانقەرە ، تا لەسەر بلاوکردنەوەی پەیامی ( الخطوات الستە ) پاداشتی بداتەوە

لەو کاتەدا سوپای ئیسلام بەسەر یۆنان‌دا زاڵ بوو بوو، و موسڵمانان زۆر دڵ خۆش بوون ، بەڵام هەستی کرد لەناو ئەو ئیمان دارانەدا کۆمەڵێك زیندیق خەریکە پێ ئەگەن و ، بە فروفێڵ بیروباوەری گەنیویان تێکەڵ بە عەقیدەی موسڵمانان ئەکەن .. بۆ ئەمە مامۆستا خەفەتێکی زۆر ئەچێتە دڵیەوە و ، تێ ئەگا بە

---

[133] اللمعات : ٣٥١

راستیی داو و تەڵەکەیەکی زۆر لە ئارادایە بۆ دەستبرینی موسڵمانان و دژایەتیکردنی خۆیان و دینیان .. [١٣٤]

مامۆستا ( بدیع ازمان ) هەر بە منداڵیی و ، کاتێکیش، کە بەرەو ئانقەرە ئەرۆیشت بیری بەلای کارێکی یەکجار گرنگەوە بوو، کە بریتیی بوو: لە بەدەست هێنانی هۆشیارییەکی ئیسلامیی وەها، کە هەموو جیهانی ئیسلامیی بگرێتەوە کاتێك، کە لەگەڵ مامۆستایان و زانایانی کوردستاندا وت و وێژی ئەکرد ، ئەم بۆچوونەی بە جوانیی دەرئەکەوت و ، بە درێژایی تەمەنی پیرۆزیشی هەر بۆ ئەو کارە کۆششی ئەکرد .. هیوایشی وەها بوو، کە جاردانی دەستوور ببێتە مایەی خزمەت کردنی شەریعەت و ، هەر بەو نیازەشەوە وتاری ئەدا و ، لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا باسی ئەنووسیی و راستەوخۆش دەری ئەبریی، کە دەنگی گەورە و زوڵاڵی دوارۆژ دەنگی قورئانی پیرۆز ئەبێت ..

بەڵام ئەوەبوو دەوڵەتی عوسمانیی ـ کە دوای عەبباسییەکان بۆ ماوەی هەزار ساڵ خزمەت و پاراستنی ئیسلامی خستبووە سەرشانی خۆی ـ رووخا و ، کارێکی یەکجار گەورەشی کردە سەر جیهانی ئیسلامیی، ئەوەبوو دوژمنە داخ لە دڵەکان پایتەختی خیلافەتیان گرت و ، دەستیان دایە لە ریشە دەرهێنانی ئیسلام ، بەڵام ئەوەبوو پەروەردگاری بەشەفەقەت کاری رزگارکردنی ئیمانی بە ( بدیع الزمان ) سپارد ، تا لە رۆژی سەخت و ناهەمواردا ئاڵای ئیمان بەرز بکاتەوە و رۆڵە دڵسۆزەکانی ئیسلام و تێکرای مرۆڤایەتیی بۆ بانگ بکاتەوە

کە هات بۆ ئانقەرە بە هیوا بوو لە کاربەدەستان شتێکی بۆ بەرژەوەندیی موسڵمانان دەست بکەوێت و ، ئەمەیش کۆمەکیی ئەوان بکات، جا هەروەك

---

[١٣٤] الشعاعات : ٤١٩ ـ ٤٢١ ، اللمعات : ٢٦٧

جەنگی ئازادیی، بە کۆمەکیی خوا، جەنگێکی ئیمانیی بوو بۆ دەرپەڕاندنی دوژمنان لە ولاتدا ، بە هەمان شێوە بە هیوا بوو، حکومەتی نوێ پشت بە قورئان ببەستێ و کاروباری ولات بەو پێیە هەڵ بسوورێنێ و ، هەوڵی یەکێتیی جیهانی ئیسلامیی بدات، بەلام، کە گەیشتە ئانقەرە و ، لەلایەن لێ پرسراوانەوە چ پەرلەمانتار و چ وەزیران ـ و لەلایەن دانیشتوانەوە بە گەرمیی بەخێرهاتنی لێ کرا ، سەرنجی دا بایەخ بە دین نادرێت و ، دروشمە ئیسلامییەکان پشت گوێ خراون، بۆ ئەمە مامۆستا بە بەیانێك ئەندامانی پەرلەمانی ئامۆژگاریی کردن ، تا دەست بە خواپەرەستیی بکەن، بە تایبەت بەجێهێنانی نوێژ و ، بەیانەکەش جەنەراڵ کاظم قەرەبەکر بەسەر موصطفا کەمال‌دا خوێندیەوە

بەیانەکە کارێکی گەورەی کردە سەر ئەندامان و(٦٠) شەصتیان دەستیان بە نوێژ کرد و ، ناچاریش بوون ژووری نوێژکردنەکە بگۆڕن بە ژوورێکی گەورەتر .[١٣٥]

بەڵێ بەیانەکە بۆ پەرلەمانتاران خوێندرایەوە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا بووە، هۆی بەرابەرکێیەك لەگەڵ موصطفا کەمال‌دا، کە ئەوەبوو لەبەردەم نزیکەی شەصت ئەندام‌دا بە مامۆستا نوورسیی وت :

ـ بێ گومان ئێمە پێویستییمان بە زانایەکی لێهاتووی وەك تۆ هەیە، جا ئێمە تۆمان بانگ کرد بۆ ئێرە بۆ کەڵك وەرگرتن لە را جوانەکانت و ، ئێوەش هاتن بە دەنگمانەوە ، کەچیی یەکەم کارێك کە ئەنجامتان دا بریتیی بوو لە نووسینی چەند شتێك دەربارەی نوێژ ، بەمە ناکۆکییتان خستە نێوانمانەوە .

مامۆستا زۆر بە جوانیی وەلامی دایەوە ، پاشان بە توورەییەوە پەنجەی بۆ بەرز کردەوە و وتی :

---

[١٣٥] سیرة ذاتیة : ١٨٢ . دەقی بەیانەکەش لە سیرة ذاتیة ل ١٨٣ ـ ١٨٦دا تۆمار کراوە

**ـ پاشا .. پاشا .. گەورەترین حەقیقەت لە ئیسلامدا ـ دوای ئیمان ـ بریتییە؛ لە نوێژ، و ئەوەش نوێژ بەجێ نەهێنێ خائینە و ، حوکمی خائینیش ئەدرێتە دواوە .**

موصطەفا پاشا ناچار بوو، رقی خۆی بجوێتەوە و ، هەوڵی رازیکردنی مامۆستا بدات .[١٣٦]

موصطەفا کەمال پێشنیاری ئەوەی کرد، کە مامۆستا بە ئامۆژگاری گشتیی پارێزگاکانی خۆرهەڵات لە جێی شێخ سنووسیی ،[١٣٧] بە مووچەی سیی لیرە دابمەزرێنێ ، چونکە سنووسیی کوردیی نەئەزانیی، هەروەها پێشنیاری بۆ کرد تا بە شێوەی پەرلەمان تار و ، لە سەرۆکایەتیی کاروباری دینیی دای بمەزرێنێ ، سەرەرای ئەندامێتیی ( دار الحکمة الإسلامیة ) .

تا لەم کاتەدا مامۆستا نوورسیی بە وردیی سەرنجی موصطەفا کەمالی دا و ، بۆی دەرکەوت، کە هەندێ هەواڵ دەربارەی دەججال و سوفیانیی لە تیشکی پێنجەمدا هاتوون، بەسەر ئەودا جێبەجێ ئەبن ، بۆیە ناچار بوو ئەو پۆستە گرنگانە بەجێ بهێڵێ و بگەرێتەوە دوا، چونکە قەناعەتی وەها بوو، کە لەگەڵ ئەودا هیچی پێ ناکرێ و ، بە هیچ شێوەیەك رێك ناکەون، ئیتر دەستی لە کاروباری دنیا و ، سیاسەت و ، ژیانی کۆمەلایەتیی شۆرد و ، خۆی بۆ رزگارکردنی ئیمان یەك لایی کردەوە[١٣٨]

---

[١٣٦] الشعاعات : ٥٠٥ ، ٤٨٧

[١٣٧] شێخ سنووسیی : بە شێوەی ئامۆژگاری دینیی لە پارێزگاکانی خۆرهەڵات دا ، واتە کوردستانی تورکیا ، کاری کردووە و بۆ دەرکردنی فەتوای جیهاد دژی ئینگلیز لە کاتی داگیرکردنی تورکیادا دەوری کاریگەری هەبووە ..

[١٣٨] الشعاعات : ٤١٩ ـ ٤٢١

هەندێ فەرمانبەر پرسیاریان لە مامۆستا کرد، کە بۆچ ئەو پێشنیارانەی موصطفا کەمالی وەرنەگرتن ، تا ببوایەتە هۆی رزگارکردنی گیانی هەزارەها پیاو، کە لەو ناوچەیەدا لە کاتی شۆرش‌دا [١٣٩] تیا چوون، ئەمیش وەلأمی دانەوە، کە لە جیاتیی رزگارکردنی بیست یان سیی سالّی ژیانی دنیایی ئەو پیاوانە ، پەیامەکانی نوور بوونە هۆیەك بۆ رزگارکردنی ملیۆنەها سالّی ژیانی قیامەتی صەدان هەزار لە هاووڵاتیان، واتە هەزارەها کەرەت زیاتر ئەو زەرەریان بژاردۆتەوە، جا ئەگەر مامۆستا بە گوێی موصطفا کەمالی بکردایە ، ئەوا پەیامەکانی نوور نەئەنووسران .

هەتا جارێکیان لە بەندیخانەدا بە دۆستە بەرێزەکانی ئەڵێت :

ئەگەر ئەو کاربەدەستانەی، کە وان لە ئەنقەرە ، ئەوانەی، کە زللە توندەکانی پەیامەکانی نوور ئازاری پێ گەیاندوون ، حوکمی لە سێدارەدانم بۆ دەربکەن ، پاشان پەیامەکانی نوور توانییان ئیمانیان رزگار بکەن و ، خۆیشیان لە ئیعدامی هەمیشەیی رزگار بکەن ، ئەوا ئێوە بە شاهێد بن، کە من لە هەموو دڵێکمەوە چاوپۆشییان لێ ئەکەم . [١٤٠]

بەڵێ ، مامۆستا، موصطفا کەمالی ناسیی و بۆی دەرکەوت، کە بە رێبازی سیاسەت بەرهەڵستی ئەو جۆرانە ناکرێت، بەڵکو پێویستە بە نووری ئیعجازی قورئان چار بکرێن، لەبەر ئەوە هەموو پێشنیارەکانی دایە دواوە و لە ٢٥ / ٤ /

---

[١٣٩] لە پارێزگاکانی خۆرهەلآت دا چەند شۆڕشێك بەرپا بوون، کە گرنگ ترینیان ئەو شۆڕشە بوو، کە یەکێك لە شێخەکانی تەصەووف فەرماندەی بوو، کە ئەویش شێخ سەعیدی پیران ( پالەویی ) بوو دژی سیاسەتی بێ دینیی موصطفا کەمال ، کە لە ١٣ / ٢ / ١٩٢٥ دا هەڵ گیرسا و ، سەرەنجام شێخ سەعید و چل و حەوت لە هاوەڵانی لە ٢٩ / ٦ / ١٩٢٥ لە سێدارە دران و شۆڕشەکەش کوژایەوە

[١٤٠] الشعاعات : ٣٤٣

**١٩٢٣ دا ئانقــەرەی بــەجێ هێشــت و، کــاظم قەرەبــەکر و رەئــووف ئوربــای و هاووێنەیان لە فەرماندە ناسراوەکان خوا حافیزییان لێکــرد ، دوای ئــەوەی لێــی پارانەوە، کە ئانقەرە بەجێ نەهێڵێ ، کەچیی نەیتوانی بە گوێیان بکات، بەڵکو بە جوانیی وەڵامی دانەوە [١٤١]**

[١٤١] سیرة ذاتیة : ١٩٧ ، ( ب ١ / ٥٠٥ )

بەشی شەشەم

# ژیانی گرتن و نەفیی کردن

## *یەکەم : گەرانەوە بۆ وان*

مامۆستا لە ئەنقەرە دڵی هەڵ کەنرا و ، بەرەو شاری وان گەرایەوە، ئەوەتا خۆی باسی ئەوە ئەکات :

(( لەوێش ، پێش هەموو شتێك چووم بۆ سەردانی قوتابخانەکەم، کە (( خور خور )) یان پێ ئەوت .. ئەبینم وا لە کاتی داگیرکردنی رووس‌دا ئەرمەنەکان قوتابخانەکەشیان بە وێنەی خانووەکانی شاری (( وان )) سوتاندووە سەرکەوتمە سەر قەڵا بە ناوبانگەکەی (( وان )) کە بریتییە لە تاشە بەردێکی زەبەلاح و قوتابخانەکەشم بە تەواوەتیی بەلا تەنیشتی قەڵاکەوە نووسا بوو، و تارمایی ئەو دۆستە راستەقینە و برا هاودەمانە لە قوتابیانی قوتابخانەکەم لەبەر چاوم دا تێ پەریان ئەکرد، کە نزیکەی حەوت ساڵ لەوەو پێش لێیان جوێ بووبوومەوە، ئەوەبوو دوا بە دوای ئەو لێ قەومانەم بەشێك لەو دۆستە خۆیەخت کەرانە بوونە شەهیدی راستەقینە و هەندێکی تریش شەهیدی مەعنەویی ، ئیتر خۆمم پێ نەگیرا و دامە پرمەی گریان .. سەرکەوتمە سەر لووتکەی قەڵاکە ، کە بە ئەندازەی هەردوو منارەکە بەرز بوو و ، قوتابخانەکەشم لەژێیدا بوو .. لەسەر قەڵاکە دانیشتم و خەریکی تێ فکرین بووم .. جا لەبەر ئەوەی، کە ئەندیشەم زۆر بەهێز بوو و ، هیچ شتێکیش نەبوو رێی بیرکردنەوەم لێ بگرێ و ، ئەو کاتەم لەبیر

بەرێتەوە، چونکە تاق و تەنیا بووم ، ئەوا بە ئەندێشە گەرامەوە بۆ نزیکەی هەشت ساڵ لەوەوبەر و ، بیرم لەو کاتە ئەکردەوە

ئەبینم ئاڵ و گۆڕێکی یەکجار زۆر لە ماوەی هەشت ساڵدا رووی داوە ، بە رادەیەك، کە هەر چەند چاوم ئەکردەوە وەهام ئەهاتە پێش چاو، کە چەرخێك بە خۆی و رووداوەکانیەوە پشتی هەڵ کردەوە و رۆیشتووە ، ئەبینم وا ناوجەرگەی ئەو شارەی، کە چوار دەوری قوتابخانەکەمی گرتووە ـ کە لە تەنیشتی قەڵاکەدا بوو ـ لەم سەریەوە بۆ ئەو سەری سووتێنراوە و بە تەواویی وێران کراوە .. بە سەرنجێکی پر داخ و خەفەتەوە سەیری ئەم دیمەنەم کرد .. هەستم بە جیاوازییەکی یەکجار زۆر ئەکرد لە نێوان ئەوەی، کە ئەوسا تێیدا بوو، و ئەوەش، کە ئێستە ئەی بینم ، هەروەك(٢٠٠) دووصەد ساڵ بەسەر ئەم شارەدا تێپەری بێ .. زۆربەی دانیشتوانی ئەم خانووە رووخاوانە دۆستم بوون .. خۆشەویست و ئازیزم بوون .. ئەوەبوو بەشێکیان بە کۆچ کردن لە شارەکە مردن و ئێش و ئازاری ئەوەیان چەشت و ، ئەوانی تریشیان لەناو شارەکەدا تیاچوون ، خوای گەورە هەموویان رەحمەت باران بکات ، ئەوەبوو خانووبەرەی موسڵمانەکان هەر هەمووی لە شارەکە رووخێنرا بوو و ، جگە لە گەرەکی ئەرمەنەکان هیچی لێ دەرنەچووبوو منیش ئێش بە قووڵایی دڵم گەیشت و خەفەتێکی زۆرم خوارد ، بە رادەیەك، کە ئەگەر هەزار چاوم ببوونایە ئەوا بە هەموویان بە خورەم فرمێسکم هەڵ ئەرشت ..

من وام ئەزانی بە گەرانەوەم بۆ شارەکەم لە غەریبیی رزگارم بووە ، کەچیی ـ بە داخەوە ـ هەر لە شارەکەم دا جەرگ برترین غەریبییم دیی .. دیتم وا صەدان لە قوتابیان و خۆشەویستانم ، ئەوانەی، کە پەیوەندیی رۆحییم لەگەڵیان دا هەبوو ـ وەك عەبدوررەحمان، کە لە ئومێدی دوانزەدا باسی کرا ـ دینم وان لە ژێر خاك و کەلاوە رووخاودا و ، خانووەکانیشیان تەنها شوێنەواریان دیارە، جا لەبەردەم ئەم

تابلۆ خەمبارەدا مانای ئەم برگەیەم بە جوانیی بۆ دەرکەوت، کە دەمێك بوو، لە یادم بوو، و بە تەواوییش لە ماناکەی تێ نەئەگەیشتم :

لولا مفارقةُ الأحبابِ ما وَجَدَت　　　لها المنايا إلى أرواحنا سُبلاً [١٤٢]

واتە ئەوەی، کە زیاتر مرۆڤ لەناو ئەبات و ئەی فەوتێنێ جوێبوونەوەیە، لە خۆشەویستان ..

بەڵێ ، هیچ شتێك وەك ئەم رووداوە ئازاری نەداوم و نەشی گریاندووم .. خۆ ئەگەر لە قورئانی پیرۆز و لە ئیمانەوە کۆمەکییم بۆ نەهاتایە ، ئەوا ئەو خەم و خەفەت و پەژارانە بەس بوون بۆ گیان کێشانم .. هەر لە دێرین زەمانەوە وەها بووە کە شاعیران بە لای شوێنەواری مەنزڵی خۆشەویستەکانیان دا تێپەریان ئەکرد دەستیان بە گریان ئەکرد　منیش ئەو تابلۆ خەمبارەی لێك دابرانم بە چاوی خۆم دیی، ئەوەبوو رۆح و دڵم لەگەڵ چاوەدا بەوپەری خەمبارییەوە ، وەك کەسێك دوای (٢٠٠) دووصەد ساڵ بە لای مەنزڵ و شوێنەواری خۆشەویستانیدا تێپەر بکات ، دەستیان بە گریان کرد

ئا لەو کاتەدا لاپەرە ناسك و بەلەزەتەکانی ژیانم ، یەك لە دوای یەك ، بەوپەری رێك و پێکییەوە ، وەك دیمەنێکی فیلمە سینەماییەکان لە پێش چاو و ئەندیشەمدا تێپەریان ئەکرد .. ئەو ژیانە خۆشەی کە نزیکەی بیست ساڵ ، لەم شوێنانەدا ، کە ئاوەدان و دڵارا و پر لە کەیف و شادمانیی بوون، و ئێستە بوونەتە کەلاوە و وێرانە ، بە دەرس وتنەوە بە قوتابییە نەجیبەکانم بەسەر برد　ماوەیەکی دوور و درێژم لە بەردەم ئەو تابلۆیانەی ژیانم دا بەسەر برد ، ئەوەبوو وام لێهات، کە سەرم

[١٤٢] واتە : ئەگەر خەفەتی جویێ بوونەوە لە خۆشەویستان نەبوایە ، مردن رێی نەئەبوو دەم بگەیەنێتە رۆحمان . ـ وەرگێر .

لە حاڵی ئەهلی دنیا سوور ئەما، کە چۆن خۆیان ئەخەڵەتێنن ، چونکە ئەم بارە بە شێوەیەکی بەڵگەنەویست وای دەرئەخات، کە بێگومان دنیا فانییە و ، مرۆڤیش تیایدا رێبوار و میوانێکی کۆچ کردووە و هیچی تر، ئیتر بە هەردوو چاوم راستیی ئەو وتەیەی ئەهلی حەقیقەتم بۆ دەرکەوت کە ئەڵێ :

« دنیا غەددارە ، فێڵبازە ، فانییە ، پێی نەخەڵەتێن » .

هەروەها بۆم دەرکەوت، کە مرۆڤ وەك پەیوەندیی بە لـەش و بـە ماڵەکەیـەوە هەیە وەهاش پەیوەندیی بە شار و وڵات و بگرە دنیاکەشیەوە هەیە . جا لە کاتێك دا، کە دەم ویست بە هەردوو چاوم بۆ پیربوونم ـ بە حیسابی بوونی خۆم ـ بگریم ، ئەوا ئەم ویست بە دە چـاو بدەمـە پرمـەی گریـان ، نـەك تـەنها بـۆ پیربـوونی قوتابخانەکەم ، بەڵکو بۆ مردنیشی ، بگرە هەستم بەوە ئەکرد، کە پێویسـتە بـە صەد چاو بۆ شارە شیرینەکەم بگریم، کە لە مردوو ئەچێ ..

لە فەرموودەی شەریفدا هاتووە، کە هەموو بەیانییـەك مەلائیکـەتێك جـار ئەدات :

« لدوا للموت وابنوا للخراب » .[١٤٣] من ئەم حەقیقەتەم ئەبیست، بـەڵام بـە چاو ئەم بیست نەك بە گوێ و ، هەروەك باری ئەو کاتەشم گریاندمی ، ئەوا ماوەی بیست ساڵیشە هەرچیی خەیاڵم ئەو حاڵەتەی دێتەوە یاد فرمێسك هەڵ ئەرێژێت ..

بەڵێ، رووخانی ئەو خانووانەی سەر لووتکەی قەڵاکە، کە هەزاران ساڵە ئاوەدان کراوەتەوە و ، پیربوونی شارەکەی ژێر قەلاکـە لـە مـاوەی هەشـت سـاڵدا ، بـە

[١٤٣] ئەڵێت : لەدایك بن بۆ مردن و خانوو و بەرەش دروست بکەن بۆ رووخان    البيهقي في الشعب من حديث عن أبي هريرة والترمذي مرفوعاً ، أبونعيم في الحلية عن أبي ذر مرفوعاً ، وأحمد في الزهد عن عبد الواحد ، قال : قال عيسى عليه السلام ، فذكره ( الدرر المنتثرة ) وانظر كشف الخفاء ( ٢٠٤١ ) . ـ المترجم .

رادەيەك كە ئەڵێی هەشت صەدساڵی بەسەردا تێپەریوە و ، مردنی قوتابخانەكەم ـ لە خوار قەڵاكەوە ـ كە جريوەی ژيانی لێ ئەهات و ، كۆگای خۆشەويستان بوو .. ئەمانە هەموو ئاماژە بۆ مردنی هەموو قوتابخانە دينييەكانی دەوڵەتی عوثمانيی ئەكەن و ، گەورەيی مەعنەويی تەرمە مەزنەكەشيان دەرئەخەن ، بە شێوەيەك قەڵاكە، كە تاشە بەردێكی رەقی يەك پارچە ، بوويـووە كێلـی قەبرەكـەيان .. هەروەها بۆم دەركەوت ئەو قوتابييانەم ـ رەحمەتی خوا لە هەموويان بێـت ـ كـە هەشت ساڵ لەمەوبەر ، لەو قوتابخانەيەدا لەگەڵمدا بوون و ، ئێستە لە قەبرەكانيان دا راكشاون ، وەهام بۆ دەركەوت، كە لە گەڵمدا ئـەگرين ، بگـرە خـانووە كـاول بووەكانی شارەكەش بەشداريی گريان و خەمبارييەكەم ئەكەن ، بەڵكو هەتا ديوارە رووخاو و بەردە پڕاوەكانيشيان ..

بەڵێ ، هەموو شتێكم وەها ئەهاتە پێش چاو كە ئەگريی و ، ئەو كاتە زانييم، كە من لەم شارەدا بەرگەی ئەم غەريبييە ناگرم، بۆيە بيرم كردەوە، كە يان ئەبێ منيش وەك ئەوان بچمە ناو قەبرەوە ، يان لە ئەشكەوتێكی ئەو شاخەدا كەنار بگرم و چاوەروانی ئەجەلم بم .. ئەوەبوو وتم: مادەم دنيا ئەم لێك دابران و لێك جویێ بوونەوانەی تێدايە، كە ئارامييان لەسەر ناگيرێ و ، بەرگرييان لێ ناكرێ و، بەم پلەيەش بە ئێش و ژان و جەرگ سووتێنن ، بێ گومان مردن لەم ژيانە چاكترە و، فەزلێشی بەسەر ئەم بارودۆخانەدا ئەدرێت كە بەرگەيان لەسەر ناگيرێت لەبەر ئەمە رووم وەرگێرا و چاوم بە هەر شەش لادا ئەگێرا ئەوەبوو جگە لە تاريكييەكی رەش رەش هيچم نەبينی . چونكە ئەو بێ ئاگاييەی كە لەو دڵ گران بوونە سەختە و لەو كاريگەرييە قووڵەوە پەيدا بوو بوو، دنيای بە ترسناك و سامناك و چۆڵ و رووت هێنايە پێش چاوم هەروەك بيەوێ لە ناوم بەرێت رۆحيشم لەبەردەم بەڵا و موسيبەتە بێ سنوورەكاندا، كە لە شێوەی دوژمنی داخ

لە دڵ دا بوون، بە دوای پاڵ پشتێك و پایەیەكی بەهێزدا ئەگەڕا هەروەها لەبەردەم ویست و ئارەزووە شاراوە بێ سنوورەكانیدا بۆ هەتاهەتایی بەردەوامن بە دوای كۆمەكیی و یارمەتیدا ئەگەڕا جا لە كاتێك دا كە رۆحم بۆ پاڵپشتێك ئەگەڕا و، بە دوای كۆمەكێك دا ئەگەڕا و ، چاوەڕوانی دڵدانەوە و لابردنی ئەو خەم و خەفەتانە بوو، كە لە لێك دابران و لێك جویێ بوونەوە بێ سنوورەكان و وێران كاریی و مەرگەساتە زۆر و زەبەندەكانەوە پەیدا بووبوون ، لە پڕێكدا حەقیقەتی یەك ئایەتی قورئانی پیرۆزی خاوەن موعجیزە،كە ئەم ئایەتە بوو : ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ . ( الحديد : ١ - ٢ ) ، لەبەردەممدا بە روونیی درەوشایەوە و ، لەو ئەندیشە پڕ ئێش و ژانە سامناكە رزگاری كردم و ، لە ئازاری لێك دابران و لێك جویێ بوونەوە دەربازی كردم و ، چاوم و بەسیرەتمی كردنەوە منیش ئاوڕێكم بۆ لای ئەو بەروبوومانە دایەوە، كە بە درەختە بەردارەكانەوە شۆڕ بووبوونەوە و ، بە زەردەخەنەیەكی شیرینەوە سەیریان ئەكردم و پێیان ئەوتم « تەنها سەیری شوێنەوارە وێرانەكان مەكە خۆزگە سەیرێكی ئێمەشت بكردایە و، لێمان ورد ببوویتایەتەوە » .

بەڵێ ، حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە توندیی وریـای ئەكردمـەوە و وەبـیری ئەهێنامەوە و ئەیفەرموو: بۆچ تا ئـەم رادەیـە كـەوتنی نامیلكەیـەكی ئـاوەدان خەمبارت ئەكات، كە بە دەستی مرۆڤێكی میـوان لەسـەر لاپەرەیـەكی زەوییـە رەقەكەی « وان » بنیات نراوە ، تا ئەوەبوو شێوەی شارێكی ئاوەدانی گرتـەخۆ ؟ بۆچ خەفەت ئەخۆی بۆ ئەو شارەی، كە كەوتە ناو ئەو لافاوە دامالەرە ترسناكەوە، كە پێی ئـەوترێ داگیركردنـی رووسـیی، كـە ئـەوەبوو شـوێنەواری نەهێشـت و كوژاندیەوە ؟ سەرت هەڵ بڕە و خوای هێنەرەكایەی نەبووەكان و شێوە و وێنەكێش

ببینە، کە پەروەردگار و خاوەنی راستەقینەی هەموو شتێکە و ، کاروباریشی بە دەستی ئەوە و ، خێرا خێـرا و بـەبێ وچـان و بەوپـەڕی گرگـرتن و دڵاراییشـەوە نووسینەکانی خوای پاك و بێ گەرد لەسەر لاپەرەی « وان » ئەنووسرێن و ، هۆی ئەو بارودۆخانەی رابردوو و ، ئەو گریان و شیوەنەش بۆ چۆڵ بوون، و وێران بوونی ئەو شوێنانەی، کە تۆ چاوت پێ کەوتن ، بێئاگابوونە لە خاوەنی راستەقینەیان و ، وەهـەم بردنـی مرۆڤـە ـ بـە هەڵـە ـ کـە گوایـە خـۆی خاوەنیانـە و ، بیرنەکردنەوەشیەتی لەوە، کە رێبوار و میوانێکە و بەس ..

ئەوەبوو لەو بارودۆخە جەرگ سوتێنەرە و ، لەو بیرکردنەوە هەڵەیەوە دەرگایەکم بەرەو راستییەکی مەزن لێ خرایە سەر پشت، و نەفسیش ـ وەك ئەو ئاسنەی، کە ئەخرێتە ناو ئاگرەوە تا نەرم ببێ و شێوەیەکی تایبەتیی بەکەڵك وەربگرێت ـ خۆی ئامادەی وەرگرتنی ئەو راستییە کرد ، ئەویش بەوەی، کە ئەو حاڵەتە خەمبارە و ئەو بارودۆخە پڕ ئێش و ژانە بوونە ئاگرێکی گرگرتـوو و نەفسـی نـەرم کـرد و ، قورئانی پیرۆزیش بە روونیی و درەوشاوەیی تەواوەوە ، لە روانگەی حەقیقەتی ئەو ئایەتە ناوبراوەوە ، رێژنەی بەرەکەتی راستییە ئیمانییەکانی بۆ نەفس دەرخست ، بە رادەیەك، کە وای لێ کرد وەریان بگرێت و ملیان بۆ کەچ بکات » .[١٤٤]

## دووهەم : وازهێنان لە سیاسەت

---

[١٤٤] پەیامی پیران : ٤٥ ـ ٤٨

لەو قۆناغەدا رووداوێك بەسەر مامۆستادا هات، كە شايانی سەرنج گرتن بوو، و خۆی بۆمان ئەگێڕێتەوە :

**(( رۆژێكيان پياوێكم دیی، كە سەروسيمای لە هی زانايان ئەچوو، ناوی زانايەكی بەرێزی بە خراپە ئەبرد، بە رادەيەك، كە گەياندیە ئەوەی بە كافری لە قەڵەم بدات ، هەر لەبەر ئەوەی، كە لە چەند بابەتێكی سياسييدا رايان جياواز بوو، كەچيی هەر لە هەمان كاتدا ديتم ستايشی موونافيقێكی ئەكرد، كە لە بيروڕای سياسييدا هاوبير بوون ! بەم رووداوە تووشی لەرزينێكی توند بووم، و پەنام بە خوا گرت لەو بارودۆخەی، كە سياسەتی تێ كەوتووە و وتم : (( أعوذ بالله من الشيطان والسياسة )) . ئيتر هەر لەو** كاتەوە لە مەيدانی ژيانی سياسيی كشامەوە )) [١٤٥]

لەم ماوەيەدا مامۆستا بيری لە رێگە چارەيەكی تر ئەكردەوە تا موسڵمانان شوێنی بكەون و خۆيان و دينەكەيانی پێ سەربەرز بكەن ، چونكە سياسەت بە زيانبەخش دەرچوو .

لەوە ئەچێت رای هاتبێتە سەر ئەوە، كە دەستەيەكی زيرەك و وريا لە قوتابييەكانی پەروەردە بكات و خزمەتی ئيسلاميان پێبكات، ئەوەتا مەلا حەميد [١٤٦] كە يەكێك بووە لە قوتابييە دڵسۆزەكانی دەربارەی بۆچوونی مامۆستا لەو سەردەمەدا ئەگێڕێتەوە، كە مامۆستا ئاماژەی بۆ دوورگەی ( آق دامار ) [١٤٧] كردووە و وتوويە :

---

[١٤٥] المكتوبات : ٣٤٦

[١٤٦] مەلاحەميد : يەكێك بووە لەو قوتابييانەی، كە لەسەر كێوی ئەرەك و لە مزگەوتی نوورشين خزمەتی مامۆستايان كردووە . ئەوەندە بە دڵسۆزانە خزمەتی ئەكرد، بەرەكەتی خوايی بەسەردا رژا و ، زانايەكی وەهای لێ دەرچوو، كە ئاماژەی بۆ بكرێت ، بە مەرجێك لەوەو پێش خوێندن و نووسينی نەئەزانيی

[١٤٧] ئاق دامار : دوورگەيەكە لە ناو دەرياچەی واندا لە خۆرهەڵاتی توركيا

(( ئەگەر (١٠)دە ساڵ لەم دوورگەیەدا بمێنمـەوە و پـەنجا قوتـابیی پـەروەردە بکەم، ئەوا بەو پەنجا قوتابییـە ئـەمتـوانی ئیسـلام بـە هـەموو جیهـاندا بـلاّو بکەمەوە )) .[١٤٨]

مەلا حەمیـد هەنـدێك بیرەوەریـی ئـەم قۆناغـەی ژیـانی مامۆسـتامان بـۆ ئەگێڕێتەوە، کە ئەڵێت :

* کاتێك، کە بۆ نوێژ ئیقتیدام بە مامۆستاوە ئەکرد دڵم زۆر ئەکرایـەوە و ، هەستانەوەشـی بـۆ نوێـژ دڵـی مرۆڤـی لـە سـام و خشـووع پـڕ ئـەکرد ئامۆژگارییشمانی ئەکرد، کە تەسبیحات و ئەذکـار لـە حـوکمی نـاوك و تـۆوی نوێژدان و ، بە دەنگێکی پڕ لە سۆزی خەماویی ذیکر و تەسبیحی خوای ئەکرد کاتێك، کە ئەی وت : ( سبحان الله .. سبحان الله ) گوێمان لێ بـوو، لـە قـووڵ ترین قووڵایی دڵیەوە لەسەر خۆ دەرئەهات .

من خۆم هەرگیز کەسێکم نەدیوە وەك مامۆستا بەم خشووع و خەمەوە نوێژ و تەسبیحات بکات ، هەرچەندە زۆرێك لە مامۆستا و زانایانم دیون .. کاتێکیش، کە ئەیوت : (( لا إله إلا الله )) و دەستی بە تەسبیحات ئەکرد و لەسەری بەردەوام ئەبوو، دەنگی لە هێز و توندییدا وەك دەنگـی تـۆپی لێ ئـەهات، خـۆ ئەگـەر کەسێکی ئەهلی تەریقەتە صۆفییەکانی لەلادا بوایە حاڵی لێ ئەهات .[١٤٩]

* هەموو شەوێك بۆ شەونوێژ هەڵ ئەستا ، هەندێ جار چاوم لێ بوو، کە نوێژی بەجێ ئەهێنا ، ئیتر نەم ئەتوانیی بخەوم، جا، کە ئەیبینیم وا بەخەبەرم ئەیوت :

---

[١٤٨] رجل القدر : ١٠٦ ـ ١٠٧

[١٤٩] ذكريات عن سعيد النورسي : ١٠

ـ مادام بەخەبەری هەستە وەرە لە دوعاکردندا بەشدارییم بکە، بەلاّم من ئەم ئەزانیی هیچ دوعایەك بخوێنم، ئەویش پێمی ئەوت :

ـ من دوعا ئەکەم و تۆش بە دواما ( ئامین ) دووبارە بکەرەوە، من بە دوعاکەی یوونسی سەردارمان سەلامی لێ بێت ، و[١٥٠] بە دوعاکەی وەیسی قەرەنیی[١٥١] ئەپارێمەوە و بە هەردووکیان تەقە لە دەرگای رەحمەتی خوا ئەدەم، لە کاتی دوعا کردنەکەش دا هەندێ جار خەونووچکە ئەیبردم ، ئەویش سەیری ئەکردم و ئەیوت :

ـ منیش وەك تۆ وەها بووم .. تۆیش را دێیت .[١٥٢]

* کاتێك، کە لەگەڵ مامۆستادا لە سەر کێوی ئەرەك بووین ، هەندێ پرسیارم ئامادە کردن بەو هیوایەی، کە وەلاّمەکەیان لای مامۆستا وەربگرم ، بەلاّم ئەوە بوو، لە کاتی قسەکردنیدا لە دانیشتنی ئاساییمان‌دا ، بەبێ پرسیارکردن وەلاّمی هەموو پرسیارەکانم وەرگرتن و ، تەنها پرسیارێکم ما وەلاّمی وەربگرم ، کە ئەویش پرسیار بوو، دەربارەی سەیرکردنی ئافرەتان، پرسیارەکە هەر ئەهات بە بیرم‌دا بێ ئەوەی دەری ببرم تا ئەبینم وا مامۆستا بە توندیی دای بە رانی خۆیدا و وتی :

ـ من لە کردەوە و هەڵس و کەوتەکانی سەعیدی کۆن رازیی نیم جگە لە سێ حاڵەت، کە لێیان رازیی بووم ..[١٥٣]

---

[١٥٠] مەبەست لە ئایەتی پیرۆز ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ( الانبياء : ٨٧ ) .

[١٥١] لە کتێبی ( حزب أنوار الحقائق النورية ) دا مامۆستا نوورسیی تۆماری کردووە، وەیس : خواناسێکی ناوداری تابیعییانە، خەڵکی یەمەنە و ، فریای سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتووە ، بەلاّم بە خزمەتی نەگەیشتووە، دێتە مەدینە لای عومەر و پاشان لە کووفە نیشتەجێ ئەبێت .

[١٥٢] ذکریات عن سعيد النورسيي : ١١

پاشان ئەڵێت :

ـ هەموو حەفتەیەك جل و بەرگم ئەگۆڕیی و ، کامەیان زۆر جوان و ڕێك و پێك بوو ، بۆ ئەو ڕۆژانەی، کە لە ئەستەنبوڵی ژیان بریسکاوە و گەشاوە بەسەرم ئەبردن هەڵم ئەبژاردن، ئەچووم بۆ جوان‌ترین ناوچەی ئەستەنبوڵ ، بە ڕادەیەك، کە دۆستە زاناکانم سەرەنجی ئەم دیاردەیان دابوو و ، بەبێ ئاگادارییم یەکێکیان دیاریی کرد بوو بۆ چاودێریی هەڵس و کەوتم و ، ئامۆژگاری‌یان کردبوو بـە وردیـی سـەرنجی هەموو کردەوەکانم بدات . دوای سێ ڕۆژ لە چاودێرییم بە نهێنیی پێکەوە دانیشتین و پێیان وتم :

ـ سەعیدی برامان ! تۆ هەر کارێك ئەکەیت لەسەر حەقیت، تۆ ڕێی ڕاستت گرتووە و ، خوا سەرکەوتووت ئەکات .

لەم قسەیە و لەم حوکمەیان سەرم سور ما، کە لـە هۆیەکـەی پرسـیارم کـرد وتیان :

ـ ئەوە سێ ڕۆژە ، بەبێ ئاگادارییت ، چـاودێرییت ئەکـەین و ، لـە هـەموو ناوچەکانی ئەستەنبوڵدا سەرنجی ڕەفتارت ئەگرین ، نەمان دیـی هـیچ کـارێکی پێچەوانەی ئیسلام ئەنجام بدەیت، بگرە سەرەنجمان دا تـەنها سـەرگەرمی کـاری خۆتیت ، لەبەر ئەوە لە خوا ئەپاڕێینەوە لە کاروبارتدا سەرکەوتووت بکات،

بەڵێ ! براکانم ، هەروەك ئاگرێکی بچووك ، بگرە بـێ بایـەخ ، وەك دەنکـە شقارتە دارستانێکی چروپری گەورە بەرە بەرە ئەسووتێنێ و شوێنەواری ناهێڵێت، هەروەها سەیرکردنی ئـافرەت کـەم کـەم کـردەوەی موسـڵمان ئەسـووتێنێ و ، ئەشترسم سەرەنجامەکەی خراپ بێت .

[١٥٣] مەبەستی ئەوەیە، کە نەزەری حەرام و درۆی نەکردووە و ، شتیشی لە خەڵك وەرنەگرتووە .

پاشان وتی :

ـ سەعیدی کۆن، کە لە هەرەتی لاوێتییدا و ، لە ناوجەرگەی ئەستەنبوڵدا بوو، بە درێژایی(١٠)دە ساڵ ، سوپاس بۆ خوا ، تەنها جارێکیش نەزەری حەرامی نەکرد [١٥٤]

[١٥٤] ذکریات عن سعید النورسیی : ١٨ ـ ١٩ . رجل القدر : ١١٠ ـ ١١٢

## سێهەم : شۆرشی شێخ سەعیدی پیران

لە باسی شۆرشی شێخ سەعیدی پیراندا مامۆستا یاسایەکی جوانمان بۆ خزمەت کردن پیشان ئەدات، کە ئەڵێت :

لەو کاتەدا، کە سەرگەرمی وانەوتنەوەی حەقیقەتەکانی قورئان بووم، بە قوتابیەکانم لە شاری ( وان ) ، ڕووداوەکانی شۆرشی شێخ سەعید کاربەدەستانی دەوڵەتی بێزار کردبوون، جا هەرچەندە ئەوانە لە هەموو کەسێك بە گومان بوون، کەچیی خراپەیان بەرامبەرم نەکرد و ، تا من لەسەر خزمەتی قورئان بەردەوام بووم، هیچ بیانوویەکیان دەست نەکەوت، بەڵام، کە لە دڵی خۆمدا وتم : چییم داوە لە کەسانی تر و ، بیرم تەنها لە خۆم کردەوە و، کشامەوە بۆ کێوی ئەرەك تا لە ئەشکەوتە وێرانەکانیدا گۆشەگیر ببم و ، قیامەتی خۆم رزگار بکەم، ئەبینم هاتنە سەرم و لەو ئەشکەوتەدا گرتیان و ، لە پارێزگایەکی خۆرهەڵاتەوە نەفییان کردم بۆ پارێزگایەکی خۆرئاوا .. بۆردوور .[١٥٥]

ئەمە دەرسێکی گەورەیە تا موسڵمانان بەردەوام خەریکی خزمەتی قورئان بن و ئاور بەلای هیچ بەرژەوەندییەك‌دا نەدەنەوە، باکیان لە هیچ نەبێت .. با خەمی هیدایەتی خەڵکیان لە دڵدا بێت و بەس، ئیتر خوای گەورە هەموو کارێکیان بۆ ئاسان ئەکات .

لە کاتێکدا کە مامۆستا لەسەر کێوی ئەرەك بوو، شۆرشی شێخ سەعید هەڵگیرسا و سەرانسەری پارێزگاکانی خۆرهەڵاتی گرتەوە، ئەوەبوو فەرماندەی شۆرشەکە پەیوەندیی بە مامۆستاوە کرد و ، داوای لێکرد بەشداریی شۆرش

---

[١٥٥] اللمعات : ٦٧

بکات، بەڵام مامۆستا نوورسیی ئەم کارەی بە شتێکی سەلبیی لە قەڵەم دا و نامەیەکی بۆ شێخ سەعید نووسیی، کە تیایا هاتبوو :

ئەو شۆرشەی، کە ئێوە ئەنجامی ئەدەن وا ئەکات، کە برا برا بکوژێت و ، هیچ ئەنجامێکیشی نەبێت، جا ئوممەتی تورکیی ئاڵای ئیسلامی بەرز کردۆتەوە و ، لە پێناوی دینەکەیدا صەدان هەزار بگرە ملیۆنەها شەهیدی داوە ، سەرەرای پەروەردەکردنی ملیۆنەها ئەولیا ، لەبەر ئەوە نابێت شمشێر بە رووی نەوەکانی ئەو ئوممەتە پاڵەوانە قوربانیی دەرەی ئیسلامدا، ئوممەتی تورکیی ، رابکێشرێت و ، منیش بە رووی‌اندا رای ناکێشم ..[١٥٦]

وا قوتابیی دڵسۆز مەلا حەمید، کە لە وان و لەسەر کێوی ئەرەك لە خزمەتی مامۆستادا بووە، ئەو وت و وێژە پر مانایەمان بۆ ئەگێرێتەوە، کە لە نێوان مامۆستا و حوسین پاشای شێخی عەشیرەتی حەیدەراندا رووی دا، شایانی باسە، کە حوسەین پاشا لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمەوە بە پلەی ( میرئالای ) دامەزرا بوو، ئەمەش کاتێك، کە سوڵتان لە عەشیرەتە کوردەکان هێزی حەمیدیی لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا دامەزراند . حوسەین پاشا لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا سەرکەوتنی چاکی بەسەر هێزی رووس و ئەرمەندا بە دەست هێنا و ، زیانێکی زۆری لێ دان، بۆیە حکوومەتی ( إتحاد و ترقي ) و سوڵتان رەشادیش پلەیان بۆ ( أمیر اللواء ) بەرز کردەوە، حوسەین پاشا یارمەتیی کردنەوەی چەند قوتابخانەیەکی لە خۆرهەڵاتی وڵات و، لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەمدا داوە، بە عەدالەت و رێزگرتن لە زانایان بە ناوبانگ بووە، لەگەڵ

[١٥٦] تأریخ الحیاة . ئەم نامەیە لەگەڵ نووسراوە پارێزراوەکانی دادگای ئیستیقلال ، لە فایلی شێخ سەعیدی پیران دا پارێزراوە ( ب / ٥٣١ ) .

مامۆستا نوورسییش‌دا پەیمانی برایەتیی قیامەتیان بەستووە، هەرچەندە حوسەین پاشا بەشداریی شۆرشی نەکرد، کەچیی لەگـەڵ ئـەوانی تـردا نـەفیی کـرا بـۆ قەیصەریی، بەلاَم ئەو ژیانەی پێ بەسەر نەبرا ، ناچار دوای دوو ساڵ رای کرد بۆ سووریا و ساڵێك لەوێ مایـەوە ، هـەتا پیاوێـك بـە نـاوی ( مـدني ) هـات و قەناعەتی پێ کرد، کە بگەرێتەوە کوردستانی تورکیـا، کـە گوایـە حکومـەت عەفووی دەرکردووە بۆیان، کەچیی لە رێگادا، کە لەگەڵ دوو کورەکەیدا نوێژیان ئەکرد ، کابرا حسین پاشای کوشت، رەحمەتی لێ بێت .

مەلا حەمید ئەڵێت :

لەسەر کێوی ئەرەك لە پەرستگایەکی وێرانەدا لە خزمەتی مامۆستادا بووین، و رۆژێکیان حوسەین پاشا لەگەڵ دوو هاوەڵێدا هاتن بۆ سـەردانی مامۆسـتا دوای ئەوەی، کە ئەسپەکانیان بەو درەختانەوە بەستەوە، کە لە دەرگای پەرستگا وێرانەکەدا هـەبوون، چـوونە ژوورەوە لای مامۆسـتا و بەوپـەری ئەدەبـەوە لـە بەردەمیا چۆکیان دا و ، دەستیان ماچ کرد . حوسەین پاشا پیاوێکی بالآبەرزی خاوەن هەیبەت بوو و ، چەندین میدالیا و نیشانەی تایبەت بە پادشـاکانی ئـەو کاتەی بە خۆیەوە هەڵ واسیی بوو، دەستەسرێکی دەرهێنا، و نزیکەی نیو کیلۆ زێری تێدا بوو، و لە شوێنێك‌دا داینا

مامۆستا لێی پرسیی : ئەوە چییە ؟

وتی : گیانم بە قوربانت بێت ، ئەوە زەکاتی خۆمە و هێناومە بۆتان و ، لـە سامانی پاڵفتەی خۆم دەرم کردووە !

مامۆستا : لەوانەی دەوروبەرت ، لە خزمانت ، لە گوندەکـەت کەسـت شـك نەبرد وا هێناوتە بۆ ئێرە ؟

حوسەين پاشا : سەردارم ! خزمانم و ئەوانەی بە دەوروبەردان هەموو دەوڵەمەندن و ، هەژاريان لە ناودا نيە، منيش وام هاتە پێش چاو، کە ئێوە موستەحەققی ئەوەن .

مامۆستا : زەکات نابێت بگوازرێتەوە ، بۆچ هێناوتە بۆ ئێرە و ، ئەو هەموو گوند و دێهاتەت پەراندووە ؟

حوسەين پاشا : سەردارم ! تکا ئەکەم بە لايەنی کەمەوە چەند پارچە زێرێك وەربگرە و ، بەسەر ئەو قوتابيانەدا، کە لە گەڵتدان خەرجی بکە

مامۆستا : نەخێر ، شتی وەها نابێت .. من پێويستييم بە زەکات نيە .

بەم شێوەيە ئەو زەکاتەی گێرايەوە و وەری نەگرت، دوای کەمێك حوسەين پاشا رووی لە مامۆستا کرد و وتی : سەردارم ! بۆ کارێکی تايبەتيی راوێژێکم لە گەڵتان دا هەيە ، تکا ئەکەم فەرمان بدەی قوتابيەکان بچنە دەرەوە ، چونکە من ئەمەوێ باسێکی تايبەتييتان لەگەڵدا بکەم .

مامۆستا : ئەوە نابێت .. چونکە ئەوانە بەشێکن لە گيانم .. لێم جوێ نابنەوە .. چيت پێيە باسی بکە

حوسەين پاشا : سەردارم ! تکاکارم ئيزنمان بدەيت ( لەگەڵ شێخ سەعيددا ) ياخيی ببين ، بە راستيی ئێمە ئامادەين !

مامۆستا : بۆچ ياخيی ئەبن ؟ ئەگەر زەيد و عەمر تاوانيان هەبێت ، ئەی غەيری ئەوان تاوانی چيە ؟ تەنها ئەوەيە، کە خوێنی موسڵمانان ئەرژێت .

حوسەين پاشا : رووسەکان بە هيلاکيان بردين و ، کوشتينيان و ، ماڵ و منداڵمانيان لە ناو برد ، بەڵام شەرەفمان پارێزراو بوو، و کەس بە خراپە دەستی بۆ نەبرد، بەڵام ئێستا دينمان لە مەترسييدايە و ، شەرەفمان خەريکە هەتك

بکرێت، جا ئیزنمان بدە هەتا یاخیی ببین ، چونکە سەربازە پیادەکان و سوارەکانمان لە ئامادەباشییدان .

دوای ئەوەی، کە حوسەین پاشا کارەکەی روون کردەوە و رووداوە پڕ ژانەکانی گێڕانەوە و ، مامۆستاش سەری داخستبوو و نوقمی بیرکردنەوە بوو بوو ، مامۆستا سەری بەرز کردەوە و ، بە نەرم و نیانیی وتی : پاشا ! وەرە با راوێژ بە دیوانی ئەحمەدی جەزریی بکەین و ، بە تەفائولەوە بیکەینەوە ، ئایا جەزریی هەرچیی بڵێت قبوولی ئەکەیت ؟

پاشا : بەڵێ .

مامۆستا دیوانەکەی لە گیرفانیدا دەرهێنا و بە تەفائولەوە کردیەوە ، ئەبینن ئەم دێرە شیعرە وا لەبەر دەمیاندا :

من زی بیف دیری فەتین ، قصدا کنیشتی هن دکن

نەي زی فانم نەي زی وانم من دري خمار بس

واتە : هەیانە لە رێی کەنیسەوە ئەگەڕێتەوە و دێتە سەر دینی ئیسلام و ، هەشیانە ئەگەڕێتەوە بۆ پەرستگای جوولەکە و ئەبێتە جوولەکە، بەلاّم من نە لەوانەم و نە لەوانەشم .

مامۆستا وتی : پاشا ! دیت ؟ ئێستا من نە لە ئێوەم و نە لە ئەوانیشم .

حوسەین پاشا : مامۆستا گیان ! ورەت رووخاندم و هیممەتت لاواز کردم . ئەگەر بگەڕێمەوە ناو عەشرەتەکەم ئەڵێن: پاشا ترسنۆك دەرچوو وا وازی لە یاخیی بوون هێنا

مامۆستا وتی : بەڵێ ، با بڵێن : ترسنۆك دەرچوو و ، نەیوێرا ، بەلاّم نەڵێن : خوێن رێژە

كە پاشا ويستى خواحافيزيى لە مامۆستا بكات ، مامۆستا سێ جار دووبارەى كردەوە و وتى : پاشا ! خوێن نەرێژى .. خوێن نەرێژى .. خوێن نەرێژى .
ئيتر ئەوەبوو، حوسەين پاشا گەرايەوە لاى عەشرەتەكەى و چەكدارەكانى بلاّوە پێكرد ، بەمە لە ناوچەى واندا هيچ رووداوێك رووى نەدا ( ب ١ / ٥٥٧ ) .

## چوارەم : گرتن و دوورخستنەوەی

شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ١٣ / ٢ / ١٩٢٥ ز هەڵگیرسا و ،[١٥٧] لە ١٥ / ٤ / ١٩٢٥ ز کوژێنرایەوە و ، [١٥٨] شێخ سەعید و چل و حەوت لە هاوەڵانیشی لە ٢٩ / ٦ / ١٩٢٥ لە شاری دیاربەکر لە سێدارە دران و ،[١٥٩]شێخ سەعید لە کاتی لە سێدارەدان‌دا ئەوپەڕی دامەزراویی نواند ..

کە شۆڕش هاتە سەر رووخان و کۆتایی پێهات حکوومەتی تورکیا دەستی دایە گرتنی هەموو سەرۆك عەشایر و ریش سپیی و کەسایەتییە ناودارەکانی پارێزگاکانی خۆرهەلاتی تورکیا، کە یەکێك لەوانە پارێزگاری وان بوو ، ئەگەرچیی ئەو کەسانە دەستیشیان نەدابێتە شۆرش و لە دەوڵەت یاخیی نەبووبن و، رەوانەی خۆرئاوای ئەنادۆڵی کردن ، وەك بیەوێ ئەو کەسایەتییانە لە مەیدانی رووداوەکان دوور بخاتەوە ، تا هەڵ گەرانەوەی چەکدارانەی تر روو نەدات .

جا یەکێك لە قوتابییەکانی مامۆستا نوورسیی، کە ناوی ( عەلیی چاویش ) بووە، لە بیرەوەرییەکانیدا دەربارەی ئەو ماوەیە نووسیویەتی :

(( دوای ئەو زنجیرە گرتنانە پاگاندە وەها بڵاو بوویەوە کە حکوومەت نیەتی ئەوەی هەیە، کە مامۆستا نوورسییش بگرێت و دووری بخاتەوە ، لەبەر ئەوە هەندێ لە زانایان لەوانەی، کە دۆست و خۆشەویستی مامۆستا بوون ، بە تایبەت شێخ ئەنوەر تووشی دڵەراوکە بوو بوون بۆی و ، شێخ ئەنوەر ئەترسا مامۆستا نوورسیی تووشی ئازار ببێ ، لەبەر ئەوە بەردەوام و بە سووربوونەوە

---

[١٥٧] سيرة ذاتية : ١٨٧
[١٥٨] رجل القدر : ١٢٩
[١٥٩] رجل القدر : ١٢٩ ، سيرة ذاتية : ١٨٧

ئامۆژگارییمانی ئەکرد، کە پێویستە مامۆستا لە ( وان ) دەرچێت بۆ شوێنێکی هێمن . کاتێك کە لەو بارەوە زۆری دووبارە کردەوە ، پێم وت :

ـ گەورەم ! ئێمە ئەتوانین پارێزگاریی لە مامۆستا نوورسیی بکەین و پاسەوانیی بکەین ، ئەو تاقە کەسێکە ، بەڵام چاکتر وەهایە تۆ خۆت بپارێزیت .

شێخ ئەنوەر تووڕە بوو، و وتی :

ـ هەزار شێخی وەك شێخ ئەنوەر پارچە نینۆکێکی مامۆستا ناژین ، ئەوە تۆ چۆن ئەوێری بەراورد لە نێوان مامۆستا نوورسیی و شێخ ئەنوەردا بکەیت ؟!

لەو کاتەدا من لە لادێ بووم ، جا، کە هەواڵی گرتنی شێخ مەعصوومی موفتیی شاری ( وان ) م بیست ، ترسی زیاترم لێ نیشت و ، زۆریشی پێ نەچوو چاوم لێ بوو ئەفسەرێك لەگەڵ سێ سەربازدا بەرەو بنکەی مامۆستا سەرکەوتنە سەر شاخەکە )) .[١٦٠]

هەروەها قوتابیی نموونەیی ، مامۆستا زوبەیر گوندۆز ئاڵب دەربارەی گرتنی مامۆستا لە بیرەوەرییەکانیدا ئەڵێت :

(( مەفرەزە سەربازییەکە هەڵمەتی بردە سەر ئەو ئەشکەوتەی، کە مامۆستا ( بدیع الزمان ) بۆ خواپەرستیی تیایا گۆشەگیر بوو بوو، هەڵس و کەوتی فەرماندەی مەفرەزەکە بەرامبەر بە مامۆستا زۆر رەق و زبر بوو ، هەروەك بۆ گرتنی تاوانبارێك یان سەرۆکی دەستە جەردەیەك هاتبێ و ، بەرامبەر بوونەوەی مامۆستاش بەرامبەر بوونەوەیەکی بەهێز و ئازایانە بوو ، چونکە ئەی زانیی ئەجەل یەکێکە و ناگۆڕێت ئەگەرچیی هەموو دنیا لە دژی یەك بگرن، زۆر بە پەلە لەگەڵ خۆیاندا بردیان، کە ماوەیەك ڕۆشتن هەندێ قوتابیی مامۆستا و

---

[١٦٠] رجل القدر : ١١٨ ـ ١١٩

هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە لێیان نزیك کەوتنەوە و ، بە زمانێکی تر قسەیان لەگەڵ مامۆستا کرد [١٦١] قوتابیەکان ئامادەیی خۆیان بۆ فراندنی مامۆستا بۆ شوێنێکی تر ، یان فراندنی بۆ دەرەوەی سنوور ، بۆ هەر وڵاتێکی تری ئیسلامیی، دەربریی ، بەڵام مامۆستا قبووڵی نەکرد و ، پێی وتن، کە بە هەموو حەزێکی خۆیەوە لەگەڵ مەفرەزەکە ئەڕوات و ، سەربازەکانیش لە جێی قوتابیین بۆ ئەو و ، ئامۆژگاریی قوتابیەکانیش و خەڵکەکەیشی کرد، کە بەبێ دەنگ بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، ئا لەو کاتەدا یەکێك لە قوتابیەکانی سەرنجی دا، کە پێڵاوەکانی مامۆستا شڕن ، ڕۆیشت و جووتێك پێڵاوی نوێی بۆ هێنا ، بەڵام مامۆستا ـ وەك عادەتی هەمیشەیی بۆ وەرنەگرتنی دیاریی ـ لەسەر ئەوە پێی داکوتا، کە ئەبێت پارەی پێڵاوەکانی بۆ بگێڕێتەوە )) . [١٦٢]

بە شێوەی بروسکە دەنگ و باسی گرتنی مامۆستا بڵاوەی کرد و گەیشتە دانیشتوانی شاری وان، ئەو هەواڵە بۆ ئەوان وەك هەورە تریشقە وەها بوو، بۆیە خێرا هەزارەها پیاوی مەردیان هەڵمەتی دایە چەك و ، بریاریان دا بە هەر هێزێك بووە مامۆستا رزگار بکەن و بیفرێنن و دووری بخەنەوە بۆ شوێنێکی بێ وەی .

مەفرەزە سەربازییەکە مامۆستای هێنابووە وان و چاوەروان بوو، هەموو گیراوەکان لەوێ جەم بکەن و ئەوسا پێکەوە دووریان بخەنەوە

---

[١٦١] واتە بە زمانێك دواندیان ،کە ئەفسەرەکە و سەربازەکانی لێی تێ نەگەن، کە ئەویش زمانی بادینانی ناوچەکە بوو .

[١٦٢] رجل القدر : ١١٩ ، سيرة ذاتية : ٢٠٨ ـ ٢٠٩ ، من مذكرات زبير گوندوز آلب ، ب ١ / ٥٦٧ ، ش / ٢٧٣

دانیشتوانی وان مامۆستایان لەوە ئاگادار کرد کە ئەیانەوێ رزگاری بکەن و ، ئامادەن هەموو مەترسییەك لەو پێناوەدا قبووڵ بکەن، بەلاّم مامۆستا بە توندیی ئەوەی رەت کردەوە و پێی وتن :

**(( بە ویستی تەواومەوە بۆ باوەشی پر سۆزی ئوممەتی تورکیی ئەرۆم لە ئەنادۆڵ ... هیوای سەلامەتیی و بێ وەییتان بۆ ئەخوازم ))** [١٦٣]

بەم کارەی نەیهێشت جەنگ و هەرا لە نێوان حکومەت و دانیشتوان‌دا روو بدات و ، خوێن بە نارەوا برژێت .

کە هەموو ئەوانەی حکومەت ئەی ویست دووریان بخاتەوە دەست گیر کران و لە شاری وان کۆکرانەوە ، لە ٢٥ / ٢ / ١٩٢٥ لە وان دەرچوون، کە چەند صەد کەسێك ئەبوون ، لە پیاو و منداڵ و پیری پەك‌کەوتە ، هەر هەموو فرمێسکیان ئەرێژا و خواحافیزییان لە شار و نیشتمانەکەیان ئەکرد .. هەندێك سواری عەرەبانە بووبوون، کە ئەسپ رای ئەکێشان و ، هەندێکیش سواری عەرەبانەی خشۆك بوو بوون، کە ولاّغ رای ئەکێشان و ، هەندێکیش سواری ولاّغ بوون، و هەندێکیش بە پێ ئەو رێگا دوورەیان ، لەو زستانە سەختەدا ، لە نێو بەفرێکی زۆردا ئەبری و ، سەربازەکانیش هەر چوار دەورەی ئەو هەموو خەڵکەیان بە چەکەوە گرتبوو ..

ئەوەبوو دەستی چەپی مامۆستا نوورسییان بە زنجیرێکی ئاسن بەستبوو بە دەستی راستی شێخ مەعصوومی موفتیی ( وان ) ەوە

مامۆستا نوورسیی زۆر بە هێمنیی و لەسەرخۆ بەرێوە ئەچوو و ، کاری خۆی دابووە دەست خوا و پشت و پەنای تەنها هەر ئەو بوو، بێ ئەوەی بێزاریی دەر

---

[١٦٣] رجل القدر : ١١٩ – ١٢٠

ببڕێ ، جاری وایش ئەبوو سواری یەکێك لە خشۆکەکان ئەبوو، بەلاّم مـوفتیی، کە دوای چەند سەعاتێك لە ڕۆیشتن هەستی کرد وا پێستی دەستی بە زنجیرە ئاسنەکە داماڵڕاوە ، داوای لە سەربازە پاسەوانەکە کرد، کە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووە، کۆتەکەی بکاتەوە ، ئەویش لە وەلاّمدا بە توندیی بە قۆناغی تفەنگەکەی دای لە شێخ مەعصووم و بە دەمدا خستیە ناو قور و لیتەوە دیمەنێکی یەکجار دڵ تەزێن بوو .. مامۆستا نوورسییش قورەکەی بە دەم و چاویەوە ئەسریی و ، لە ئاوی کانیاوێك قورەکەی دائەشۆرد و ، ئامۆژگارییشی ئەکرد تا ئارام بگرێت ..

یەکێك لەو سەربازانەی، کە پاسەوانی ئەو کاروانە بوون و ناوی موصطفا ئاغریلیی بوو، دەربارەی ئەم گەشتە ئەگێڕێتەوە، کە کاتێك لە شاری واندا خەریکی ئەنجامدانی خزمەتی عەسکەریی ئەبێت دەنگ و باسی مامۆستا نوورسیی ئەبیستێت و حەز ئەکات بی بینێت، جا کە ئەی کەنە پاسەوانی کاروانی دوورخراوەکان بە هەلی ئەزانێت تا بی بینێت .. ئەڵێت :

کە کاروانەکە کەوتە ڕێ وەرزی زستان بوو، و بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیی بوو، و نزیکەی ( ٧٠ ـ ٨٠ ) عەرەبانەی خشۆك، کە ئەسپ یان گاجووت ڕایان ئەکێشان لەگەڵ کاروانەکەدا بوون، بەر لەوەی گەشتەکە دەست پێبکات دەست نوێژم گرت و خۆم ئامادە کرد بۆ نوێژ، فەرماندەکە منی کردە پاسەوانی عەرەبانە خشۆکەکەی ( بدیع الزمان ) ، بەلاّم نەم ئەناسیی چونکە هێشتا نەم دیی بوو .. جا هەر چەندە خشۆکەکانی تر پڕ بوون لە کەل و پەل ، خشۆکەکەی

( بديع الزمان ) هیچ کەل و پەلێکی تێدا نەبوو و ،[١٦٤] خۆیشی بە تەنیا بـوو .. شاڵێکی سپیی ئەدا بەسەریدا ، پاشان مێزەرێکی درێژی ئەبەست و ، سمێڵێکـی پری هەبوون ، بەلاَم بەبێ ریش ..

هاتم و لەگەڵیا سواری خشۆکەکەی بووم و ، هێشتا نازانم ئەمە مەلا سەعیدی مەشهوورە، بەناو سەفەرییەکان‌دا چاوم ئەگێرا و ، لە خۆم ئەپرسیی: تۆ بڵێی لە کوێ بێت ؟ من بەدوای کەسێکی ریش‌داردا ئەگەرام، کە جبەیەکی لەبەر کردبێ بە شێوەی زانای دینیی، کە کاروانەکە کەوتە رێ سەرنجم دا وا دوو کەس جل و بەرگی زانایانیان لەبەردایە ، منیش لە خـۆمم ئەپرسـیی : تـۆ بڵێـی کامیـان سەعیدی کوردیی مەشهوور بێت ؟

بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندێك، کە دانیشتوانی بە گـەورە و بچـوکەوە هاتنـە پێشوازییمان .. فەرماندەی گەشتەکە گیری خوارد بوو ، چونکە بیری ئـەکردەوە چۆن لەم گوندە کوردییەدا شەو بمێنێتەوە و ، بتوانێ پاسەوانیی ئەو خەڵکە بکات و نەهێڵێ کەسێکیان لێ را بکات ؟ نەئەکرا نەفیی کراوەکان بەسـەر ماڵـەکانی گوندەکەدا دابەش بکرێن، لە کۆتاییدا بریاری دا هەر هەموو لە شوێنێکدا جەم بکات تا پاسەوانییان ئاسان بێت، هەر وایش بوو، بەلاَم کوردەکانی دانیشتوی گوندەکە پێشوازییەکی چاك و بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێ کردین و ، وتیان ئەو خەڵکە میوانی ئەوان ئەبێت و ، ناهێڵن فەرماندە و سەربازەکان هیچ خواردنێك لێ بنێن ، چونکە ئەوان خواردنی نەفیی کراوەکانیش و سـەربازەکانیش ئامـادە ئەکەن .

---

[١٦٤] چونکە مامۆستا لەسەر کێوی ئەرەك دایان گرتە خوارەوە و خەریکی خواپەرستیی بوو، و هـیچ کـەل و پەلێکی نەبوو .

فەرماندە پێمی وت : ئەم ئێوارەیە لەگەڵ مامۆستا ئەبیت و شەویش لە گەڵیا ئەخەویت، تا ئەو کاتە نەمئەزانی ئەمە کێیە و ، ئەشترسام بە تەنیا نەتوانم چاودێریی بکەم ، بەلاَم فەرماندەکە دڵی بێ خەم کردم و وتی :

(( تۆ ئەچیت لە گەڵیدا لە هیچ نەترسی .. هیچ شتێك روو نادات ، چونکە ئەوەندەی منداڵێك پاك و بێ تاوانە )) . پاشان هەواڵی دامێ، کە ئەمە مەلا سەعیدی کوردییە، کە ئەو کاتە ئەو نازناوەی لێنرا بوو .

چووین بۆ ژوورەکە، .. ژوورێکی بچکۆلە بوو، کە تەنها جێی خەوتنی دوو کەسی تێدا ئەبوویەوە، خەڵکی گوندەکەش بە دەورماندا ئەسوورانەوە و بە هاتنمان پێ خۆشبوونیان دەرئەبریی لە هەموو لایەکەوە دەوریان دابووین ، هەروەك چاوەروانی ئاماژەیەکی ( بدیع الزمان ) بن ، بەلاَم ( بدیع الزمان ) رێی نەئەدان هیچ شتێك روو بدات، بۆ ئێوارە چەندین جۆری خواردنیان بۆمان هێنا، بەلاَم مامۆستا وتی من نەخۆشم ، لەبەر ئەوە دەستی بۆ خواردنەکە درێژ نەکرد، بەلاَم منی خولك کرد، پاشان نوێژی عیشامان کرد و ، دوای ئەوەش جێگەیەکیان بۆی راخست و ، لە نزیك دەرگاکەشدا جێگەیەکیان بۆ من راخست، ئەوەندەش گێژ و نەفام بووم گومانم بە دڵدا ئەهات و ئەم وت : ئەی ئەگەر شەو تفەنگەکەمی فراند و رۆیشت ؟ بەلاَم ئەو هیچ نیەتێکی وەهای نەبوو .. پیاوێکی مەزنی خاوەن هەیبەت و ویقار بوو .. بە هەموو جلەکانمەوە لەسەر جێگەکەم راکشام ، بەلاَم ئەو نوێنەکەی پێچایەوە و ، پاڵی پێوە دا .. سەرم لێی سوور ما : بۆچ ناخەوێت ؟ نیەتی چیی بێت بیکات ؟ ئەوەندەی پێ نەچوو خەو زۆری بۆ هێنام و خەوم پیا کەوت ..

دوای ماوەیەك بە دەنگی جووڵەیەك بەخەبەر هاتم ، چاوم کردەوە ئەبینم وا فانۆسێکی زەیتی بە دەستەوەیە و چووە دەرەوە و ، لە حەوشەکەدا، کە بە بەفر

داپۆشرا بوو، دەست نوێژی گرت ، پاشان بۆ نوێژکردن بە پێوە وەستا و ، شەوەکەی بە نوێژ و خواپەرستیی بەسەر برد

کە زانیی من بەخەبەرم ئاوری دایەوە بۆ لام و پێمی وت :

(( هێشتا کاتی زۆرت لەبەردەمدایە بۆ خەوتن .. ئێمە لەسەر مەزهەبی شافعیین و زوو لە خەو هەڵ ئەسین ، بەلاّم ئێوە لەسەر مەزهەبی حەنەفیین و ، ئەتوانیی دوای ماوەیەکی تر نوێژ بەجێ بهێنی )) . بەلاّم لە راستییدا زوو لە خەو هەڵ نەستا بوو، چونکە لە بنەرەتدا هەر نەخەوت بوو، منیش نەخەوتم بەڵکو هەستام و دەست نوێژم گرت و لەگەڵیا نوێژی فەجرم بەجێ هێنا

لە ژوورەکەدا زۆپایەك هەبوو .. مامۆستا هەستا و هەندێك ئاوی بەسەریەوە کولاّند و ، زەمبیلەیەکی بچووکی پێ بوو ، هێلکەیەکی تیا دەرهێنا و کولاّندی ..لەو کاتەوە کە لە شاری وان دەر چوو بووین چەندین سەعاتی دوور و درێژ بوو، کە ئەمە یەکەم جار بوو، مامۆستا لەو بەیانییە زووەدا خواردن بخوات ..

پاشان کەل و پەلی ریش تاشینی دەرهێنا و ریشی تاشیی ..

ناوی گوندەکەم لە بیر نەماوە .. بەردەوام لەو گوندانەی، کە لەسەر رێگامان بوون شەو ئەماینەوە، چاودێری مامۆستام ئەکرد ئەبینم بایەخی زۆر بە پاك و خاوێنیی و ریش تاشین و خواپەرستیی ئەدات .. خواردنی کەسیشی نەئەخوارد

فەرماندەی گەشتەکەش ( صائم بگ ) رێزی زۆری لە مامۆستا ئەگرت ، بەلاّم نەی ئەتوانیی بایەخی پێ بدات و بە تایبەتیی چاودێریی لێوە بکات ، چونکە لە خۆی ئەترسا

کاروانی نەفیی کراوان لە ( وان ) ەوە بە رێ کەوت و بە ( ئەرجەش )دا تێپەرین و ، لەویشەوە بۆ ( پاتنوس ) کە چوار رۆژ لەوێ پشوویان دا و ، پاشان

رووی لە شاری ئاغری نا و ، رۆژێك تیایا مایەوە، لەویشەوە چوون بۆ ( أرضروم ) و ، حەفتەیەك تیایا مانەوە و ، پاشان بەرەو ( طرابزون ) رۆیشتن و، بیست رۆژی تیا مانەوە ، پاشان بە پاپۆر بەرەو ئەستەنبوڵ رۆیشتن و بەهار گەیشتنە ئەوێ و، ( ٢٠ ـ ٢٥ ) رۆژ تیایا مانەوە [١٦٥]

شایانی باسە کە نەفیی کراوەکان جگە لە مامۆستا نوورسیی و ، حوسەین پاشا و ، شێخ مەعصووم هەر هەموویان لە ساڵی ١٩٢٨دا ، واتە دوای سێ ساڵ ئازاد کران و گەرانەوە بۆ شاری وان . [١٦٦]

مامۆستا گەیشتە ئەستەنبوڵ و ، لەوێ لەبەر ئەوەی، کە پەیوەندیی بە ( دار الحکمة الإسلامیة ) وە بوو، کە سەر بە ( المشیخة الاسلامیة ) بوو و ، ماوەیەك بۆ خزمەتی قورئان لەوێ کاری کرد بوو ، پرسیاری دەربارەی بارودۆخی ( المشیخة الأسلامیة ) کرد

وەڵامی زۆر خراپی وەرگرت .. وەڵامێك، کە رۆح و دڵ و فیکری هاتنە شۆکە و، گریانێکی تاڵیشیان کرد ئەو شوێنە پیرۆزە، کە بۆ صەدان ساڵ مایەی پەخشان کردنی نوور و ئەنوار بوو ، کرابوویە دواناوەندیی کچان و ، شوێنی بەرەڵایی، هەروەك دنیا بەسەریا برووخێت ، هیچی بۆ نەمایەوە هەناسە هەڵ کێشان نەبێت .. ناچار کاری دایە دەست خوای بەدەسەڵات .. [١٦٧]

---

[١٦٥] رجل القدر : ١١٩ ـ ١٢٢ ، سیرة ذاتیة : ٢٠٩

[١٦٦] رجل القدر : ١٢٩

[١٦٧] سیرة ذاتیة : ٢٠٩ ـ ٢١٠

پاشان فەرمان دەرچوو تا بنێررێت بۆ شاری ( بۆردوور )، ئەوەبوو لەگەڵ پاسەوان‌دا سواری کەشتیی کرا و ، بەرەو ئەزمیر و ، لەوێشەوە بۆ ئەنطالیا و ، لەوێشەوە بەرەو بۆردوور رەوانە کرا [١٦٨] ئەمەش لە ٢٩ / ٤ / ١٩٢٦ دا

کاربەدەستانی بۆردوور بە توندیی چاودێریی نەفییکراوەکانیان ئەکرد و ، نەفیی کراوەکان لە سەریان پێویست بوو هەموو ئێوارەیەك لەلای پۆلیس ئامادە بوونی خۆیان بسەلمێنن ، بەلاّم مامۆستا نوورسیی و قوتابیەکانی چاوپۆشییان لێ کرا ، چونکە خەریکی خزمەتی قورئان بوون .. هەتا والیی شار بەلای ( فوزي پاشا ) وە [١٦٩] شکاتی ئەم حاڵەتەی کردن و ئەویش ئامۆژگاریی والیی کرد تا رێز لە مامۆستا بگرن و ، دژی نەجووڵێنەوە! جا مامۆستا دەری ئەبرێت، کە کەراماتی خزمەتی قورئان بۆتە هۆی ئەوەی ئەو قسەیە دەرهەقیان بکات . [١٧٠]

لەو کاتەدا کە نەفیی کران، بەشێك لە سەرۆك عەشیرەتە نەفییکراوەکان لەگەڵ مامۆستادا بۆ بۆردوور داوایان لە مامۆستا کرد، کە زەکاتی ئەو پارەیەی، کە پێیان بوو، لێیان وەربگرێت ، تا مامۆستا تووشی دەست کورتیی نەبێت ، چونکە ئەیان زانیی ئەو پارەی کەمی پێیە، مامۆستا زەکاتەکەی دانە دواوە، و بەو سەرۆکە دەوڵەمەندانەی وت : هەرچەندە پارەکەی من یەکجار کەمە ، بەلاّم من دەست پێوەگرتنم هەیە و ، لەگەڵ قەناعەتیش راهاتووم، کەواتە من زۆر لە ئێوە دەوڵەمەندترم، بەمە ئەو داوا زۆرە و پێ لێ داکوتانەی ئەوانی دایە دواوە ئەوەبوو بەشێك لەوانەی، کە پارەیان بۆ مامۆستا ئەگرت ، دوای دوو ساڵ، بە

[١٦٨] رجل القدر : ١٢٢

[١٦٩] مەبەست لە مارشاڵ فەوزیی چاقماق بووە، کە لەو کاتەدا سەرۆکی ئەرکانی سوپا بووە، و سەردانی بۆردووری کردووە

[١٧٠] سيرة ذاتية : ٢١٠ ، رجل القدر : ١٢٣

بۆنەی ئەوەوە، کە دەستیان پێوە نەگرت ، بوون بە ژێـر قـەرزەوە ، بـەڵام پـارە کەمەکەی مامۆستا ، بەشی کرد و ، لەبەر موحتـاجیی ئـاوی رووی نـەتکا و، دەستی بۆ هیچ کەس پان نەکردەوە و ، ئەو یاسا جوانەی بە چاکیی پاراست، کە بۆ سەرانسەری ژیانی بریاری دابوو، کەوا هیچ لە هیچ کەس وەرنەگرێ .

ئەمە یاسایەکی هەمیشەی خوای گەورەیە، کە ئەوانـەی تەمـەنیان ئەخەنـە خزمەتی دینی خواوە ، خوای گەورە بە هێز و قودرەتی خۆی چاوی مەرحەمەتی خۆی لێیان کلا ناکات و ، بە چاکیی چاودێرییان ئەکات . هەر کەسیش تەمەنی نەفرۆشێ بە خوا هەرچیی بکات هەر مایە پووچ ئەبێت ..

مامۆستا حەوت مانگ لەم شارەدا ئەمێنێتەوە و ، پـەیامی : ( المدخل إلی النور ) دائەنێت ، کە بریتییە: لە سیانزە دەرس لـە حەقیقەتـەکانی ئیمـان و ، دەروونی بەدخواز دەم کوت ئەکەن و ، بەرامبەر وەسـتانێکی سـەعیدی نـوێ و سەعیدی کۆنە .. [١٧١]

لەو ماوەیەدا لە بۆردوور مامۆستا دڵی ئەچێتە سەر ئەوەی، کە هەوڵی رزگار کردنی خۆی و چاك کردنی قیامەتی بدات ، بۆیە بە شێوەیەکی کاتیی لە خزمەت کردنی قورئان سارد بوویەوە و ، لە ئەنجامدا زللەیەکی میهرەبانیی بەر کەوت و ، بە پێچـەوانەی مەبەسـت و ئـاواتی خـۆی نـەفیی کـرا بـۆ شـوێنێکی تـر بـۆ ئیسپارتە [١٧٢]

لە ئیسپارتەش مامۆستا دەستی دایە خزمەتی قورئانی مەزن .. بەڵام دوای تێبەربوونی بیست رۆژ لەسەر خزمەتی قورئان لەلایەن هەندێ ترسنۆکەوە ئاگادار

---

[١٧١] سيرة ذاتية : ٢١٠ – ٢١١ ، رجل القدر : ١٢٤

[١٧٢] سيرة ذاتية : ٢١١

کرا کە لەوانەیە کاربەدەستانی ئەو شارە ئەو کارەی ئەویان بە دڵ نەبێت ، بۆیە وەها چاکە پەلە نەکات و لەسەرخۆ بێت، دیسان دەستی دایە خۆ چاك کردن و بایەخ دان بە خۆی و ، بە دۆستانیشی راگەیاند، کە هات و چۆی نەکەن و ، دیسان لە مەیدانی کارکردن بۆ ئیسلام کشایەوە و ، جارێکی تر زللەی لێ درایەوە و ، بۆ شوێنی سێهەم ، بۆ بارلا نەفیی کرا [١٧٣]

[١٧٣] سيرة ذاتية : ٢١٢

# بارلا قوتابخانەی نووریی یەکەم

۱ / مارت / ۱۹۲۷ ـ ۲۵ / نیسان / ۱۹۳۵

### یەکەم : بەرەو بارلا

لە نێوان ساڵەکانی ۱۹۲۲ ، هەتا ۱۹٤۰دا کۆمەڵە یاسا و بریارێـك بەسـەر گەلی تورکیادا سەپێنران بە هیوای ئەوەی بتوانن ئیسلام لە ریشە دەر بهێنن و ، شۆڵەی ئیمان لە دڵی ئەو میللەتە بەغیرەتەدا دەربهێنن، کە بـۆ مـاوەی شـەش سـەدە ئـاڵای ئیسـلامی بـەرز کـردەوە و ، لـەو مـاوە دوور و درێـژەدا بـووە پاسەوانێکی ئەمینی خۆبەخش بۆ بیروباوەری ئیسلام ..

دەرسی دین لە هەموو قوناغەکانی خوێندندا قەدەغە کرا

ژمارە و پیتە عەرەبییەکان بۆ نووسین گۆرران بۆ لاتینیی ..

بانگ و قامەتی شەرعیی بە زمانی عەرەبیی قەدەغە کران ..

هەوڵی ئەوە درا، کە قورئان تەرجەمە بکرێت بۆ تورکیی و ، هەوڵیش درا ئەو تەرجەمەیە لە نوێژدا بخوێنرێت ..

جاری عەلمانیەتی دەوڵەت درا .. واتە نابێت هیچ چالاکییەك بۆ بەرژەوەندیی ئیسلام بنوێنرێت ..

چاپکردنی کتێبی ئیسلامیی یاساخ کرا

خەڵك ناچار کرا جل و بەرگی ئەورووپییانە بپۆشێت ، پیـاوان شـەبقە لەسـەر بکەن و ، ئافرەتانیش جلی سفوور و رووت .

دادگا دانران و ، ترس و لەرز برایە دڵی خەڵکەوە ، تـا هـیچ کـەس نـەوێرێ نارەزایی لە بارودۆخی وڵات دەربڕێ ..

چەندین زانای بەرێز لە سێدارە دران ..

چەندین زانای پایەدار وڵاتیان بەجێ هێشت .. [١٧٤]

خەڵکیی لە ترساندا قورئانیان ئەشاردەوە و ، نەیان ئەهێشت پیاوانی دەوڵەت بیبینن .

رۆژنامەکان دەستیان دایە بڵاوکردنەوەی بێ رەوشتیی و ، گاڵتەیان بە دین و ئیمان ئەکرد و ، کتێبی ئیلحادیی بڵاو بوونەوە

مامۆستای قوتابخانەکانیش هەوڵیان ئەدا دیـن و ئیمـان لـە دڵ و دەروونـی قوتابیەکانیاندا بسرنەوە ، بەوەی، کە فەلسەفەی ماددییان ئەبردە مێشکیانەوە و، ئینکاریی خوا و پێغەمبەر و زیندووبوونەوەی قیامەتیان ئەکرد

دەوڵەتیش بە هەموو هێزێکیەوە هەوڵی ئەدا پەیوەندیی میللەت بـە دیـن و قورئانەوە بپچڕێت، ئەوەبوو دەوڵەت بڕیاری دا موصـحەفەکان لـە مـاڵان کـۆ بکاتەوە و ، بیانسووتێنێ ، بەڵام، کە سەرنجیان دا ئەوە کارێکی گرانە ، هاتنە سەر ئەو بڕیارە، کە بەرەیەکی نوێ دوور لە قورئان و ئیمان پێ بگەیەنن .

---

[١٧٤] زۆرێك لە زانا و ئەدیبان وڵاتیان بەجێ هێشت بۆ ئەوەی شەپقە لەسەر نەکەن ، هەر لەو کاتەدا لە چـەند لایەکەوە شۆڕش بەرپا بوو دژی بڕیارەکانی دەوڵەت . لە ١٤ / ١١ / ١٩٢٥ لە سێواس و ، لە ٢٥ / ١١ لە أرضروم و ، لە ٢٧ / ١١ لە مرعش و ، لە ٢ / ١١ لە رێزە و هەمووشیان بە زۆر دامرکێنراونەتـەوە . ( ب / ٥٢٦ ) . یەکێك لە جەللادەکان، کە ناوی ( قارا علي ) بوو بۆ ڕۆژنامەیەکی دەربڕیی، کە لە ماوەی دوانزە ساڵی ڕابردوودا بـە دەسـتـی خـۆی(٥٢١٦)پێـنـج هـەزار و دووصەد و شـانـزە کەسـی لـە سـێدارە داوە ( صـۆن پـۆسـطـە ، ٣ / ٣ / ١٩٣١ )

نموونەیەکی دژایەتیی دەوڵەت بۆ ئیسلام و زانایان بریتیی بوو، لە داگرتنی مامۆستا نوورسیی لەسەر کێوی ئەرەك، کە بۆ خواپەرستیی کەناری گرتبوو و، نەفیی کردنی بۆ بارلا، کە شارۆچکەیەکی بچکۆلە بوو، لە شوێنێکی دوور و کەناردا ، تا هیچ کەس نەگاتە لای و ، باسی نەمێنێ و ، ئەو سەرچەمە زوڵاڵە وشك ببێت ..

بەڵام مامۆستا نوورسیی نەی‌هێشت ئەو پیلانەی دوژمنان سەربگرێت ، بەڵکو دەستی دایە خواپەرستیی و ، خزمەتی حەقیقەتەکانی قورئان .. نەی هێشت ساتێك لە ژیانی بە فیڕۆ بڕوات .. رووی کردە قورئانی پیرۆز تا ئەویش فەیز و بەرەکەتی خۆی بۆ هەڵ بڕێژێ و دڵەکەی پڕ لە نووری ئیمان بات .. سەرەنجام کانیاوی پەیامەکانی نوور هەڵ قوڵا و ، بووە مایەی دەرمان کردنی دڵ و دەروونی مامۆستا خۆی و ، دەرمان‌کردنی دۆست و خۆشەویستانی، کە بە نهێنیی و بێ ئاگاداریی کاربەدەستان پەیامەکانی ئەگەیاندە دەستیان ..

بە مامۆستایەتیی قورئانی پیرۆز دەستی دایە کارکردن بۆ ( رزگارکردنی ئیمان ) ، تا لەو سەردەمە تاریك و ناهەموارەدا ببێتە هەڵ گری رووناکیی تا ئیمانی ئەو گەلە سەرگەردانە رزگار بکات، کە بە هەموو شێوەیەك نەخشەی گومراکردنی بۆ ئەکێشرا

کاری پیرۆز بە مامۆستا نوورسیی سپێررا ، تا لە بارلای خنجیلانەوە نووری ئیمان پەخشانی سەرانسەری وڵات بکرێت ..

ئیتر هەتا ئەوانی دوژمن بە دین سزا و ئازاری زیاتری مامۆستایان بدایە و، هەتا زیاتر تەنگیان پێ هەڵ بچنیایە و ، هەتا زیاتر ستەمیان لێ بکردایە، مامۆستا زیاتر غیرەتی ئەجوولا و ، چاکتر دەستی بە قورئانی پیرۆزەوە ئەگرت و، حەقیقەتەکانی قورئان و ئیمانیش زیاتر ئەگەشانەوە

ئەو سزا و ئازارانەی ،کە بە مامۆستا ئەچێژران گەرمیی و غیرەتێکی وەهایان بە کارەکە بەخشیی ، زۆربەی شارەکان بوونە قوتابخانەی نوور، و خزمەتەکە لە بارلادا بە تەنیا نەمایەوە

وایان ئەزانیی لە بارلادا بەندی ئەکەن و ، هیچ کارێکی بۆ ئەنجام نادرێت، کەچیی بارلا بووە کورسیی و مێزی دەرس خوێندن و نووری ئیمانی لێ بەرز ئەبوویەوە [175]

بەڵێ بریار درا مامۆستا نوورسیی لە ئیسپارتەوە بگوازرێتەوە بۆ بارلا ئەوەبوو هێنایانە ئەگریدیر هەتا لە رێی دەریاچەی ئەگریدیرەوە ، بە بەلەمی چارۆکەدار بگوازنەوە بۆ پەخشداریی بارلا، کە لەوبەری دەریاچەکەوە بوو ..

جا وا شەوکەت دەمیرئای ، ئەو سەربازەی، کە مامۆستا نوورسیی گەیاندە بارلا لە بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەو گەشتەمان بۆ ئەکات :

(( بەیانییەکیان لە ئەگریدیر بووم بانگیان کردم بۆ بنکەی شارەوانیی .. چووم بۆ ئەوێ ئەبینم وا قائیم مەقام و ، فەرماندەی جەندرمە لەگەڵ ئەندامانی دەستەی شارەوانیی و ، پیاوێکی میزەر بەسەریش لە گرێی چوارەمی تەمەنیدا، کە جبەیەکی لە بەردا بوو، و خاوەنی دیمەنێکی پر لە ویقار بوو وان لەوێ .

فەرماندەی جەندرمە پێمی وت :

ـ کورم ! گوێ بگرە لەسەرت پێویستە ئەم مامۆستایەمان، کە بە ( بدیع الزمان ) ناسراوە بەریت بۆ بارلا، ئەم فەرمانبەرییەت یەکجار گرنگە کاتێك، کە لەوێ تەسلیمی بە بنکەی پۆلیس ئەکەیت ، با لە سەر نووسراوە رەسمییەکان ئیمزا بکەن ، پاشان هەواڵمان بدەرێ .

---

[175] سيرة ذاتية : ٢١٦ ـ ٢١٨

وتم : زۆر چاکە گەورەم !

لەگەڵ مامۆستا کەوتمە ڕێ و ، لە ڕێگا پێم وت :

ـ مامۆستا گیان ! تۆ لە جێی باوکمی و ، ئەمەش فەرمانبەرییە و دراوە بەسەرمدا ، هیوادارم لێم زویر نەبیت ))

پاشان سەربازەکە وەسفی ئەو گەشتەی بەلەمەکە ئەکات و ئەڵێت :

(( دنیا زۆر سارد بوو، چونکە وەرزی زستان بوو، و ئاوی دەریاچەکەش لێرە و لەوێ بەستبووی و ، یەکێك لە سەوڵ لێدەرانی بەلەمەکەش بە داردەستێکی درێژ سەهۆڵی بەردەمی بەلەمەکەی ئەشکاند و ، ڕێی بۆ بەلەمەکە ئەکردەوە

مامۆستا ( بدیع الزمان ) دەستی بە دابەش کردنی هەندێ مێوژ و هەندێ شیرینیی کرد بەسەرماندا من زۆر بە وردیی سەرنجیم ئەدا .. سەیرم کرد پیاوێکی یەکجار هێمن بوو، و سەرنجی دەریاچەکە و چیاکانی دەوروبەرمانی ئەدا و لێیان ورد ئەبوویەوە

جا چونکە ڕۆژگار کورت بوو کاتی نوێژی عەسر زوو هاتە بەرەوە .. ویستی بە پێوە نوێژ بکات ، ئێمەش بەلەمەکەمان ڕوو کردە قیبلە گوێم لێی بوو وتی :

ـ الله أكبر !

لە هەموو ژیانمدا تەکبیرەی وەها بەسام و خشووعم نەبیستبوو .. هەستم ئەکرد، کە مووی لاشەمان گرژ بوو .. جم و جووڵ و هەڵس و کەوتی لە هەڵس و کەوتی ئەو مامۆستایانە نەئەچوو، کە ئێمە ناسیبوومان ..

ئەوپەری هەوڵمان ئەدا بەلەمەکە ڕوو بە قیبلە بووەستێ کاتێك کە مامۆستا لە نوێژەکەی بوویەوە ، ئاوری بۆ لامان دایەوە و وتی :

ـ سوپاستان ئەکەم ، براکانم ! ماندووم کردن !!

پیاوێکی خاوەن تەوازوع و رەوشت جوان بـوو .. ئـەوەبوو دوای دوو سـەعات گەیشتینە بەندەری بارلا و ، لەوێ چاوم بـە ( برهـان ) کـەوت ، کـە چـاودێری بەندەرەکە بوو و بانگم لێکرد : ( وەرە کورم ! ) .. بە پەلە خۆی گەیاندە لامان و، منیش زەمیلە و کەل و پەلەکەی مامۆسـتام دا پێـی و خسـتمانە سـەر پشـتی ولاّغ ..

لەو کاتەدا موحەممەدی خاوەنی بەلەمەکە دەستی دایە تفەنگەکەی ( محافظ )، بە نیازی ئەوەی، کە باڵندەی ( بەشق ) راو بکات . بەلاّم ( بدیع الزمـان ) لـەوە قەدەغەی کرد و وتی :

بەهار نزیکە و ، ئەمە وەرزی هێلکەکردنی ئەم باڵندانەیە ، لەبەر ئـەوە لـەم کاتەدا راوکردن کارێکی چاك نیە ، من وەهای ئەبینم واز لەمە بهێنی .

بەمە لـە تەقـەکردن قەدەغـەی کـرد و ، باڵنـدەکان هـەڵ فـرین و ، بەسـەر سەرمانەوە ئەفرین .

تفەنگەکەم بە شانی چەپم دا هەڵ واسیی و ، دەستی چەپی مامۆستام گرت و ، لەسەر خۆ بە شاخەکەدا سەر کەوتین .

دوای نزیکەی سەعاتێك بەرێوە چوون گەیشتینە بارلا و ، ئەو باڵندانەش کە لە لێواری بەندەرەکەدا هەڵ فرین ، هـەر بەسـەر سـەرمانەوە بـوون و لێمـان جـوێ نەئەبوونەوە

کە چووینە بنکەی پۆلیس، کە نووسا بوو، بە مزگەوتەکەی بارلاوە و ، نـاوی ( آق مسجد ) بوو ، واتە مزگەوتی سپیی ، دەمەو ئێوارە بوو ( بەحریی بابا ) ی بەرێوبەری ناحیە ، هەروەها لێ پرسراوی بنکەکە لەوێ بوون .. ( بدیع الزمان ) م تەسلیم کردن و ، داواشم کرد نووسراوەکانم بۆ ئیمزا بکـەن ، ئـەوانیش ئیمزایـان

كرد .. ئەو شەوەمان لەوێ بەسەر برد و ، بۆ بەيانيی گەرامەوە بۆ ( ئەگريدير ) )) ..[١٧٦]

بەڵێ مامۆستا نوورسيی لە ١/ ٣ / ١٩٢٧ دا [١٧٧] گەيشتە بارلا كە سەر بە پارێزگای ئيسپارتەيە و يەكەم شەوی لە بنكەی پۆليس بەسەر برد .. پاشان خانوويەكی بچكۆلەيان بۆی ئامادە كرد، كە بريتيی بوو لە دوو ژوور، و ئەی روانيی بەسەر لەوەرگاكانی بارلا و ، باخ و باخاتەكانيدا، كە هەتا دەرياچەی ئەگريديری سازگار درێژ ئەبوونەوە و ، سپيی چنارەكەش لە بەردەم خانوەكەيدا بوو ..

دارتاشێك لە تەختە ژوورێكی بچكۆلەی سەرنەگيراوی دروست كرد و خستيانە نێوان لق و پۆپی درەختەكەوە ، ئيتر ئەوە بوو مامۆستا زۆربەی كاتی لە بەهار و هاوين‌دا ، كە خەريكی خواپەرستيی ئەبوو ، لەوێ بەسەر ئەبرد و ، زۆربەی كاتيش هەتا بەرەبەيان خەريكی بيركردنەوە و سەرنج‌دان بوو ..

ئيتر دانيشتوانی بارلا نەيان‌ئەزانيی مامۆستا كەی ئەخەوێت و ، كەيش لە خەو هەڵ ئەسێت ، چونكە هەر كەسێك لە هەر كاتێكی شەودا بەلای ئەو درەختەدا تێپەری بكردايە گوێی لە ذيكر و تەسبيحات و خواپەرستيی مامۆستای خواناس بوو ..

مامۆستا هەميشە نەخۆش بوو، و كەمتر دەستی بۆ خواردن درێژ ئەكرد، بەڵكو ئەتوانين بڵێين سەرانسەری تەمەنی بە نيوە برسيی و نيوە تێر بەسەر بردووە،

---

[١٧٦] سيرة ذاتية : ٢١٨ ـ ٢١٩ ، رجل القدر : ١٢٤ ـ ١٢٦

[١٧٧] ئەمە بە پێی بۆچوونی بەرێز نجم الدين شاهين ار ، بەلأم سەرچاوەكانی تر رايان وەهايە كە لە زستانی ١٩٢٦ دا گەيشتۆتە بارلا

چونکە لە شەو و ڕۆژێکی تەواودا تەنها قاپێکی بچووك لە شۆربا و ، چەند پارچە نانێکی ئەخوارد و ، ئەو خواردنەشی لە یەکێك لە دراوسێکانیەوە بۆ ئەهات و ، بە زۆر پارەکەشی ئەدانێ ، چونکە لە سەرانسەری ژیانیدا دروشمێکی هەڵ گرتبوو، کە بەبێ بەرامبەر هیچ شتێك لە هیچ کەسێك وەر نەگرێت ، بەڵکو پشتی بە خوا ئەبەست و ، دەستووری دەست پێوەگرتن و بەرەکەتی بەرچاو گرتبوو، کە ئەوەبوو لەوە و پێش هەندێ لیرەی بە نیازی ئەنجامدانی حەج پاشەکەوت کردبوو ..

کاربەدەستانی دەوڵەت هەمیشە چاویان لەسەر مامۆستا بوو و ، جاسووسیان لەسەر دانابوو ، بۆیە دانیشتوانی شارۆچکەکەش نەیان ئەوێرا لێی نزیك بکەونەوە و، قسەی لەگەڵدا بکەن .. زۆربەی کاتی لە ماڵەوە بەسەر ئەبرد و ، لە وەرزی بەهار و هاوینیشدا ئەچوو بۆ سەر کێوی ( چام ) ، لەوێ لەسەر لووتکەی چیاکە و لە نێو درەختەکاندا ، کەناری ئەگرت و خەریکی بیرکردنەوە و خواپەرستیی ئەبوو ..[178]

لە ڕۆژێکی هاویندا مامۆستا وەك جاران بەرەو کێوەکە لە ماڵ دەرچوو .. ئاسمان سایەقە بوو، و خۆریش هەڵات بوو .. هەر ئەوەندە بوو، کە گەیشتە سەر لووتکەی چیاکە ، خێرا هەوری ڕەش کەوتە ئاسمان و ، وەهای ئەگەیاند کە کاتی تاوە بارانێکی بەخور نزیکە .. هەر وایش بوو ، ئەوەندەی پێ نەچوو ئاسمان دەستی بە گرمە و چەخماخە کرد و ، باران بە خورم ئەهاتە خوارەوە . مامۆستاش لەسەر لووتکەی چیاکە بە تەنیا بوو، و هیچ پەناگایەکیش نەبوو تا خۆی لە ئاوی بارانی بەخورەم لا بدات جگە لەو درەختانەی، کە دادیان نەئەدا و بەس نەبوون، کە نەهێڵن تەر ببێ، دوای ماوەیەك بارانەکە کەم بوویەوە و ، وردە وردە ئەباریی ..

[178] سیرة ذاتیة : ٢١٩

ئیتر مامۆستا ئەو کەمییەی بە هەل زانیی و ، بە پەلە گەرایەوە بۆ ماڵ ، بەڵام لە تەوقە سەریەوە هەتا پەنچەی پێی تەر بوو بوو .. لە رێگاش‌دا پێڵاوەکەی درڕا و، کە گەیشتەوە بارلا تاکی پێڵاوێکی بەدەستیەوە بوو و ، بە گۆرەوییە لە خوریی چنراوە سپییەکانیەوە بەناو قوردا بەرێوە ئەچوو ..

لەوێ ، لە نزیك کانیاوەکەدا کۆمەڵێك لە دانیشتوانی بارلا کۆ بووبوونەوە و قسەیان ئەکرد ، ئەو دیمەنە کاریگەرەیان دیی ..

دیمەنی زانای مەزنی خاوەن سام و هەیبەتی لە ولاتی خۆی دوورخراوەی .. تاقانە ، کە لەلایەن هەموانەوە دابراوە ، وا پێڵاوە دڕاوەکەی بە دەستەوە گرتووە و ، بە گۆرەوییەکانیەوە نیشتۆتە ناو قورەکەوە و ، چەمکی جل و بەرگەکەشی قوراویی بووە .. بێ دەنگییەکی قورس باڵی بەسەر هەموان‌دا کێشا و، زۆربەیان دوو سۆز بەسەریان‌دا زاڵ بوو .. سۆزێك بۆ درێژکردنی دەستی یارمەتیی بۆ مامۆستا و ، سۆزێکیش ترسان لە پیاوانی دەوڵەت، کە هەمیشە چاودێریی مامۆستا ئەکەن، لە ئەنجام‌دا لەناو هەموان‌دا تاقە پیاوێك دەرئەپەرێت کە ناوی سولەیمان ئەبێ و ، خۆی ئەگەیەنێتە لای و ، تاکە پێڵاوەکەی لە دەست وەرئەگرێت و ، لە حەوزەکەدا ئەی شوات ، پاشان ئەکەوێتە گەلی هەتا ئەگەنە ماڵەوە و ، لەگەڵیا سەر ئەکەوێت بۆ ژوورەکەی، بەمە سولەیمان کاروانچیی ئەبێتە یەکەم دۆستی و ، ئەبێتە قوتابیی و ، بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە بارلا خزمەتی ئەکات ، کە بە راستیی نموونەی راستگۆیی، و وەفا، و ئیخلاص ئەبێت و ، لە ساڵی ١٩٦٥ دا کۆچی دوایی ئەکات، رەحمەتی بە لێشاوی خوای بەسەردا ببارێت .[١٧٩]

---

[١٧٩] ذكريات عن سعيد النورسي لأسيد إحسان الصالحي : ٣٢ ، ش / ٢٧٧ ، رجل القدر : ١٦٨ ـ ١٦٩

مامۆستا هەرچیی لە بارلادا لە خزمەتی قورئان سارد ئەبوویەوە و ، ئاوری بە لای قیامەتی خۆیدا ئەدایەوە ، خوای گەورە یەکێك لە ئـەژدیهاکانی سیاسـەتی بەسەریا زاڵ ئەکرد، و یەکێك لە مونافیقەکان ئـەبووە کۆسـپی بـەردەمی ، بـە رادەیەك، کە ئامادەیە هەشتا رووداو لەو جۆرە دەربارەی ئەو هەشت ساڵەی بارلا بگێڕێتەوە [١٨٠]

لەو سەردەمەدا ئیماندااران ستەمی زۆریان لێ ئەکرێت ، بە تایبەتیی مامۆستا سزا و ئازاری زۆری ئەدەن ، ئەوەبوو تەپیان کوتایـە سـەر ئـەو مزگەوتـەی، کـە مامۆستا و هەندێ دۆستی خۆیان تەعمیریان کرد بوو ، تا خواپەرستیی تێدا بکەن و ، بانگ و قامەتی عەرەبیی تیایا بە نهێنیی بەجێ بێنن . [١٨١]

مامۆستا سوپاسی خوا ئەکات، کە چەندین جۆری ستەم و ئازاردانی لەلایـەن زاڵمانەوە بەرامبەر کراوە، کەچیی خواوەندی بەسۆز ئەو نارەحەتییانەی گۆڕیون بۆ فەزڵ و سۆز و بەزەیی :

کاتێك، کە لەسەر کێوی ئەرەك لە ئەشکەوت دا ژیاوە و ، دەستی لە سیاسەت هەڵ گرتووە و ، خۆی لە دنیاگەریی داماڵیوە هەتا خەریکی کاروباری قیامـەتی بێت ، ئەهلی دنیا دێن و بەبێ ئەوەی تاوانێکی دەرهەق بە دەوڵەت ئەنجام دابـێ نەفیی ئەکەن بۆ خۆرئاوای وڵات .

بەڵام خوای بە سۆز و شەفەقەت و دانا ئەو نەفیی کردنە ئەکاتە رەحمەت بـۆی لەو کەنارگیرییەی سەر کێوی ئەرەك رزگاری ئەکات ، بەڵام چیاکانی بارلای ئەمین

---

[١٨٠] اللمعات : ٦٨

[١٨١] سيرة ذاتية : ٢٢٠

و ئەمانی پێشکەش ئەکات تا بە دڵی خۆی ، بەوپەری ئیخلاصەوە خواپەرستیی بکات و ، بە دڵی خۆی خەریکی سەرنج دانی قورئانی پیرۆز بێت ..

کاتێکیش، کە لە رووسیا دیل بوو، نیازی کردبوو لە کۆتایی تەمەنیدا لە ئەشکەوتێك کەنار بگرێت ، بەڵام خواوەندی بەشەفەقەت لە بارلا ئەو ئاواتەی بۆ هێنایە دیی ، تا لاشەی لاوازی بەرگە بگرێ .

جا هەرچەندە کاربەدەستانی دەوڵەت هەموو نەفیی کراوەکانیان ئازاد کردن و ، تاوانبارانیان لە بەندیخانە کردنە دەرەوە ، بە ستەم مامۆستا نوورسییان ئازاد نەکرد .. بەڵام خوای گەورە ئەوەشی بۆ کردە نیعمەتێکی گەورە هەتا چاکتر بیخاتە خزمەتی قورئانەوە و ، خەریکی نووسینی بەرگی یەکەمی پەیامەکانی نوور بێت، کە بە ناوی ( وتەکان ـ الكلمات ) بلاّوی کردنەوە، لەو شوێنە بێ دەنگەدا هێشتیەوە تا خزمەتی رێك و پێك پێشکەش بکات ..

هەروەها کاربەدەستان رێیان دا نەفیی کراوەکان لە شێخ و سەرۆك عەشرەتەکان لە قەزاکان و شارە گەورەکاندا بمێننەوە و ، ماوەشیان دا خزم و کەس و کاریان سەریان لێ بدەن ، کەچیی مامۆستایان نارد بۆ گوندێکی بچکۆلەی دوور و ، جگە لە یەك دوانێك نەیان ئەهێشت خزمانی و خەڵکی ناوچەی وان سەری لێ بدەن، ئەم لە خەڵك دابرانەش ، بە سۆزی خوا ، بووە مایەی روونیی مێشکی تا بە شتی هیچ و پووچەوە نەپەشۆکێت .

هەروەها نووسینی نامەیەك یان دوو نامەیان لە ماوەی دوو ساڵدا بە لاوە زۆر بوو ، هەتا هاتنی یەك دوو میوان بۆ لای لە ماوەی دە ، یان بیست رۆژ ، یان مانگێکدا پێ ناخۆش بوو، بە مەرجێك ئەوان بۆ پاداشتی قیامەت سەردانیان ئەکرد، خوای گەورە ئەم ستەمەی بۆ گێرا بە رەحمەت ، تا لەو سێ مانگە

پیرۆزەدا سەرگەرمی خوا پەرستییەکی وەها بێت، کە خێری خواپەرستیی نەوەد ساڵی پێشکەش بکات، سوپاس بۆ خوا [١٨٢]

لێرەدا مامۆستا خۆی باسێکی ئەو کاتەی ئەکات و ئەڵێت :

(( کاتێك، کە لە شوێنی دوورخرانەوەکەم‌دا بووم ، لەو دیلییە پڕ ئازارەدا ، لەسەر لووتکەی چیای (( چام )) کە بەسەر لەوەڕگاکانی (( بارلا )) دا ئەیڕوانیی ، بە تاقی تەنیا و دوور لە خەڵکیی ئەژیام .. ئا لەو گۆشەگیرییەم‌دا بۆ نوورێك ئەگەڕام، ئەوەبوو شەوێکیان ، لەو ژوورە بچکۆلە سەرنەگیراوەدا، کە لەسەر درەختێکی سنۆبەری بڵندی سەر لووتکەی ئەو بەرزاییە دروست کرابوو ، پیرییم هەستی چەندین غەریبیی هەمە ڕەنگ و جۆرا و جۆر و تێکەڵ و پێکەڵم ئەخاتە دڵەوە ـ هەروەك لە مەکتووبی شەشەم دا بە ڕوونیی باس کراوە ـ ئەوەبوو لە کش و ماتیی ئەو شەوەدا، کە هیچ دەنگێك ـ جگە لە زایەڵەی خەمباری خشەی گەڵای دارەکان ـ نەدەبیسترا ، هەستم کرد، کە ئەو زایەڵە پڕ ئازارە کرۆکی هەست و سۆزمی پێکاوە و ، لە ناخی پیریی و غەریبییشمی داوە ، بۆیە پیریی بۆ ئاگادارکردنەوەم چپاندنی بە گوێم‌دا :

وا ڕۆژی ڕووناك گۆڕرا بەم قەبرە تاریکە و ، دنیاش کەفەنی ڕەشی خۆی پۆشیی، هەروەها ڕۆژی تەمەنت ئەگۆڕێ بە شەو و ، ڕۆژی دنیاش ئەگۆڕێ بە شەوی بەرزەخ و ، ڕۆژی هاوینی ژیانیش ئەگۆڕێ بە شەوی زستانی مردن .

ئەوەبوو نەفسم بە ئازارەوە وەڵامی دایەوە :

بەڵێ ، هەروەك من لێرەدا ئاوارەم و لە شار و نیشتمانم دوورەوە خراوم ، ئەوا لێك دابرانم لەو خۆشەویستە زۆرانەی درێژایی تەمەنم، کە خۆی لە پەنجا ساڵ

---

[١٨٢] المكتوبات : ٥٦ ـ ٥٧

ئەدات و ، جگە لە فرمێسك هەڵرشتنیش بە دوایانا هیچی ترم لێ نایەت ، ئاوارەییەکە بۆم، کە لە ئاوارەیی نیشتمانم بەلاوە زیاترە .. بە راستیی من لەم شەوەدا هەست بە غەریبییەکی زیاتر خەماویی و پڕ لە ئازار ئەکەم ، لە غەریبیی سەر ئەم چیایەم، کە غەریبیی و خەم و خەفەت دەرئەبڕێ .. جا پیرییەکەم لەوە ئاگادارم ئەکاتەوە، کە وادەی لێك دابرانی یەکجارەکییم لەم دنیایە و لە هەرچیی وا تێیدا نزیك بۆتەوە ، بۆیە لە نێو ئەم غەریبییەدا کە بە خەم داپۆشراوە و ، لە نێو ئەم خەمەش‌دا کە ئاوێتەی ئازارە ، دەستم دایە گەران بە دوای نوورێك و ، شۆڵەی هیوایەك و ، دەرگای ئومێدێك‌دا .. ئەوەبوو خێرا « ئیمان بە خوا » بە فریامەوە هات و ، پشتی گرتم و ، دڵ‌کرانەوە و هاودەنگییەکی مەزنی پێ بەخشییم، کە ئەگەر ئێش و ئازار و تەنیاییەکەم چەندجار چەندجارە ببوایەتەوە ئەوا ئەو هاودەنگییە بۆ لە ناوبردنی بەس بوو ..

بەڵێ ، ئەی خوشك و برا پیرەکانم ! مادەم بەدیهێنەرێکی بەسۆزمان هەیە ، کەواتە هەرگیز ئێمە غەریبیی ناچێژین و ، مادەم خوای پاك و بێ گەردمان هەیە، کەواتە هەموو شتێکمان هەیە و ، مادەم ئەومان هەیە و مەلائیتەکانیشی هەن ، کەواتە ئەم دنیایە لە هاودەنگ و خاوەن هەستەکان چۆڵ نیە و ، ئەم چیا چۆڵ و بیابانە خاڵییانەش هەرهەموویان ئاوەدانن و ، پڕن لە بەندەی خوا .. لە مەلائیکەتە بەرێزەکان ..

بەڵێ ، نووری ئیمان بە خوای پاك و بێ گەرد و ، روانینە گەردوون لەبەر خوا، درەختەکان ، بگرە هەتا بەردەکانیش وایان لێ دێ، کە وەك دۆستی هاودەم بێنە پێش چاو ، ئیتر با بەندە خاوەن هەستەکانی خوا لەولاوە بووەستن، چونکە ئەو

دروست کەرانە ئەتوانن ـ بە زمانی حالّ ـ بۆ دلّدانەوە و بێ تاقەتیی دەرکردنمان لەگەلّما بدوێن ..»[١٨٣]

هەروەها ئەلّێت :

« لە کاتێك دا، کە لە بەخشداریی ( بارلا ) ی سەر بە پارێزگای ( ئیسپارتە ) بە تەنیا و بێ یارمەتیدەر ئەژیام ، تالاّوی دیلیی پر ئێش و ژانم ئەچەشت، کە پێی ئەوترێ دوورخستنەوە ( نفي ) و ، تێکەلّیی خەلّکیشم لێ قەدەغە کرابوو، بگرە هەتا نامە گۆرینەوەش لەگەلّ هەرکەس دا بێت ، سەرەرای نەخۆشیی و پیریی و غەریبییش .. کاتێك، کە لەم حالّەتەدا ئەتلامەوە و ، خەم و خەفەتی تالّم ئەچەشت، ئەبینم وا نوورێکی دلّ دەرەوە ، لە نهێنییە ناسکەکانی قورئانی پیرۆزەوە، و لە نوکتە وردەکانیەوە ئەدرەوشێتەوە .. وا خوای حەق و پاك و بێ گەرد بە سۆز و رەحمەتی تەواو و فراوانی خۆی پێمی ئەبەخشێ ... ئیتر منیش بەو نوورە ئەوپەری هەولّم ئەدا تا ئەو حالّەتە پر ئێش و ژان و خەفەتاوییە، کە تیایدا بووم لە بیری خۆمی بەرمەوە ، هەتا توانییم شارەکەم و خۆشەویستەکانم و خزمەکانیشم لە بیری خۆم بەرمەوە .. بەلاّم ـ ئای داخی بە جەرگم ـ بە هیچ شێوەیەك نەمتوانی یەکێکیان لە بیری خۆم بەرمەوە، کە ئەویش برازاکەم ، بگرە کورە مەعنەوییەکەم و ، قوتابییە دلّسۆز و دۆستە ئازاکەم ، ( عبد الرحمن ) بوو، خوای گەورە رەحمەت بارانی بکات، کە نزیکەی حەوت سالّ ئەبوو لێم دابرابوو ، ئیتر نە من لە حالّی ئەو ئاگادار بووم تا نامەی بۆ بنێرم و لەگەلّیا وت و وێژ بکەم، و پێکەوە هاوبەشی ئێش و ئازار بین و ، نە ئەویش شوێنی منی ئەزانی هەتا هەولّی خزمەت کردن و دلّدانەوەم بدات .. بەلّێ ، من پێویستییەکی زۆرم

---

[١٨٣] اللمعات : ٣٤٩ ـ ٣٥٠

هەبوو ـ بە تایبەت لەم پیرییەمدا ـ بە کەسێکی وەك ( عبد الرحمن ) ، ئەو فیداکارە راستگۆیە .. ئەوەبوو رۆژێکیان لە ناکاودا نامەیەکیان دایە دەستم ، کە هەڵم پچری بۆم دەرکەوت کە ئەم نامەیە کەسێتیی ( عبد الرحمن ) بە تەواوەتیی دەرئەخات، بەشێکی ئەو نامەیە لەگەڵ بابەتەکانی مەکتووبی بیست و حەوتەمدا [١٨٤] بلاّو کراوەتەوە و ئاشکرا سێ کەرامەتی تیا دەرکەوتوون .. ئەو نامەیە زۆری گریاندم و تا ئێستاش هەر ئەمگریێنێ ، چونکە ( عبد الرحمن ) بەوپەری راستگۆیی و لێبڕانەوە لە نامەکەدا دەری خستبوو، کە بە تەواویی پشتی لە چێژ و لەزەتە دنیاییەکان هەڵ کردووە و ، ئەوپەری ئاواتیشی ئەوەیە بگاتە لام و لەم پیرییەدا سەروکارییم بکات ، هەروەك من ئەوم لە منداڵییدا سەروکاریی ئەکرد و ، بە قەڵەمە کارامەکەشی لە فەرمانبەریی و ئەرکی راستەقینەی ئەم دنیامدا، کە بلاّوکردنەوەی نهێنییەکانی قورئانی پیرۆزە، یارمەتییم بدات .. هەتا لە نامەکەیدا نووسیی بووی : نزیکەی سیی پەیامم بۆ بنێرە تا بە خۆم و کەسانی تریشەوە لە هەر یەکەیان سیی نوسخە بنووسینەوە

ئەم نامەیە بە هیوایەکی بەهێزی توندەوە بەستمی بە دنیاوە ، ئەوەبوو لە دڵی خۆمدا وتم : ئەوەتا قوتابیی دڵسۆز و ئازا و ، خاوەنی زیرەکیی لە عادەت بەدەر و، خاوەنی وەفای بێ گەرد و ، پەیوەندیی وەها پتەوم دۆزییەوە ، کە لە وەفا و پەیوەندیی کوری راستەقینە بە باوکیەوە زیاتر بن و ، بە کۆمەکیی خوا سەروکاریی و خزمەتم دەکات ، بگرە هەتا بەم هیوایە دیلییە پر ئێش و ژانەکەم و

---

[١٨٤] واتە کتێبی ( الملاحق في فقه دعوة النور ) بەرگی حەوتەمی سەرجەمی پەیامەکانی نوور، نامەکەی ( عبدالرحمن ) لە ل ٢٩ ـ ٣١ دا بلاّوکراوەتەوە .. وەرگێڕ .

نەبوونی یارمەتیی دەرم لە بیر چوونەوە ، بگرە هەتا غەریبیی و پیرییشم لە بیر چوونەوە !

ئەم نامەیە ئیمانێکی یەکجار بەهێز و درەوشاوەی لێ ئەباریی ، هەروەك عەبدوررەحمان کاتێك نووسیبێتی، کە چاوەروانی ئەجەلی خۆی بوویێ .. ئەوەبوو توانیبووی نوسخەیەکی چاپ کراوی وتەی دەهەم دەست خۆی بخات ، کە بە چاپم گەیاندبوو و باسی ئیمان بە قیامەت ئەکات .. ئەو پەیامە بوویووە مەلهەمێکی شیفابەخش تا هەموو ئەو زامە مەعنەوییانە سارێژ بکات، کە حەوت ساڵی رەبەق گیرۆدەی دەستیان بوو بوو .

پاش تێپەربوونی نزیکەی دوو مانگ کە من لەو هیوایەدا ئەژیام و، چاوەروانی نامەیەکی تری بووم ، تا پێکەوە ژیانێکی دنیایی بەختەوەر بەرینە سەر، لە پرێك دا هەواڵی مردنیم بۆ هات .. ئای بە داخەوە .. ئای داخی بە جەرگم .. ئەم هەواڵە یەکجار توند رای تەکاندم بە رادەیەك، کە ئەمە پێنج ساڵە هێشتا کاریگەریی لەسەرم ماوە و ، خەفەتێکی زۆر و ، ئێش و ئازارێکی سەختی بۆ ئەو لێك دابرانە پر ئێش و ژانەی بۆ بەجێ هێشتم ، کە لە ئازاری دیلیی و ژان و ئازاری تەنیایی و غەریبیی و بێ کەسیی و ، ئازاری پیریی و نەخۆشیی، کە پێیانەوە ئەتلامەوە زیاتر بوو ..

جاران ئەم وت : بە مردنی دایکم نیوەی دنیا تایبەتییەکەم رووخا ، کەچیی وا بە مردنی عەبدوررەحمان نیوەکەی تریشی رووخا .. ئیتر کەواتە هیچ پەیوەندییەکم بە دنیاوە نەما .. بەڵێ ، ئەگەر عەبدوررەحمان لە دنیادا لەگەڵم دا بمابایەوە ، ئەوا ئەبووە تەوەرەیەك بۆ ئەنجام دانی فەرمانبەرییە قیامەتییەکەم لە دنیادا و، ئەبووە جێنشینێکی چاك بۆم و دوای خۆم جێی ئەگرتمەوە و ، ئەبووە دۆستێکی بەوەفا ، بگرە مایەی دڵ دانەوە و ئەبووە هاودەمم و ، ئەبوو زیرەکترین قوتابیی

پەیامەکانی نوور و ، ئەبووە ئەمین و دڵسۆز و پارێزگاریش بۆمان .. جا بە راستیی تیاچوونێکی ئاوەها ـ بە حیسابی مرۆڤایەتیی ـ بۆ یەکێك وەك من تیاچوونێکی جەرگ سووتێن و پڕ ئێش و ئازارە .. جا لەگەڵ ئەوەش دا، کە چەندە لە توانام دا بوو، هەوڵم ئەدا تا ئارامم هەبێ و بەرگەی ئەو ئازارانە بگرم، کە پێیانەوە ئەتلامەوە ، کەچیی رەشەبایەکی یەکجار بەهێز خەریك بوو، هەموو گۆشەیەکی رۆحمی وێران ئەکرد . جا ئەگەر ئەو دڵ دانەوەیە نەبوایە کە لە نووری قورئانی پیرۆزەوە هەڵ ئەقوڵا و جار و بار فەیض و بەرەکەتی بەسەرمدا ئەباریی، ئەوا لە توانای کەسێکی وەك من دا نەبوو بەرگە بگرێ و دامەزراو بێت ..

هەر بەم خەفەت و ئێش و ئازارە خەمبارانەوە ، بە تاقی تەنیا بۆ چەم و دۆڵەکانی ( بارلا ) دەرئەچووم و ، بە چیاکانیدا هەڵ ئەگەرام و ، لە شوێنی چۆڵ و کەناردا دائەنیشتم و ، تابلۆکانی ژیانی پڕ بەختەوەریی و دیمەنە ناسکەکانی ، لەگەڵ قوتابییەکانم دا ـ وێنەی عەبدوررەحمان ـ بە سەرم بردبوون ، وەك فیلمی سینەما بە بەرچاومدا تێ ئەپەڕین جا هەرچیی ئەو تابلۆیانە بە ئەندێشەمدا ئەهاتن ، ئەوا هێزی بەرگرییمیان نەئەهێشت و ، دەست و پەلیان ئەشکاند ، سەرەرای ئەو هەست ناسکیی و زوو کارتێکردنەی، کە هەڵقوڵاوی پیریی و غەریبیی بوون و تووشم بوو بوون .

بەڵام ئەوەبوو لە پڕێك دا نهێنیی ئایەتی پیرۆز : ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٨٨ ﴾ ( القصص : ٨٨ ) بە جوانیی لێمەوە دەرکەوت و هانی دام تا ( یا باقي أنت الباقي ، یا باقي أنت الباقي ) دووبارە بکەمەوە و ، بەمەیش دڵدانەوەی راستەقینەم دەست کەوت ..

بەڵێ ! بە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە و ، لە نێو ئەو چەم و دۆڵە چۆڵانەدا و ، لەگەڵ ئەو حاڵەتە پڕ ئێش و ژانەدا ، نەفسی خۆمم وەها هاتە پێش چاو، کە

بەسەر سەری سێ تەرمی گەورەوە بێت ، وەك لە پەیامی ( پلیكانەی سوننەت ) دا ئاماژەم بۆ كردووە :

یەكەم : خۆمم بە كێلی قەبرێك هاتە پێش چاو، كە پەنجا و پێنج سەعیدی تێدا بوون و ، هەر لە ژیانی خۆم دا و بە درێژایی تەمەنم، كە پەنجا و پێنج ساڵ ئەبوو مردبوون و نێژرابوون .

دووهەم : خۆمم وەك گیاندارێكی زۆر بچووك ـ وەك مێروولە ـ ئەهاتە پێش چاو كە لەم چەرخەدا بژیی ، كە كێلی قەبری ئەو تەرمە گەورەیەیە، كە هی تێكرای ئادەمیییەكانە ، ئەوانەی لە سەردەمی ئادەمەوە ـ سەلامی لێبێ ـ هەتا ئێستا لە قەبری رابوردوودا نێژراون ..

بەلاّم سێهەم : بە نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە ، هەروەك هەموو ساڵێك لەسەر رووی ئەم دنیایەدا دنیایەكی گەرۆك ئەمرێ ، ئەویش بە شێوەی مردنی مرۆڤ ، ئەوا مردنی ئەم دنیا گەورەیەش بە بەرجەستەیی بە ئەندێشەمدا هات . بەم شێوەیە مانای ئیشاریی ئایەتی پیرۆز : ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ ( التوبة : ١٢٩ ) فریام كەوت و ، بە نوورێكیش، كە ناكوژێتەوە كۆمەكیی كردم ، ئیتر ئەوەبوو ئەو خەمبارییەی لە ناو برد، كە بە هۆی مردنی ( عبد الرحمن ) ە وە پێوەی ئەتلامەوە و ، سەرەخۆشیی و دڵدانەوەی راستەقینەشی پێشكەش كردم .

بەڵێ ، ئەم ئایەتە پیرۆزە فێری كردم، كە مادەم خوای پاك و بێ گەرد و بالاّدەست هەیە ئەوا ئەو لە بریی هەموو شتێكە و ، مادەم باقییشە ئەوا بەندەكەی ئەوی بەسە ، چونكە تاقە درەوشانەوەیەكی نووری فراوان و گشت گیریشی ژیانێكی مەعنەوەیی، بەلاّم چۆن ژیانێك ، بەو سێ تەرمە ئەبەخشێ ، بە شێوەیەك، كە دەری بخات ئەمانە تەرم نین ، بەڵكو ئەوانەن، كە كاری سەرشان و

فەرمانبەريی ئەم سەر زەمینەیان تەواو کردووە و ، کۆچیان بۆ جیهانێکی تر کردووە

جا لەبەر ئەوەی، کە ئەم نهێنیی و حیکمەتەمان لە ( لەمعەی سێهەم ) دا روون کردۆتەوە ، وای ئەبینم لێرەدا پێویست بە روون کردنەوەی زیاتر ناکات، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەڵێم :

ئەوەی کە لەو حاڵەتە خەمبارە بە ئێش و ژانە رزگاری کردم دوو جار وتنەوەی ( يا باقي أنت الباقي ، يا باقي أنت الباقي ) م بوو کە مانای ئایەتی پیرۆز: ﴿ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ ﴾ ئەگەیەنێ و ، روون کردنەوەی ئەوەش بەم شێوە:

کاتێك کە بۆ یەکەم جار وتم : ( يا باقي أنت الباقي ) ، یەکسەر بە وێنەی نەشتەرگەرییەکان دەستی بە دەرمان کردن و چارەسەریی ئەو زامە مەعنەوییە لە ژمارە نەهاتووانە کرد کە لە ئەنجامی تیاچوونی دنیا و تیاچوونی ئەو خۆشەویستانەوە، کە تیایا بوون ـ وێنەی عەبدوررەحمان ـ پەیدا بووبوون و ، لە ئەنجامی کرانەوەی گرێی ئەو پەیوەندییانەی، کە لە گەڵیانا پەیوەست بووم پەیدا بوو بوون .

بەڵام بۆ جاری دووهەم رستەی ( يا باقي أنت الباقي ) بووە مەڵهەمێك بۆ ئەو هەمووە زامە مەعنەوییانە .. بووە دەرمانێکی شیفابەخش بۆیان، ئەمەش بە تێ رامان لەم مانایە :

کێ ئەروات با بروات ، چونکە خۆت باقییت و ، خۆشت بەسیت .. جا مادەم تۆ باقییت ئەوا درەوشانەوەیەك لە درەوشانەوەکانی سۆز و رەحمەتت بۆ هەموو شتێکی تیاچوو بەسە و .. مادەم تۆ هەیت ئەوا هەر کەسێك بە هۆی ئیمان هێنانەوە بە بوونت لە مانای ئەو تێ بگات کە لە پەنای تۆدایە و ، بە پێی ئەو لە پەنابوونەش دا ، ئەویش بە نهێنیی ئیسلام ، هەڵس و کەوت بکات ، ئەوا ئەو

کەسە هەموو شتێکی هەیە، کەواتە فەنا و تیاچوون ، هەروەها مـردن و عـەدەم پەردەی نوێکردنەوەن و ، هۆن بۆ هات و چۆکردن و گەران بە جۆرەها مەنزڵی جیا جیادا .. تا ئەوەبوو بەم بیرکردنەوەیە ئەو حاڵەتە رۆحییە جەرگ سـووتێنەرە پـر خەفەتە و ، ئەو حاڵەتە تاریکە سامناکە گۆران بۆ حاڵـەتێکی شـادمانی دلاّرا و بەلەزەت و ، بۆ حاڵەتێکی نوورانیی خۆشەویست و دڵ کەرەوە، ئیتر زمان و دڵم، بگرە هەموو زەررەیەکی جەستەم بـە زمـانی حـاڵ ( الحمـد الله ) یـان دوویـارە ئەکردەوە [١٨٥]

[١٨٥] اللمعات : ٣٧٣ ـ ٣٧٧

## دووهەم : نووسینی پەیامەکانی نوور

ماوەیەك بوو، مامۆستا سەردەمی سەعیدی کۆنی واز لیّ هیّنابوو، و بە پیّی بۆچوونی سەعیدی نویّ کاری ئەکرد و ، خزمەتی قورئانی ئەکرد جا، کە گەیشتە بارلا ، لەو شویّنە کش و ماتەدا دەستی دایە سەرنجدان و بیرکردنەوە لە ئایەتـە پیرۆزەکانی قورئان ، تا نوور و بەرەکەتیان لیّ هەڵ بگۆزیّ و ، بیان‌کاتە دەرمانی دەردی دڵی خۆیشی و دڵی هەموو موسڵمانێك تا ئاخر زەمان ..

ئەوەبوو لە بارلا پەیامی حەشری نووسیی ..

رۆژێکیان مامۆستا لەسەر لێواری هێمن و جوانی دەریاچەی ئەگریدیر بـەرێوە ئەچوو و ، لە ئاوە شینەکەی و ، لە قەدپاڵی سەوز و جوانی چیاکانی دەوروبـەری دەریاچەکە ورد ئەبوویەوە و ، بیری لە مەسەلەی زیندووبوونـەوە دوای مـردن و ، رۆژی قیامەت و پاداشتی پاشەرۆژ ئەکردەوە، کە دەستە و تاقمە مولحیدەکان بـە شتێکی نەسەلماو و پروپووچی لە قەڵەم ئـەدەن، کـە هـیچ زانسـت و دەلیلێکـی عەقلیی پشتی ناگرن، مامۆستا دڵی هاتە جۆش و نزیکـەی چـل جـار ئایـەتی پـــــیرۆزی : ﴿ فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ ( الروم : ٥٠ ) ی دووبارە کردەوە و ، لە لێواری دەریاچەکە ، بە دڵێکی گەرمەوە هات و چۆی ئەکرد ، هەتا ئەوەبوو دڵ و دەروونی لە مانای ئایەتەکە پر بوون و ، فەرمانی دا یەکێك لە قوتابییەکانی ئەو نوور و بەرەکەتە بنووسێت، کە بە دڵیا دێت و ، سـەرەنجام پـەیامی حەشـری لیّ دەرچوو .

کـە پـەیامی حەشـری نووسـیی ، بەرەکـەت کەوتـە کاریـەوە و ، لـە بـارلا ( وتەکان )ی هەر هەموو لە وتەی یەکەمەوە هەتا سیی و سێهەم و ، مەکتووبات هەر هەموو لە مەکتووبی(١) یەکەمەوە هەتا(٣٣) سیی و سێهەم و بەشی زۆری

بریسکەکانیشی نووسیی و ، پاشماوەی بریسکەکانی لە ئیسپارتە لە ماوەی هەشت مانگدا تەواو کرد ..[١٨٦]

ئەوەی زۆر پێویستە، کە ئازیزان لە یادیان نەچێت ئەوەیە پەیامی حەشر با وەك پەیامە زانستییەکان تەماشا نەکرێت ، چونکە مامۆستا نوورسیی، کە خۆی نووسیویەتی پەنجا جاری خوێندۆتەوە ! چونکە وەك رۆژانە پێویستمان بە نان و ئاو هەیە ، هەموو کاتێکیش پێویستمان بەو زانستە ئیمانییانە هەیە، کە لەم پەیامەدان[١٨٧]

دەربارەی چۆنیەتیی نووسینی پەیامەکانی نوور مامۆستا لە ( الشعاعات : ٥٤٢ ) دا ئەڵێت :

(( قەدەر بە نەفیی کردن لە شارێکەوە بردمی بۆ شارێکی تر .. لەم کاتەدا لە کرۆکی دڵمەوە چەند مانایەکی مەزن پەیدا بوون کە لە بەرەکەتی قورئانی پیرۆز هەڵ قوڵابوون منیش بەو کەسانەی کە لە دەوروبەرمدا بوون نووسینمەوە ، کە ئەو پەیامانە بوون، کە ناوی ( پەیامەکانی نوور ) یان لێ نرا .. بە راستیی لە نووری قورئانی پیرۆز هەڵ قوڵاون ، لەبەر ئەمە ئەم ناوە لە کرۆکی دڵمەوە هەڵ قوڵا .. جا من لە قەناعەتێکی تەواو و ، یەقینێکی براوەدام، کە ئەم پەیامانە لە بیر و بۆچوونی من وەرنەگیراون ، بەڵکو ئیلهامێکی خواییە، کە خوای پاك و بێ گەرد لە نووری قورئانی پیرۆزەوە رژاندوویەتی بەسەر دڵمدا و ، فەر و پیرۆزییشیان پێشکەش بە هەر کەسێك کردووە، کە ئەیان نووسێتەوە ، چونکە من لام یەقینە،

---

[١٨٦] سيرة ذاتية : ٢٣٤

[١٨٧] سيرة ذاتية : ٢٣٥

کە جگە بەم ڕێگایە ناتوانرێ پارێزگاریی لە ئیمانی کەسانی تر بکرێت، کەواتـە نابێت ئەو فەیز و بەرەکەتانە لەوانە قەدەغە بکرێت، کە بۆیان موحتاجن .

بەم شێوە دەستە ئەمینەکان بە نووسینەوە و بلاوکردنەوە قۆستنیانەوە و ، لایان یەقین بوو، کە ئەمە رام هێنانێکی پەروەردگاریی و ، پاڵ پێوەنانێکی خواییە بـۆ پاراستنی ئیمانی موسڵمانان و ، هیچ کەسێك ناتوانێ ئەو رام کردنە و پاڵ پێوەنانە خواییە قەدەغە بکات، ئیتر هەستم بە پێویستیی هەڵنانی هەرکەسێك کرد، کە لەم ڕێبازەدا کار بکات ، ئەمەش بۆ بەجێهێنانی ئەوەی، کـە دینەکـەم فـەرمانم بەسەردا ئەدات )) .

هەروەها بۆ هۆی ناونانیان ئەڵێت :

(( هۆی ناونانی کۆمەڵەی وتەکان ( کە سیی و سێ وتـەن ) و ، مـەکتووبات ( کە سیی و سێ مەکتووبن ) و ، بریسکەکان ( کە سیی و یەك بریسـکەن ) و ، تیشکەکان ( کە سیانزە تیشکن ) بە ( پەیامەکانی نوور ) ئەمەیە :

وشەی ( نوور ) بە درێژایی تەمەنم لە هەموو شوێنێكدا هاتۆتە بەردەمم وەك :

گوندەکەم ناوی : نوورسە و ..

دایکی خوا لێ خۆشبووشم ناوی : نووریەیە و ..

مامۆستای تەریقەتی نەقشبەندییشم : سەیید نوور موحەممەدە و ..

مامۆستای تەریقەتی قادرییشم : نوورەددینە و ..

مامۆستای قورئانیشم : نوورییە و ....

زۆربەی ئەو قوتابیانەشم، کە لەلام ئەمێننەوە ناویان نوورە و ..

زۆربەی ئەوەش، کە کتێبـەکانم روون ئەکاتـەوە و نوورانییـان ئـەکات نموونـە هێنانەوەی نوورییە و ..

یەکەم ئایەتی پیرۆزیش، کە بۆ مێشکم و دڵم بریسکایەوە و ، بیرمی پێوە سەرقاڵ بوو ئایەتی : ﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾ ﴾ ( النور : ٣٥ ) و ..

ئەمەش کە زیاتر گرفتەکانی ، بۆ زانینی حەقیقەتە ئیمانییەکان حەل کردووە، بریتییە لە ناوی پیرۆزی ( النور ) ی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و ..

بە بۆنەی تاسەمەندیی زۆریشمەوە بۆ قورئان و ، یەك لایی کردنەوەی خزمەتم لە پێناویدا ، ئەوا ئیمامی تایبەتم سەردارمان عوثمانی کوری عەففانە خوا لێی رازیی بێت .[188]

مامۆستا هەست بە سێ کەرامەتی قورئانیی لە وتەکاندا ئەکات و ، قوتابییەکانیش بە هیممەت و هەوڵ و کۆششی بێ وچانیان کەرامەتێکی تر ئەخەنە پێش چاوان ، کە ئەمانەن :

**یەکەم :** پەیامەکان بە خێرایی و بە ئاسانیی ئەنووسران ، هەتا موعجیزاتی ئەحمەدیی لە ماوەی سێ رۆژدا و ، رۆژانە نزیکەی چوار سەعات لە نێو شاخ و باخ و باخاتەکاندا و بەبێ سەرچاوە ، نووسراوە

---

[188] الملاحق ـ ملحق بارلا : ٧١

پەیامی ( من ) کە بریتییە لە وتەی سیهەم مامۆستا نەخۆش بووە، و لە ماوەی پێنج یان شەش سەعاتدا نووسراوە

وتەی بیست و هەشتەم ، کە پەیامی بەهەشتە ، لە باخچەکەی سولەیماندا لە ماوەی سەعاتێك یان دوو سەعاتدا نووسراوە ، بە رادەیەك کە قوتابیەکان سەریان سور ئەمێنێ ..

**دووهەم :** ئاسان ئەنووسرانەوە و ، ئەو کەسەش هەستی بە خۆشیی و تاسەمەندیی ئەکرد و ، بە هیچ شێوەیەك بێزار نەئەبوو ..

**سێهەم :** ئاسان ئەخوێنرێنەوە و ، هەتا زیاتریش دووبارە بکرێتەوە زیاتر تاسەمەندییان ئەکرێت .

کەرامەتی چوارەمیش بریتییە لەوەی، کە خوسرەوی قوتابیی لە ماوەی مانگێکدا چواردە کتێب بە جوانیی و رێك و پێکیی ئەنووسێتەوە، کە یەکێکیان پەیامی پەنجەرەکان ئەبێت .[189]

مامۆستا زۆر بە رێزەوە سەیری پەیامەکانی نوور ئەکات، و ئەیشی دا بە گوێی هەمواندا، کە پەیامەکان مولکی ئەو نین ، بەڵکو مولکی قورئانن ، لەبەر ئەوە بە ئاشکرا دەری ئەبرێت، کە پەیامەکان چەند نمەیەکی سیفەتە بەرزەکانی قورئانی پیرۆزیان دەستگیر بووە، جا پەیامەکان ئەشوبهێنێ بە هێشووە ترێ بەلەزەتەکان و ، خۆیشی بە قەدە رەق و تەقەکانی ئەو رەزانە[190]

[189] سيرة ذاتية : ٢٣٦ ـ ٢٣٧
[190] المكتوبات : ٤٧٦

هەروەها بەوپەرى تەوازوعەوە دەرى ئەبرێت، كە ئەم نەى توانيوە حەقيقەتەكانى قورئان جوان بكات ، بگرە نەشيتوانيوە جوانييان دەر بخات ، بەلاّم حەقيقەتە جوانەكانى قورئان توانيويانە رستەكانى پەيامەكان جوان بكەن .[١٩١]

يەكێك لە سيفەتە ناوازەكانى پەيامەكانى نوور، كە بە هيچ نووسراوێكى تر نەدرابێت ئەوەيە، كە هەموو حەقيقەتە ئيمانيى و قورئانييە گرنگەكانيان بە شێوەيەكى گەشاوە و گومانبر سەلماندووە، كە ئەمەش ئاماژەيەكى غەيبيى يەكجار بەهێز و ، چاودێرييەكى خواييە .

بۆ نموونە پياوێكى زۆر بليمەتى وەك ئيبن سينا دانى بە دەستەوسانيى خۆيدا ناوە بۆ تێ گەيشتن لە هەندێ حەقيقەتى ئيمانيى و قورئانيى ، وەك مەسەلەى حەشر ، كە دەرى بريوە بە پێوەرى عەقلّيى ناسەلمێ ، بەلّكو پێويستە بە شێوەى مەسەلەيەكى نەقلّيى برواى پێ بهێنرێ ، كەچيى پەيامى حەشر ، كە وتەى دەهەمە ، زۆر بە ئاسانيى منداڵ و عامەى خەڵك لەو حەقيقەتانە ئاگادار ئەكات ..

هەروەها مەسەلەكانى قەدەر و جۆزئى ئيختياريى، كە كەڵەزاناى بەناوبانگ سەعدى تەفتازانيى بە پەنجا لاپەرە توانيويەتى بۆ زانا پايە بەرزەكانى روون بكاتەوە ، كەچيى پەيامەكانى نوور ، لە وتەى بيست و شەشەم و باسى دووهەمدا، لە دوو لاپەرەدا توانيويانە ئەو باسە بۆ عامەى خەڵكيش روون بكەنەوە

هەروەها مەسەلەى زۆرى تر هەن، كە بەو شێوە روونە تەنها لە پەيامەكانى نووردا سەلمێنراون ، ئەمەش ئەوە دەر ئەخات، كە ئەم پەيامانە نووسينيان لە تواناى مامۆستا نوورسييدا نيە، بەڵكو لە بەرەكەتى قورئان هەڵ گۆزراون .[١٩٢]

---

[١٩١] المكتوبات : ٤٧٧

سیفەتێکی تری پەیامەکان بریتییە لە ئاسان نووسینیان ، چونکە مامۆستا کاتی کەم بووە بۆ ورد بینیی و لێکۆڵینەوە ، لە کاتێکدا کە ئەو نووسینانە بە چەندین، کەڵەزانای لێهاتوو نەئەنووسران، دیارە ئەمەش چاودێرییەکی خواییە و، زۆربەی حەقیقەتەکان بە نموونە هێنانەوە ئەتوانن عامەی خەڵك تێ بگەیەنن .

هەتا بۆ پاكنووس و پیاچوونەوە هەستیان بە چاودێریی خوایی ئەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا چ مامۆستا و چ ئەو قوتابییانەی، کە یارمەتییان ئەدا هەستیان بە ئاسانیی ژیان و گوزەرانیان ئەکرد و ، هەستیان بە کۆمەکیی خوا ئەکرد، کە لەو خزمەتە نایابەدا بە کاری ئەهێنان، مامۆستاش سوپاسی خوای ئەکرد و ، ئەوەی بە فەزڵ و بەخشایشی پەروەردگاری لە قەڵەم ئەدا [١٩٣]

سیفەتێکی تریشیان بریتییە لەوەی، کە لە فەیلەسووفێکەوە بیگرە هەتا عەوامێك هیچ کەس رەخنەی لە پەیامەکان نەگرتووە ، ئەگەرچیی نوسخەی زۆریان لێ بلاو بۆتەوە و ، دەست خەڵکێکی زۆریش کەوتوون، و خەڵکێکی زۆریش کەڵکی لێیان وەرگرتووە و ، بەشێکیش لەو خەڵکە شەق و زللەیان خواردووە .[١٩٤]

سیفەتێکی تری پەیامەکان ئەوەیە، کە زۆر بە خێرایی ئەنووسران ، هەرچەندە مامۆستا نەخۆش بوایە ، یان لە بارودۆخی سەختدا بژیایە لە هەمان کاتدا پەیامەکان ئازاری کەسیان نەئەدا و ، نارەحەتیان نەئەکرد [١٩٥]

تایبەتمەندییەکی تری پەیامەکان ئەوەیە، کە زۆربەی زۆریان دەرمانی رۆحیی مامۆستا خۆی بوون، کە دوای نووسینیشیان پێشانی هەندێك لە دۆستانی ئەدان ،

---

[١٩٢] سيرة ذاتية : ٢٣٨ ـ ٢٣٩

[١٩٣] المكتوبات : ٤٨٥

[١٩٤] المكتوبات : ٤٨٣ .

[١٩٥] المكتوبات : ٤٨٤

ئەوانیش هەستیان ئـەکرد، کـە دەرمـانی دەردە رۆحیـی و دەروونییـەکانی ئـەم سەردەمەن .[١٩٦]

سیفەتێکی تریشیان ئەوەیە پەیامەکان بە تایبەت ( وتەکان ) کاریگەرییـەکی زۆریان بۆ سەر دڵ و دەروون هەیە ، بە رادەیەك، کە دێرێکیان ئەوەندەی لاپەرەیەك و، لاپەرەیەکیان ئەوەندەی کتێبێکی تەواو کاریگەریی هەیە، ئەمەش بە بۆنـەی ئیعجازی قورئانی پیرۆزەوە

هۆی ئەمەش ئەوەیە، کە لە سەردەمە رابوردووەکاندا بنچینە ئیمانییەکان توند و بەهێز بوون، و نووسینی خواناسەکان ئەگەرچیی بـێ بەڵگـەش بوایـە لەلایـەن موسڵمانانەوە کەڵکی لێ وەرئەگیرا ، بەڵام لـەم چـەرخانەی دواوەدا گـومرایی و ئیلحاد بە ناوی زانستەوە دەستیان بۆ بنچینەکان و پایەکانی ئیمان درێژ کـرد و، نەخۆشییەکی سەخت تووشی دڵ و دەروونی مرۆڤـەکان بـوو، بۆیـە ئـەم چـەرخە پێویستیی بە دەرمانی یەکجار بەهێز و کاریگەر هەیە

جا خوای خاوەن شەفەقەت بۆ چارەسەریی گـومرایی ئـەم چـەرخە نالـەبارە ، پەیامەکانی کردە دیاریی قورئان بۆ ئەم چەرخە و ، تەوفیقی مامۆسـتای دا بـۆ نووسینیان ، بە تایبـەت بـە نموونـە هێنانـەوە، کـە گەشـاوەترین و روون تـرین موعجیزەی قورئانە ، تا مامۆستا لەو بارودۆخە نالەبارەیدا بتوانێ بە چاك ترین شێوە خزمەتی قورئان بکـات و ، ئـەو راسـتییانەی، کـە زۆر دوورن بـە نموونـە هێنانەوە نزیکیان بخاتەوە و ، ئەوانەش، کە پەرش و بـڵاون یـەکیان بخاتـەوە و ، ئەوانەش، کە بەرز و بڵندن بە ئاسانیی بیان گـاتێ و ، دەربـارەی حەقیقەتـەکانی غەیب و بنچینەکانی ئیسلامیش بگاتە یەقینی ئیمانیی ، بۆیە خەیاڵ و وەهم و

---

[١٩٦] المكتوبات : ٤٨٥

عەقڵ ناچاری خۆبەدەستەوەدان بوون، بگرە نەفس و هەوا ، هەتا شەیتان ناچاری چەك فرێدان بوون، جا مامۆستا ئەم هەموو كاریگەرییە ئەگێرتەوە بۆ قورئـانی پیرۆز و ، بەشی خۆی هەر ئەوەندە دائەنێ، كە لە كاتی داماویی و دەستەوسانییدا لە خوا پاراوەتەوە تا دەرمانی دەردەكانی لە قورئانەوە دەستگیر ببێ بۆیە دەری ئـەبرێت كـە دەرد و نەخۆشـییەكان لـەوەوەن و ، دەرمـانیش لـە قورئـانی پیرۆزەوەیە [197]

[197] المكتوبات : ٤٨٦ ـ ٤٨٧

## سێهەم : نووسینەوە و بڵاوکردنەوەی پەیامەکان

نووسین و بڵاوكردنەوەى پەيامەكانى نوور شتێكى ناوازە بوو ، كە تـا ئێسـتا هيچ زانايەك يان نوێخوازێك بەو شێوەيە بەرهـەمى رەنـج و تەقـەلاى خـۆى بـۆ موسڵمانان نەنووسيوە، پێش هـەموو شـتێك مامۆسـتا زۆر كـەم پەيامـەكانى ئەنووسييەوە ، چونكە دەست خەتى زۆر ناخۆش بووەو و ، نەى توانيوە بە خێرايى بنووسێت، بەمە زۆربەى پەيامەكان لـە كـاتى كـەف و كـوڵى دڵ و دەروونيـدا نووسران ، بەوەى، كە فەرمانى بەسەر هەندێك لە قوتابييەكانيدا ئەدا تا ئەم بڵێ و، ئەوانيش بنووسن، پاشان نوسخە ئەسڵييەكە ئەدرا بە قوتابيان تا نوسخەى زۆرى لەسەر بنووسنەوە و ، پاشان نووسراوەكان هەر هەموو بهێنرێنەوە بـۆ مامۆسـتا هەتا يەك بە يەك پيايانا بچێتەوە و ، هەر هەڵەيەكيان تێدا بێت راستى بكاتەوە .

ئيتر مامۆستا لە كاتى نووسيندا جگە لە قورئانى پيرۆز هيچ سەرچـاوەيەكى تـرى بەلاوە نەبووە ، بەڵام ئەوەبوو خواى گەورە زيرەكييەكى بێ وێنەى پێبەخشيى بوو..

بەرێز عەبدوڵڵا چاويش ( ١٨٩٥ ـ ١٩٦٠ ) ، كـە يەكێكـە لـە شـەيداييانى دێرينى پەيامەكان ، باسى چۆنيەتيى ئەنجام دانى خزمەتى پەيامەكان ئەكات ، كە دواى خۆرئاوا بوون گوندى ( ئيسـلام ) ى بـەجێ ئەهێشـت و ، دەسـتى ئەدايـە جانتاكەى، كە ئەو پەيامانەى تێدا بوون، كە حافيظ عـەليى نووسـيبوونيەوە و، سەرانسەرى شەو لە نێوان چيا و دۆڵەكاندا بە پێ ئەرۆيشت هەتا لەگەڵ فـەجردا ئەگەيشتە بارلا و سەيرى ئەكرد وا مامۆستا چـاوەروانيى ئـەكات و ، بەوپـەرى شادمانييەوە پێشوازيى لێ ئەكرد و ، پێكەوە نوێژى بەيانييان بـەجێ ئـەهێنا پاشان عەبدوڵڵا لێى ئەخەوت و ، بۆ رۆژى دووهەم دەست نووسەكانى لە مامۆستا

وەرئەگرتن و ، شەو بارلای بەجێ ئەهێشت و ، بەرەو گوندی ئیسلام ئەکەوتەوە رێ، تا نووسراوەکان بداتە دەست حافیظ عەلیی .[١٩٨]

بۆ ماوەی بیست ساڵ پەیامەکان بەو شێوەیە ئەنووسرانەوە ، تا ئەوەبوو بۆ یەکەم جار بە رۆنیۆ چاپ کران ، بەلاّم هەتا ساڵی ١٩٥٦ ز بە چاپی ئاسایی چاپ نەکران ، جگە لە پەیامی حەشر کە بە هۆی قوتابیەکەوە لە ئەستەنبوڵ بە نهێنیی بە چاپ گەیەنرا .[١٩٩]

لەو کاتەدا پیتە عەرەبییەکان گۆرا بوون بە پیتی لاتینیی و ، چاپ کردن و بلاّوکردنەوە پێیان قەدەغە کرا بوو، و چاپخانەکانیان داخرا بوون ، ئیتر تاکە رێگای بلاّوکردنەوەی نووسراوەکانی مامۆستای نەفییکراو و چاودێریکراو بریتیی بوو، لە نووسینەوە بە دەست و بە نهێنیی .

دیسان عەبدوڵلاّ چاویش بۆمان ئەگێرێتەوە و ئەڵێت :

رۆژێکیان هاتم بۆ لای مامۆستا ، ئەبینم حافیظ عەلیی و ژمارەیەك قوتابیی وان لە لای، مامۆستا دەستی کرد بە دابەش کردنی چەند جوزئێك لە قورئانی پیرۆز بە سەریاندا تا بی نووسنەوە ، لەگەڵ پیشاندانی چۆنیەتی نووسینەوە، جا لەبەر ئەوەی، کە من ئومیی بووم و خوێندنەوە و نووسینم نەئەزانیی ، هەستام بۆ چا لێنان بۆیان تا بەشداریی پاداشتیان بکەم، بەلاّم هەر، کە چایەکەم هێنا تا دابەشی بکەم بەسەریاندا ، مامۆستا هەستا و چایەکەی لێم وەرگرت و ، دەستی بە دابەش‌کردنی کرد و ، منیش شەرمەزار بووم ، چونکە چۆن ئەبێت مامۆستا

---

[١٩٨] ذكريات عن سعيد النورسي : ٣٣

[١٩٩] سيرة ذاتية : ٢٤٥

خۆی چا بەسەر قوتابیەکانیدا دابەش بکات ، بەلاّم بە بۆنــەی پێداگرتنیــەوە بــێ دەنگ بووم .. پاشان مامۆستا فەرمووی :

نووسینەوەی چەند جوزئێکی قورئانی پیرۆز و ، هەوڵ دانتان لە پێناوی خوادا، لەلایەن ئەو خوایەوە وەرگیراوە، کە لەم بارودۆخەدا ئەتان بینێ و ، مەلائیکەتــە بەرێزەکانیشی وێنەتان ئەگرن، چا لەبەر ئەوەش، کە من خزمەتکاری قورئــانی پیرۆزم پێویستە خزمەتتان بکەم، ئەوەبوو ئــەوان خــەریکی نووســینەوە بــوون و مامۆستاش چایەکەی بەسەریاندا دابەش کرد [٢٠٠]

بەرە بەرە قوتابیانی پەیامەکان پەرەیان سەند ، بۆیە پەیامەکانیش ئەگەیشتنە گوند و شارۆچکە نزیکەکانی بارلا و ، دەستە پاکەکان ئەیان گواستنەوە و ، بــە نهێنیی ئەخوێنرانەوە، دوای ماوەیــەکیش گەیشــتنە شــارە دوورەکــان و ، دڵ و دەروونە تینوەکانی نوور و هیدایەت پێیان رۆشن ئەبوونەوە

قوتابیە دڵسۆزەکان ، بە ژن و پیاوەوە ، بە کــور و کچــەوە ، بــە هــەزارانیان دەستیان دایە نووسینەوەی پەیامەکانی نوور .. بە دڵ و بە گیان .. بە شەو و بە رۆژ خەریکی نووسینەوە بوون، هەتا هی وا هەبوو لەو نووسەرانە حەوت ساڵ لە ماڵ دەرنەچوو بوو ، سەرگەرمی نووسینەوە بوو، بە بێ مانــدوو بــوون و کــۆڵ دان .. هەر تەنها لــە گونــدی ( ســاو ) ی نزیــك بــە ئیســپارتەدا هــەزار کــەس سەرگەرمی نووسینەوە بوون .[٢٠١]

---

[٢٠٠] ذكريات عن سعيد النورسي : ٣٣
[٢٠١] سيرة ذاتية : ٢٤٦

لەم هەڵمەتە رۆشنبیرییەدا ئافرەتانیش دەوری چاکیان بینیی : ئەوانەیان، کە نووسینیان ئەزانیی ئەوە خەریکی نووسینەوە بوون ، بەلاّم نەخوێندەوارەکانیان لەسەر شێوەی وێنەکێشانی پیت و وشەکان ئەیاننووسینەوە

هەندێك ئافرەتیش هاتنە خزمەتی مامۆستا و وتیان :

مامۆستا گیان ! بریارمان داوە ئێمە خۆمان ئەرکی رۆژانەی مێردەکانمان ئەنجام بدەین ، تا ئەوان بە یەکجاریی دەستیان بەتاڵ بێت بۆ نووسینەوەی پەیامەکانی نوور، و ئێمەش لە پاداشتی خزمەتدا بەشدار بین .[٢٠٢]

مامۆستا نوورسیی ماوەی هەشت ساڵ و نیو لەم شارۆچکەیەدا مایەوە و ، خوای گەورە ویستی وەها بوو، شارۆچکەی بارلای جوانکیلە لە دامێنی چیاکانی تۆرۆس‌دا ببێتە بنکە و قوتابخانەی یەکەمی بانگەوازی پەیامەکانی نوور،ئەمەش بۆمان دەرئەخات، کە خاوەن غیرەتان لە هەموو بارودۆخ و هەل و مەرجێكدا لەسەر پێشکەش کردنی خزمەتی خۆیان بەردەوام ئەبن و ، هیچ تەگەرە و کۆسپێك ناتوانێت لە کاریان بخات .. بە دڵسۆزانە کار ئەکەن و ، گوێیان لە دژایەتیی و ناهەقیی نیە .. چەندە مافیان پێ شێل بکرێت ، ئەوان لەسەر خزمەت و ئەرکی خۆیان بەردەوام ئەبن .. گرنگ ئەوەیە خوا رازیی بکەن .

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٣٢ دا لەلایەن دەوڵەتەوە بریاری قەدەغەکردنی بانگی شەرعیی درا ، واتە بانگ بە عەرەبیی نەدرێت بەڵکو بە تورکیی ، ئەم بریارەش هەتا ساڵی ١٩٥٠ بەردەوام بوو، کە ئەوەبوو حکومەتی عەدنان مەندەریس بانگی گێرایەوە بۆ دۆخی شەرعیی خۆی .

---

[٢٠٢] سیرة ذاتیة : ٢٤٧

ئەم بریارە بەلای گەلی تورکیی موسڵمانەوە کارێکی یەکجار گران بوو ، بەڵام دەسەڵات چییە ؟

لەو کاتەدا مامۆستا هات و چۆی مزگەوتێکی بچکۆلەی ئەکرد لە بارلادا کە خۆی تەعمیری کردبوو .. لەوێ پێش‌نوێژیی بۆ هەندێ نوێژکەری لادێیی ئەکرد ئەوەبوو هەواڵ گەیشتە بەرێز جەمالی بەرێوەبەری پەخشداریی بارلا کە نوێژکەرانی ئەم مزگەوتە لەناو مزگەوتەکەدا بانگی شەرعیی ئەدەن، بۆ ئەوەی ئەم کارە قاچاخە بگرێت ، بەرێوەبەری پەخشداریی کەمینێکی دانا تا ئەو کەسەی کە بانگ ئەڵێت بیگرێت .

ئەوەبوو لە نوێژی فەجردا نوێژکەرانیان گرتن و لە سەرما و سۆڵەی سەختی زستان‌دا و بە پێ ، کە رێگاکەش بە بەفر داپۆشرا بوو ، بردنیان بۆ فەرمانداریی ئەگریدیر .

ئەوەتا بانگ وێژی مزگەوتەکە ، بەرێز شەمسیی کۆنش لە بیرەوەرییەکانیدا ئەگێرێتەوە و ئەڵێت :

لەسەر بانگ چەندە ئازاریان داین ، کاتێك کە بانگێکیان بە زمانی تورکیی بۆمان داهێنا ؟!

ئەڵێت : رۆژێکیان دایان بەسەر مزگەوتەکەی مامۆستا سەعیدی نوورسییدا و، من و عەبدوڵڵا چاویش و ، موصطەفا چاویش و سولەیمان و عەلییان گرتن و ، ئەوانی تریان دەرکردنە دەرەوە . بە پێ و بەسەر بەفردا بردینیان بۆ شاری ئەگریدیر و ، لەوێ بەندیان کردین و ، هەر هەموو خەڵکەکەیان لە دواندنمان قەدەغە کرد

رۆژێکیان هێنامیانە بەردەم ( مدعي عام ) و ، ئەفسەرێکی لە پلەی عەمید و عەقیددا بەلاوە بوو، پێمیان وت :

وەك بیستومانە (١٢٥)صەد و بیست و پێنج لیرەی زێرت داوە بەو پیاوە کوردە ( مەبەستی مامۆستایە ) ، جا بەو پارەیە چەند تەقەمەنییان کریی ؟!

وتم : حکومەتی تورکیی وەك کەشتییەك وەهایە و ، تۆ چاکتر ئەزانیت چیی دێتە ناوی و چییشی لێ دەرئەچێت، مامۆستا نە تۆپی هەیە و نە تفەنگ ، بەڵکو ئەو ئەیەوێ دڵ ئارامیی و تەبایی بلاو بکاتەوە

لێمی پرسیی : ئایا منداڵت هەن ؟

وتم : بەڵێ

وتی : ئەگەر راست نەکەیت و ، حەقیقەت نەڵێیت ، ئەوا سێدارە چاوەروانتە!

وتم : ئەم پیاوە خزمەتکاری قورئانە ، چیی بکات لە تۆپ و تفەنگ ؟ تفەنگ و تۆپی ئەو تەنها قورئانە

کە دادگا دانرا ، حاکم لێمی پرسیی : کێ بە عەرەبیی بانگی دا ؟!

بریارم دا خۆم وەها دەربخەم، کە هیچ نابیستم ، بۆیە بەبێ وەلام جووڵەم لە خۆم بریی ، وەك پرسیارەکەم نەبیستبێ .

حاکم ئاوری دایەوە بۆ لام و پرسیی : ئایا ناوت سولەیمانە ؟

وتم : لەبەر ئەوەی، کە زستان بوو ، رۆژێك زووتر هاتم .

حاکم وتی : پێتم وت : ناوت چییە ؟

وتم : گەورەم لە خان خەوتم .

حاکم یەکجار توورە بوو ، بۆیە سەیری دەوروبەری خۆی کرد و هاواری کرد: ئەم پیسە بکەنە دەرەوە [٢٠٣]

---

[٢٠٣] رجل القدر : ١٧٦ ـ ١٧٧

# بەندیخانەی ئەسکی شەهر

## قوتابخانەی یووسفیی یەکەم

٢٥ / نیسان / ١٩٣٥ ـ ٢٧ / مارت / ١٩٣٦

لە ناوەراستی هاوینی ١٩٣٤دا مامۆستا نوورسیی لە بارلاوە ، بە سواریی عەرەبانەیەك، کە ئەسپ رای ئەکیشا ، گوازرایەوە بۆ شاری ئیسپارتە [٢٠٤]

دوژمنانی ئیسلام ، کە هەمیشە بۆ ئەهلی ئیمان لە سەنگەردان و ، خەریکی پیلان گێرانن دژی خواناسان ، کە سەرنجی گەشە و پەرەسەندنی پەیامەکانی نوریان دا و ، هەستیان کرد وا دڵە پاکەکان باوەشی خۆشەویستییان بۆ بانگەوازی ئیمان کردۆتەوە ، کەوتنە تەڵەنانەوە تا مامۆستا نوورسیی و قوتابیەکانی تاوانبار بکەن، کە گوایا کۆمەڵەیەکی نهێنیی دژی دەوڵەتیان دامەزراندووە ، تا بەو بۆنەوە حکوومەت دەستگیریان بکات .

ئەوەبوو لە ٢٥ ی نیسانی ساڵی ١٩٣٥ دا مامۆستا و قوتابییەکانی قۆڵ بەست کران و ، رەوانەی ئەسکی شەهر کران تا لەوێ بدرێن بە دادگا .. (١٢٠)سەد و بیست قوتابیی لەگەڵ مامۆستادا کۆت کرایە دەستیان و بە سواریی لۆریی گەیەنرانە بەندیخانەی ئەسکی شەهر و ، رێگای نێوان ئیسپارتە و ئافیوونیش بە

---

[٢٠٤] رجل القدر : ١٨٠

سەربازی چەكدار تەنرا و ، سەربازێكی زۆریـان كـردە پاسـەوانی بنكـەی والیـی ئیسپارتە نەوەكو هەڵمەت ببرێتە سەری .

سەرۆكی ئەو مەفرەزەیە بەرێز ( رۆحیی ) بوو، كـە بـەزەیی بـە مامۆسـتا و قوتابیەكانیدا ئەهاتەوە ، بۆیە فەرمانی دا كۆتەكانیان لە دەست بكەنەوە .. ئەم پیاوە دوای تێگەیشتن بووە، دۆستی قوتابیانی نوور .[٢٠٥]

لە رۆژی ٢٧ ی نیسانیش‌دا شـوكری قایـا وەزیـری نـاوخۆ خـۆی و سـەرۆكی جەندرمە ، لەگەڵ چەند مەفرەزەیەك سەربازدا هاتن بۆ ئیسپارتە و ، عیصـمەت ئینۆنۆی سەرەك وەزیرانیش بەو بۆنەوە سەردانی پارێزگاكانی خۆرهەلاتی كـرد ، نەوەكو بە هۆی گرتنی مامۆستاوە شۆرشیان تیا بـەرپا ببـێ ، چـونكە دوژمنـە شاراوەكانی دین ئەوەیان بلاّو كردبۆوە، كە ( بديع الزمان ) و قوتابیەكانی ئەدرێن لە سێدارە ، تا ترس و لەرز بچێتە دڵی خەڵكەوە و ، نەوێرن لە قوتابخانەی ئیمان نزیك بكەونەوە، بە مەرجێك مامۆستا نوورسـیی بـە هـیچ شـێوەیەك كـارێكی سەلبیی دژی دەوڵەت ئەنجام نەئەدا ، بۆیە لەگەڵ ئەو هەمووە زوڵم و ناهەقییەی، كە دەرهەق بە خۆی و قوتابیەكانی ئەنجام ئەدرا ، هیچ كارێكی دژایەتیی و تۆڵە سەندن رووی نەدا بەڵكو بەرامبەر بەوە ئەوان كاری چاك و كەڵك بەخشیان لێ ئەوەشایەوە تـا ئیمـان بـەلای خەڵكـەوە خۆشەویسـت بكرێـت و ، خـەڵك بـۆی دەربكەوێ، كە ئیمـان‌دار هـیچ زیـانێكی لێ چـاوەڕێ ناكرێـت و ، خراپكـاریی بەرهەمی ئیلحاد و بێ دینییە !

مامۆستا و قوتابیانی خرانە بەندیـخانەوە و ، ئەوپەری سزا و ئازاریان ئەدرا، بەلاّم مامۆستا لەسەر ئیرشاد و ئامۆژگاریی بـەردەوام بـوو ، تـا ئـەوەبوو ، بـە

---

[٢٠٥] رجل القدر : ١٨٠ ، سيرة ذاتية : ٢٥١

کۆمــەکیی خــوا ، زۆرێــك لــە بەندییــەکان تەوبــەیان کــرد و ، روویــان کــردە خواپەرستیی .. [٢٠٦]

ماڵی یەکە یەکەی قوتابییان پشکێنرا و چیی پەیامی نووریـان تێـدا بـوو کـۆ کرانەوە ، بەڵام دەوڵەت هیچ بابەتێکی تاوان بارکردنی قوتابییانی دەست نەکەوت، لەگەڵ ئەوەش‌دا دادگا پانزە مانگ بەندیی بۆ مامۆستا بریار دا و ، (١٥)پانزە لە قوتابییەکانیش هەر یەکـە شـەش مـانگ بەنـدیی و ، ئـەوانی تریـان بـەردران ، کە(١١٥) صەد و پانزە کەس بوون، بریاری دادگای جەزای گەورەی ئەسکی شەهر ژمارە ( ١٢١ ) لـە ١٩ / ٨ / ١٩٣٩ بـووە و ، تەصـدیقی دادگـای تـەمییزی یەکەمیش ژمارە ( ٢١١١ ) لە ١٢ / ١٠ / ١٩٣٥ بووە . ( ب ٢ / ٨٣٢ ) .[٢٠٧]

لەو بەندیخانەیەدا مامۆستا و قوتابییەکانی سزای زۆریان چەشت ، ئەوەبوو بـۆ ماوەی دوانزە رۆژ بێ خواردن مانەوە و ، نەشیان هێشت قوتابییان دەست بە ئـاو بگەیەنن ، بۆیە ناچار بوون لە قوژبنێکی قاوشـەکەیان‌دا چـاڵێك هـەڵ بکـەنن و بیکەنە ئاودەست . [٢٠٨]

مامۆستا خرایە بەندیخانەیەکی تاکـە کەسـییەوە ، تـا سـزا و ئـازاری زیـاتر بچەژێت ، کەچیی مامۆستا دەستی دایە خواپەرستیی و ، نووسینی پەیامەکانی نوور .. ئەوەبوو بریسکەی بیست و هەشتەم و ، بیست و نۆهـەم و ، سـییەم و ، پاشان تیشکی یەکەم و دووهەمی نووسیی و ، هەوڵیشی ئەدا بە هەر شـێوەیەك بووە ئامۆژگاریی بۆ قوتابییەکانی بنێرێت هەتا دان بە خۆیان‌دا بگرن و ، بەرگەی

---

[٢٠٦] سيرة ذاتية : ٢٥١ ـ ٢٥٢ ، رجل القدر : ١٨٠ ـ ١٨١ ، الشعاعات : ٥١٨

[٢٠٧] سيرة ذاتية : ٢٥٢

[٢٠٨] الرجل القدر: ١٨١

سزا و ئازار بگرن و ، هەمیشە دڵیان لای خوا بێت و ، بە نیـەتێکی خالیصـەوە پەنای بۆ بەرن، هەروەها ئەو پەیامانەی، کە ئەینووسین ئەی خستنە سەر پارچە کاغەزی بچووك و ، لە ناو پاکەتی شقارتەدا هەڵی ئەگرتن ، تا کاتێك کە دەستی بە ئاو ئەگەیاند ، یان سەرتاش ئەهاتە لای ئەو نووسـینانەی ئەگەیانـدە دەسـت قوتابیەکانی و ، ئەوانیش بە پەلە نوسخەیان لە بەر ئەگرتنـەوە و ، بـە نهێنیـی رەوانەی دەرەوەیان ئەکردن ..

کاربەدەستانی دەوڵەت نەیانئەزانیی چۆن بەربەسـت لەبـەردەم بڵاوبوونـەوەی پەیامـەکاندا دروست بکەن ، بۆیە وەك مشکی دەرمان خواردوویان لێ هاتبوو و، بە راست و بە چەپدا ئەگەران بۆ پەیامەکان ، بـە هیـوای ئـەوەی مامۆسـتا و قوتابیانی تاوانبار دەرکەن .

ئەوەبوو لە پشکنینێکدا لەناو پەیامەکانی نووردا کتێبێکیان دۆزییەوە کە بە دەست لەسەری نووسرابوو ( تایبەتە بە رەمەزان ) .

کەوتنە پرسیار : داخۆ ئەم رەمەزانە کێ بێت ؟ لە کوێ ئەژیی و ، لە کوێ کار ئەکات ؟ ئەی چۆن تا ئێستا دەست گیر نەکراوە ؟ بێ گومان کەسێکی بەناوبانگە وا ناوی لەسەر کتێبێك نووسراوە ، کەچیی قوتابیانی نوور دان بەوەدا نانێن، کـە ئەیناسن . کەواتە دیارترین یارمەتیدەری سەعیدی نوورسییە !

بۆ ئەمە دەوڵەت بریاری دا چیی شارۆچکە و گوندی ئەو ناوچەیە هەن بە وردیی بیانپشکنن بە دوای رەمەزان ناودا

دوای گەرانێکی زۆر لادێییەکی بەستەزمانی سادە و نەخوێندەواریان دۆزییەوە، کە ناوی رەمەزان بوو .. ئەو هەژارە دەستگیر ئەکەن و ، بە کۆت و زنجیرەوە و، بە پاسەوانییەکی توندەوە رەوانەی بەندیخانەی ئەسکی شەهری ئەکەن، هەرچـەندە

چەند جار سوێندی بۆ خواردن، کە ئەو نەخوێندەوارە و ، لە ژیانیا هیچ پەیامێکی نووری نەدیوە و ، چاویشی بە ( بدیع الزمان ) نەکەوتووە .

چەند سوێندی خوارد و ، چەندیش پارایەوە بێ هوودە بوو .. دوو مانگی رەبەق لە بەندیخانەدا مایەوە ، هەتا ئەوەبوو یەکێك لە لێپرسراوان لە کتێبەکە کۆڵییەوە، سەیری کرد ئەم کتێبە دەربارەی ئاداب و حیکمەتی رۆژووی مانگی رەمەزان باس ئەکات .[٢٠٩]

مامۆستا و قوتابییەکانی بە چەند ماددەیەك تاوانبار کرا بوون، کە ئەمانەن :

**ماددەی یەکەم :** دەنگ و باس بلاّو بووبوویەوە، کە نیازی ئەوە کراوە ئاسایشی ولاّت تێك بدرێت ، ئەویش لە رێی بەکارهێنانی دینەوە ، بە بیانووی گێڕانەوەی دەسەلاّتی شەریعەت .

مامۆستا ئەو هەواڵە ئەداتە دواوە و ، بۆ هەموانی دەرئەبرێت، کە ئەوان سەرگەرمی زانستە ئیمانیەکانن و ، بە هیچ شێوەیەك ئاور بەلای شتی ترەوە نادەنەوە، ئەوان تەنها رەزامەندیی خوایان مەبەستە، هەروەها ئەیدات بە گوێیان دا، کە ئەو پیاوێکە چووە بە ساڵدا و ، چاوەڕوانی سەفەری قیامەتە و ، بە تەمای ژیانی فانیی نیە ، چونکە لە لای یەقینە، کە ئەمرێت و ئەچێتە ناو قەبری تەنگ و تاریکەوە، بۆ ئەمە پەیامەکانی نوور بە چارەسەر ئەزانێت تا قەبری چاڵی عەدەم و نەمان بگۆڕێت بۆ دەرگای بەهەشت و ، هەرکەسیش ژیر بێت تەنها بۆ ئەو ئامانجە بەرزە خۆی ماندوو ئەکات .

---

[٢٠٩] رجل القدر : ١٨١ ـ ١٨٢

مامۆستا کاربەدەستان ئاگادار ئەکات، کە ئەوپەری بێ ویژدانییە پەیامەکانی نوور مافی خۆیان پێیان نەدرێت و ، وەها سەیر بکرێن، کە بۆ مەبەستی سیاسیی بەکار ئەهێنرێن .

**ماددەی دووهەم :** لە کۆتایی هەندێ پەیامدا، وەك موعجیزاتی ئەحمەدیی ، ئیمزای هەندێ لە قوتابیان بەرچاو ئەکەوێت و ، ئەوە ئەگەیەنێت، کە ئیمزای ئەندامانی کۆمەڵەیەك یان دەروێشانی تەریقەت بن !

مامۆستا لە وەڵامی ئەمەدا کاربەدەستان ئاگادار ئەکات، کە ئەو خاوەن ئیمزایانە هیچ تاوانێکیان نیە ، چونکە ئەوانە پیاوی قیامەتن، هەتا یەکێك لەو بەرێزانە برایەکی موسڵمانی یەکجار خاوێن و رەوشت بەرز بووە ، کە موقەددەمی خانەنشین ، خوا لێ خۆش بوو بەرێز عاصیم بووە، کاتێك، کە لە ئیسپارتە بۆ پرس و جواب بانگی ئەکەن ، بۆی دەرئەکەوێت، کە ئەگەر راستیی بڵێت زیان بە مامۆستاکەی ئەگات و ، گەر درۆیش بکات تەمەنی دوور و درێژی پرشەرەفی سەربازیی خۆی لەکەدار ئەکات ، بۆیە لە خوا پارایەوە، کە گیانی بکێشێت .

ئەوەبوو خوای پەروەردگاریش دۆعاکەی لێ وەرگرت و هەر لەو کاتەدا گیانی کێشا و ، پلەی شەهیدی راست و دروستیی دەست گیر بوو .

لەم رووداوەشدا کەراماتێکی پەیامەکانی نوورمان بۆ دەرئەکەوێ، کە هەرکەس بەشداریی دەرسی پەیامەکان بکات ، گیانی بە ئاسانیی ئەکێشرێت .

**ماددەی سێهەم :** پەیامەکان بوونەتە کۆسپی بەردەمی ئازادیی و ، ئاسایشی گشتیی تێك ئەدەن ، چونکە بەبێ رەزامەندیی دەوڵەت بڵاو بوونەتەوە و ، بوونەتە هۆی بەهێزبوونی هەستی ئیمانیی .

لە وەڵامدا مامۆستا دەری ئەبرێت، کە پەیامەکانی نوور مایەی پەخشان کردنی نوور و رووناکیین و ، رووناکییش هیچ زیانێکی لێ ناکەوێتەوە ، چونکە ئەمە

سیانزە ساڵە دەستبەرداری سیاسەت بووە، و خەریکە حەقیقەتە پیرۆزەکانی ئیمان ئەچەسپێنێ ، کە بنچینەی هەردوو ژیانی دنیا و قیامەتن و ، لە ٩٩٪ صەدا نەوەد و نۆی ئەم میللەتە موبارەکە موسڵمانە ، دوای خوێندنەوەی پەیامەکان شاهیدیی ئەدات، کە بە کەڵکن و هیچ زیانێکیان پێوە نەبینراوە

هەروەها ئەیدا بە گوێیاندا، کە پەیامەکان مایەی چەسپاندنی ئەمن و ئاسایشی وڵاتن و ، سەرچاوەی هەموو رەوشت و سیفەتێکی بەرزن و ، بێ ئیمانیی مایەی ئاژاوەیە

هەروەها ئەیهێنێتەوە یادیان، کە سیی ساڵ لەوە و بەر وەزیری موستەعمەراتی بەریطانیی دەری بریوە، کە ئەوانی ئەوروپایی ناتوانن بە تەواویی حوکمی موسڵمانان بکەن هەتا قورئان بە دەستیانەوە بێت ، بۆیە پێویستە لە ناوی بەرن و موسڵمانانی لێ دوور بخەنەوە

جا وتەی ئەم پیاوە مامۆستا نوورسیی دائەچڵەکێنێ و ، وریای ئەکاتەوە، کە چ پیلانێك دژی موسڵمانان ئەکێشرێت، بۆیە قۆڵی مەردایەتیی لێ هەڵ ئەماڵێ و، بریار ئەدات خۆی بۆ خزمەتی قورئان یەك لایی بکاتەوە و ، دوای جیهادی نەفسی خۆی رووی جیهادی ئەکاتە فەیلەسووفە گومراکانی ئەورووپا ، تا ئەوەبوو بەرەکەتی قورئان گەیشتە فریای و ، پەیامەکانی نووری نووسیی ، تا دەمکوتی ئەو مولحیدانە بکات .

ماددەی چوارەم : هەواڵ ئەدرێت، کە مامۆستا دەرسی تەریقەت ئەڵێتەوە ، کە ئەمەش بەلای دەوڵەتەوە کارێکی یاساغە

مامۆستایش ئەوە روون ئەکاتەوە، کە ئەو خەریکی راستییەکانی ئیمانە و ، ئەم سەردەمە بە سەردەمی تەریقەت نازانێت، چونکە زۆر خەڵك ئەچێتە

بەهەشتەوە بەبێ شوێن کەوتنی تەریقەت ، بەڵام بەبێ ئیمان هیچ کـەس ناچـێتە بەهەشتەوە.[٢١٠]

جا هەروەك مامۆستا بەوە تاوانبار ئەکرا، کە کۆمەڵەی نهێنیی پێك هێناوە، یەخەشیان ئەگرت، کە پارە لـە کـوێ دێـنن بـۆ بـەڕێوەبردنی ئـەو کۆمـەڵەیـە؟ مامۆستاش وەلامی ئەدانەوە، کە ئەو دەستی لە سیاسەت شۆردووە و ، پەنای بە خوا گرتووە لە شەیتان و لە سیاسەت و ، ئەوە دە ساڵیشە وا لە ئیسپارتەدا و، بە وردیی چاودێریی ئەکرێت ، بێ ئەوەی خەریکی سیاسەت بێت .

هەروەها لە ڕێگای ئیمانەوە بە لە٩٩٪ صـەدا نـەوەد و نـۆی هاوولاتیانـەوە پەیوەندیی ئیمانیی ئـەبێت، کەچـیی لـە ڕێـی دروسـت کردنـی ( کۆمەڵـە ) وە پەیوەندیی تەنها بە چەند کەسێکی کەمەوە ئەبێت .

مامۆستا دەری ئەبرێ، کە بە دڵ گەلی تورکیی خۆش ویستووە ، چونکە ئەوە گەلێکە بەر ستایشی قورئان کەوتووە و ، ئەمیش بە شـاهێدیی هـەزار تـورکیی ئەوەندەی هەزار تورکیی هەڵگری بیری نەتەوایەتیی خزمەتی بەو گەلە کردووە و ، خۆی حەزی کردووە لەو غەریبییەدا و لەناو ئەو گەنجە خوێن گەرمانەدا بمێنێتەوە ڕوونیشی ئەکاتەوە، کە ئەو بە پارەیەکی یەکجار کەم ژیانی گوزەراندووە و دەستی لە کەس پان نەکردۆتەوە ، بە ڕادەیەك کە ڕۆژێکی بە چل پارە بەسەر بردووە و ، حەوت ساڵیش عەبایەکی پۆشیوە، کە لە حەفتا جێگاوە پینە کراوە.[٢١١]

کاربەدەستان بیانوویەکی تریان بە مامۆستا ئـەگرت، کـە بریتیـی بـوو، لـە موحاسەبەکردنی لەسەر لانەبردنی کلاو و مێزەرەکەی و ، لە سەر نەکردنی شەبقە،

---

[٢١٠] سيرة ذاتية : ٢٥٣ ـ ٢٦٠

[٢١١] سيرة ذاتية : ٢٦١ ـ ٢٦٢

ئەویش وەلامی ئەدانەوە، کە ئەو یاسایە ئەم ناگرێتەوە چونکە ئەم لە ژیانی گۆشەگیرییدا ئەژیت .[٢١٢]

پاشان داوا لە کاربەدەستان ئەکات، کە لە خۆی و پەیامەکانی بگەرێن ، چونکە هێزێك پشتگیریی پەیامەکان ئەکات، کە بە هیچ شێوەیەك بەوان چار ناکرێت .. دەی با ئیتر سزا و ئازاری قوتابییە بێ تاوانەکان نەدەن ، نەوەکو خەشم و قینی خوای بەدەسەلات بجوولێت و بەلا و گرانیی و دەرد و دا بەسەر ولات دا ببارێن .

دوای ئەوەش داوای گێرانەوەی ئەو پەیامانەی ئەکات، کە دەولەت دەستی بەسەردا گرتوون، کە بایی هەزار لیرە زیاتر ئەبن ، چونکە هیچ رستەیەکی نەگونجاویان لە خۆ نەگرتووە و ، لە مەسەلە ئیمانییەکان و لە ئیعجازی قورئان ئەدوێن و ، باسی بیرەوەریی سەردەمی پیری خۆی ئەکەن .[٢١٣]

مامۆستا بە چیرۆکێك بە کاربەدەستانی رائەگەیەنێت، کە مادەم کاربەدەستان دەعوایان لەسەری هەیە ئەو مافی خوراوە و ، کەسێك نیە بەرگریی لێ بکات . ئەمەش چیرۆکەکەیە :

لە دێرین زەماندا سولتانێك تووشی دەردێك ئەبێت، کە جگە بە خوێنی منداڵێك بە هیچ شتێك چارەسەر ناکرێت . ئەوەبوو باوکێك بە پارە کورەکەی هێنا بۆ سەربرین و ، حاکمیش فەتوای بۆ دا

---

[٢١٢] سيرة ذاتية : ٢٦٩ ـ ٢٧٠

[٢١٣] سيرة ذاتية : ٢٧٠

بۆ ئەم سەربرینە کۆڕێـك گـیرا و منداڵەکەشـیان هێنایـە بـەردەم کۆرەکـە منداڵەکە، کە زانیی سەری ئەبرن ، لە جیاتیی شیوەن و هاوار و پارانەوە تا لێی بگەرێن ، دایە قاقای پێکەنین ..

بە سەرسورمانەوە لێیان پرسیی :

ـ بۆچ داد و هاوار ناکەیت ، لە بریی پێکەنین ؟

وەڵامی دایەوە : ئەگەر مرۆڤ تووشی لێقەومانێك ببێ ، یەکەم کەسێك، کە ئەو هاواری بۆ بەرێت باوکیەتی ، پاشان بۆ لای حاکم ، پاشان بۆ لای سوڵتان، ئەوەتا باوکم ئەم فرۆشێ تا سەرم ببرن و ، حـاکمیش بریـاری کوشـتنمی دەرکـردووە و، سوڵتانیش چاوەروانی خوێنەکەمە، جا حاڵ و هەڵوێستی وەها سـەیر و نـامۆ و ناشیرین و قیزەون، کە تا ئێستا شتی وەها نەبینراوە ، هەر شایانی پێکەنینە.

مامۆستا روو ئەکاتە شوکریی قایای وەزیری ناوخۆ و پێی را ئەگەیەنێت، کـە ئەویش وەك ئەو منداڵە بێ چارەیەی لێ قەوماوە، لە کاتێك‌دا، کە ئەو بە تەمایە بارودۆخی گوزەرانی بباتە بەردەم والیی شار، کە نوێنەری حکومەتە ، پاشان بـۆ لای عەدالەتی مەحکەمە، پاشان بۆ لای وەزیری ناوخۆ ، تا لەو ستەمە ئاگـادار بکرێن، کە مامۆستا و قوتابییەکانی روو بە رووی بوونەتەوە و ، لـە ژێـر چـنگی زاڵمان دەریان بهێنن ، ئەبینن وەزیری ناوخۆش تووشی غروور و لە خۆبایی بـوون بووە و ، بە بەڵگەی هیچ و پووچ ئەیەوێ لەناویان بەرێت .

دادی خۆی لە دەستی شوکریی قایا ئەباتـە بـەردەم شـوکریی قایـای وەزیـری ناوخۆ !! [٢١٤]

---

[٢١٤] سيرة ذاتية : ٢٧١ ـ ٢٧٢

سەرەنجام دادگا لە ١٩ / ٨ / ١٩٣٥دا حوکمی دەرکرد، کە بریتیی بوو، لە بەندکردنی بۆ ماوەی یانزە مانگ لە سزای بلاوکردنەوەی پەیامی ( بالاپۆشیی ) دا [٢١٥]

لە ساڵی ١٩٣٥دا و لەو کاتەدا، کە مامۆستا توندی بەندیخانەی ئەسکی شەهر کرابوو ( مدعي عام ) ی دادگای جەزای گەورە لە ئەسکی شەهر ئەگێڕێتەوە، کە ڕۆژێکیان مامۆستا نوورسیی لە بازاردا ئەبینیێ، سەرسام ئەبێت و ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە بەڕێوەبەری بەندیخانەوە ئەکات و بە هەڕەشەوە پێی ئەڵێت :

چۆن ڕێتان بە ( بدیع الزمان ) داوە دەرچێت بۆ بازار ، من بە چاوی خۆم لە بازاردا دیم ؟

بەڕێوەبەریش وەڵامی ئەداتەوە : ببوورن ، گەورەم ! ( بدیع الزمان ) لە بەندیخانەدایە و ، ئەشتوانن بفەرموون بێن بۆ بینینی لە بەندی تاکە کەسییدا

( مدعي عام ) دێت و پێکەوە لەگەڵ بەڕێوەبەردا سەردانی بەندیخانە ئەکەن و، ئەبینن مامۆستا وا لەوێ ..

ئەم دەنگ و باسە لە نێوان حاکمەکان دا بلاوە ئەکات و خەڵکیی بە کەرامەتی مامۆستای لە قەڵەم ئەدەن .

هەر لەو جۆرە بەڕێوەبەری بەندیخانەی ئەسکی شەهر ڕووداوێکی تر ئەگێڕێتەوە، کە جارێکیان دەنگی ( بدیع الزمان ) ی بەرگوێ ئەکەوێت و ، داوا ئەکات لە بەندیخانە دەرچێت بۆ ئەنجام دانی نوێژی جومعە لە مزگەوتی ( ئاق جامع )، لە کاتی نوێژدا سەر لە زیندانەکەی مامۆستا ئەدات و ، سەیر ئەکات

---

[٢١٥] سيرة ذاتية : ٢٥٢ ، رجل القدر : ١٨٥

( بدیع الزمان ) ی لێ نیە و ، پاسەوانەکان لە جێی خۆیانن و ، دەرگاکانیش قوفڵ دراون ..

بەرێوەبەر بە پەلە ئەچێت بۆ مزگەوتی ناوبراو و ، ئەبینێ وا مامۆستا لە لای راستی ریزی یەکەمی مزگەوتدایە، دوای نوێژ ئەگەرێت بە دوایدا و نایدۆزێتەوە، بە پەلە ئەگەرێتەوە بەندیخانە و ، ئەبینێ وا ( الله أکبر ) ئەڵێت و ئەچێت بە سەجدەدا

رووداوی تریش لەو جۆرە چەندین جار روویان داوە، کە مامۆستا لە بەندیخانەی دەنیزلییدا بووە، لە نوێژی فەجردا بەشداریی نوێژی جەماعەتی کردووە .

جا ئەم هەواڵانە کاربەدەستانی حکومەت ئەیان گێرانەوە، کە دژایەتیی مامۆستایان ئەکرد [٢١٦]

جا مامۆستا نوورسیی پێی خۆش بووە ئەم رووداوانە لە خۆی دوور بخاتەوە و ، بە کەرامەتی پەیامەکانی نووریان لە قەڵەم بدات .

دەربارەی کەرامەتیش بەرێز ( کمال طان أر ) ئەمەمان بۆ ئەگێرتەوە و ئەڵێت :

قوتابیی دوا قۆناغی کۆلیژی یاسا بووم .. ئەبوایە سەرمان لە دادگا و بەندیخانەکان بدایە .. رۆژێکیان بۆ سەردانی مامۆستا چووم بۆ بەندیخانەی ئەسکی شەهر .. کە چوومە ژوورەوە لای ئەبینم لەسەر بەرماڵەکەی دانیشتووە و، خەریکی خوێندنی ویردی دوای نوێژە .. دەستیم ماچ کرد و ، پێم وت :

ـ مامۆستاکەم ! ئەڵێن کەراماتی غەیبیی زۆرتان پێوە ئەبینرێن ، کەچیی من هیچ حاڵەتێکی لەعادەت بەدەرم پێتانەوە نەدیوە، جا ئەگەر بە راستیی ئەو

---

[٢١٦] تاريخ حياة الأستاذ ـ حياة أسكي شهر .

حاڵەتانە هەن ، ئەوا لەبەر دەمم‌دا دەریان بخەن ! بۆ نموونە با تەسبیحەکەتان بچێت بەرێوە

مامۆستا زەردەخەنەیەکی کرد و ، ئەم چیرۆکەشی بۆ باس کردم هەتا کارەکە روون بکاتەوە :

ـ پیاوێك کورێکی ئەبێت و یەکجار خۆشی ئەوێت ، چونکە تەنها ئەو کورەی هەبوو .. رۆژێکیان لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ دووکـانی دورر و گەوهـەر تـا هەنـدێ دیاریی بەنرخی لە ئەڵماس و گەوهەر ، بە پێی حەزی کـورە خۆشەویسـتەکەی ، بۆی بکرێت ، هەتا بیسەلمێنێ، کە یەکجار خۆشی ئەوێت .

دووکان دارەکە سەقفی دووکانەکەی بە میـزەڵانی رەنگا و رەنگ رازاندبۆوە ، تا سەرنجی کریارەکان رابکێشێت، کاتێك منداڵەکە چووە ناو دووکانەکەوە، کە بـە میزەڵانەکان رازابۆوە ، رەنگە دڵ رفێنەکانیان سەرنجیان راکێشـا و بـە گریانـەوە وتی :

ـ بابە ! ئەمەوێ ئەو میزەڵانانەم بۆ بکریت .. میزەڵانم ئەوێت .

ـ کۆرپە خۆشەویستەکەم ! من گەوهەری بەنرخ و ، ئەڵماسی گران بەهات بـۆ ئەکرم . کەچیی منداڵەکە هەر لەسەر داواکردنی میزەڵانەکان سوور بوو .

دوای ئەوەی، کە مامۆستا نموونەکەی تەواو کرد ، وتی :

ـ براکەم ! من شاگرد و خزمەت کارم لە دووکانی گەوهەری قورئانی پیرۆزدا، نەك فرۆشیاری میزەڵانی رەنگا و رەنگ .. لە دووکانەکەم‌دا میزەڵان نافرۆشم و، دووکان و بازاری منیش تەنها ئەڵماسی نەمری قورئـانی پـیرۆزی تێدایـە ! جـا، براکەم ، من سەرگەرمی جاردانم بۆ نووری قورئان .

ئیتر لە مەبەستی مامۆستا تێ گەیشتم و ، هەستم بە هەڵەی خۆم کرد .[٢١٧]

مامۆستا، کە لە ئەسکی شەهر بەند ئەکرێت، پەیوەندیی بە قوتابیەکانیەوە ئەکات و ، بە نامە ئامۆژگارییان بۆ ئەنێرێت ، تا لەسەر کاری پیرۆزیان بەردەوام بن و ، پروپاگاندەی ناحەزان کاریان تێ نەکات .

رۆژێکیان ، کە جەژنی کۆماریی بوو، مامۆستا لەبەردەم پەنجەرەی بەندیخانەکەی ئەسکی شەهردا، کە بەسەر قوتابخانەیەکی دواناوەندیی کچاندا ئەی روانی ، دائەنیشێت .. سەیر ئەکات وا قوتابییە کچەکان بە بۆنەی جەژنی کۆمارییەوە ، لە گۆرەپان و حەوشەی قوتابخانەکەدا خەریکی یاریی و هەڵ پەرکێ و سەماکردنن، لە ناکاو حاڵی ئەو کچە گەنجانە لەسەر شاشەیەکی مەعنەویی دێتە بەرچاوی مامۆستا، کە دوای پەنجا ساڵ چییان بەسەر دێت، ئەوە دێتە بەرچاوی، کە نزیکەی (٥٠)پەنجا لەو کچانە لە کۆی(٦٠)شەصت قوتابیی ئەمرن و ، لاشەیان ئەبێتەوە بە گڵ و ، لەناو قەبردا سزا ئەدرێن و ، دە قوتابییشیان ئەبنە پیرەژنی ناشیرین و ، تەمەنیان ئەگاتە حەفتا و هەشتا ساڵیی، کە دەم و چاویان ناشیرین ئەبێت و ، جوانییان لە دەست ئەدەن و ، لە ئەنجامی قێز و بێز و سووك سەیرکردنی کەسانی دەوروبەریان هەست بە ئێش و ئازار ئەکەن و ، لە ژیانی خۆیان بێزار ئەبن ، چونکە لە کاتی گەنجییاندا داوێن پاکیی خۆیانیان نەپاراستووە !

کە مامۆستا ئەم دیمەنەی دێتە بەرچاو بەزەیی بە حاڵیاندا دێتەوە، و دڵی دێتە کوڵ بۆیان ، بە گەرمیی بۆیان ئەگریی ، بە رادەیەك کە سەرنجی هەندێ لە

---

[٢١٧] ذكريات عن سعيد النورسي : ٣٧

هاورێیانی بەندیخانە رائەکێشێ و ، ئەوانیش بە پەلە دێن بە دەمیەوە و ، لە هۆی ئەم گریانەی پرسیاری لێ ئەکەن .

ئـەمیش داوایـان لێ ئـەکات، کـە ئێسـتا وازی لێ بهێـنن و ، لێـی دوور بکەونەوە .[٢١٨]

ئەمە دڵ و دەروونی ئیمانداره .. بەزەیی بە لێقەوماواندا دێتەوە .. بۆ حاڵی سـەرگەردان و گومرایـان فرمێسـك هـەڵ ئەرێـژێت .. حـەز ناکـات مرۆڤـەکان سەرلێشێواو و بەدبەخت بن و ، سەرەنجامیش ببنە خۆراکی ئاگری دۆزەخ ..

هەر لە بەندیخانەی ئەسکی شەهردا مامۆستا تیشکی یەکەمی نووسـیی، کـە بریتییە لە مانای ئیشاریی سیی و سێ ئایەتی قورئانی پـیرۆز، کـە ئامـاژە بـۆ پایەداریی پەیامەکانی نوور ئەکەن .

هەروەها ئەم پەیامانەشی نووسیی: بریسکەی بیست و حەوتەم، کە مامۆستا لە بەردەم دادگای ئەسکی شـەهردا بـەرگریی لـە خـۆی و پەیامـەکانی ئـەکات و، بریسکەی بیست و هەشتەم، کە نامەی دڵدانەوەن بۆ براکانی لـە بەندیخانـەدا و، بریسکەی بیست و نۆهەم، کە بە عەرەبیی نووسیویەتی و ، بریسکەی سیهەم، کە شەرحی شەش ناوی پیرۆزی ( الإسم الأعظم ) ئەکات : ( الفرد ، الحـي ، القيـوم، الحكم ، العدل ، القدوس ) و ، تیشکی دووهەم کە تەوحید ئەسەلمێنێ و، ماناکانی ( قل هو الله أحد ) روون ئەکاتەوە ..[٢١٩]

---

[٢١٨] الشعاعات : ٢٤٧
[٢١٩] سيرة ذاتية : ٣٠١

بەشی نۆهەم

# نەفیی کردن بۆ قەسطەموونیی

## *قوتابخانەی نووریی دووهەم*

١٩٣٦ ـ ١٩٤٣ ز

مامۆستا لە ئەسکی شەهر سالێك بەند کرا و ، دوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە نەفیی کرا بۆ قەسطەموونیی، کە ئەبوا حکومەت دەستی لە یەقەی بەردایە و ئازادی بکردایە تا لە هەر کوێ پێی خۆشە نیشتەجێ ببوایە

بەڵێ لە ٢٧ / ٣ / ١٩٣٦ دا بەبێ هیچ بەڵگەیەکی قانوونیی نەفیی کرا بۆ شاری قەسطەموونیی .

سەرەتا کە گەیشتە ئەوێ ، بۆ ماوەی سێ مانگ لە بنکەی پۆلیس مایەوە ئەوەبوو لە هەموو لایەکەوە ، بەو پیرییە خەم و خەفەت و دەست لە خۆ بەردان روویان تێ کرد ، بەڵام خوای خاوەنی سۆز و شەفەقەت دەرووی لە مامۆستای بێ ناز کردەوە .. ئەوەبوو ئەو پۆلیسانەی، کە لەو بنکەیەدا لێ پرسراوی بوون ، بوونە دۆستی دڵسۆز و بەوەفا بۆی ، بە رادەیەك، کە هەر کاتێك حەزی لە پیاسە بکردایە ئازادیان ئەکرد تا بە دەوری شاردا بسووڕێتەوە و ، بە دڵ و بە گیان خزمەتیشیان ئەکرد و ، سەرەرای ئەوەش کە ناچاریان نەئەکرد شەبقە لەسەر بکات .

دەربارەی ژیانی ئەو سێ مانگە کە لە بنکەی پـۆلیس‌دا مایـەوە ، وا بـەرێز ئەمین چایەر [٢٢٠] کە نازناوی ( چایچیی ) بەسەردا بررا بـوو لـە بیرەوەرییەکانیـدا بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

ڕۆژێکیان چاوم بە پیاوێك کەوت، کە سیمای ویقار و زانایەتیی پێـوە بـەدیی ئەکرا، بەرەو رووی ڕۆیشتم و دوای ئەوەی، کە سەلامم لێ کرد، پرسیارم لێ کرد:

ـ خەڵکی کوێیت ؟ وەڵامی دامەوە :

ـ لێم نزیك مەکەوە ، چونکە پیـاوانی پـۆلیس چـاودێریم ئەکـەن ، ئەترسم ئازارت لێیانەوە پێ بگات .

ئەم بەیەك‌گەیشتنە ئەوەندە ڕاستگۆیی و ئیخلاصی تێدا بوو، کە ڕام بکێشێ بۆ لای و، لە هەموو کون و قوژبنێکی شاردا بەدوایدا بگەڕێم ، تا ئـەوەبوو، لـە بنکەی پۆلیسی ناو بازاردا دۆزیمەوە و ، پاشان بۆم دەرکەوت کـە جارجـار سـەر ئەکەوێتە سەر قەڵاکەی قەسطەموونیی و ، پۆلیسێکیش دوای ئەکەوێت .

ڕۆژێکیان پۆلیسێك هاتە لام و بانگی کردم بۆ سەر قەڵاکە، کە مامۆستا لەوێ بوو، کە بە یەك گەیشتین بە پۆلیسەکەی وت: براکەم ! ئـەم پیـاوە یەکێکـە لـە ناسراوانم ، خۆزگە ماوەمانت بدایە پێکەوە قسە بکەین، پۆلیسەکە لێمـان دوور کەوتەوە و ، مامۆستاش دەستی بە باس‌کردنی بارودۆخی ژیانی سەختی خـۆی و تەن‌نادروستیی خۆی بە بۆنەی ئەوەوە، کە ژەهر کرابووە خواردنەکەیەوە، بۆ کردم ، پاشان وتی: پێویستییم بە هەندێ شەکر و چای و ئەو جۆرە شتانە هەیە و، وتیشی :

---

[٢٢٠] ئەمین چایەر : یەکێك بووە لە پیاوماقووڵانی عەشرەتە کوردەکان، کە نەفیی کراوە بۆ قەسطەمـوونیی . کۆشەیەکی بچووکی دروست کردووە تا چای تێدا بفرۆشێت، کە مامۆستای ناسیی بووە دۆستێکی خزمەت گوزاری قورئان و ، زۆربەی کات لە خزمەتی مامۆستادا بووە، پاشان لە بەندیخانەی دەنیزلیی لەگەڵیا بەند ئەکرێت و ، لە ساڵی ١٩٦٧یش‌دا لە شاری وان کۆچی دوایی ئەکات ..

ـ ئەوان ناهێڵن هیچ کەس چاوی پێم بکەوێت، جا من ئەمەویٚ بە ( مفوض )ەکە بڵێم کە نیازم کردووە نوێنەکەم بفرۆشم ، تا ئەو فرۆشتنە ببێتە هۆیەك بۆ پەیوەندیی نێوان من و تۆ تا ئەم گرفتە چارەسەر ئەکرێت .

ئەوەبوو مامۆستا دەستی بە گیرفانیا کرد و ، سیٚ لیرەی زێری دەرهێنا و ، خستیە ناو دەستمەوە و وتی :

ـ ئەم لیرە زێرانە هی رۆژانی جەنگی جیهانیی یەکەمن و ، چەندین ساڵە هەڵم گرتوون ، بیان گرە و ، بە پێی پێویستییم بۆم خەرج بکە .

پێم وت :

ـ من حاڵ و گوزەرانم باشە و پێویستییم بە پارەی تۆ نیە ، واتە بە پارەی خۆم شتەکانت بۆ ئەکرم، وەلاٚمی دامەوە :

ـ بەبیٚ بەرامبەر لە هیچ کەسێك شت وەرناگرم .

لیرە زێرەکانم هەڵ گرتن و چووم لە بازاردا یەکێکیانم بە پارەی ئێستا گۆرییەوە، بۆ رۆژی دووهەم ( مفوض )ەکە بانگی کردم و وتی: ئەو مامۆستایە ئەیەویٚ نوێنەکانی بفرۆشێت ، جا ئایا تۆ ئەی کریی ؟ وتم : بەڵیٚ .

پاشان وتی : چۆن و لە کویٚ ئەم پیاوە ئەناسیت ؟

وەلاٚمم دایەوە: یەکێکە لە ناسراوە پێشووەکانم، کە جاران یەکترمان زۆر ئەدیی.

دوای ئەوەی، کە بۆ کرینی نوێنەکان رەزامەندییم دەربریی ، پۆلیسەکە بردمی بۆ بنکەی پۆلیس ، تا چاوم بە مامۆستا بکەوێت، کە لە نهۆمی دووهەم دا بوو ..
چاوم بە نوێنەکان کەوت و ، دام نا بایی بیست و پێنج لیرە ببێت و ، جارێکی تر دامەوە بە کریٚ بە مامۆستا و وتم :

ـ بەو مەرجەی کریٚی نوێنەکان رۆژانە وەربگرم .

بەم شێوەیە ، بە هۆی ئەم نوێنانەوە و ، بە بیانووی کرێ وەرگرتنەوە ، رۆژانە ئەچووم بۆ بنکەی پۆلیس و ، هەرچیی مامۆستا پێویستی بوایە بۆم ئەبرد [٢٢١]

دوای بەسەرچوونی سێ مانگەکە لەبەردەم بنکەی پۆلیس‌دا خانوویەکیان بۆ مامۆستا بە کرێ گرت تا بەردەوام خۆی و میوانەکانی لە ژێر چاودێرییدا بن . مامۆستا ئەم ماڵەی بە قوتابخانەی نووریی دووهەم لە قەڵەم داوە ، کە بریتیی بوو لە دوو نهۆم و ، نهۆمی خوارەوەی ئەمباری سووتەمەنیی بوو، و نهۆمی سەرەوەش لە دوو ژوور پێك هاتبوو و ، کرێی ئەم خانووە مامۆستا نوورسیی خۆی ئەیدا مامۆستا حەوت ساڵی لەم خانووەدا بەسەر برد، کە لە تەختە دروست کرابوو و ، کۆمەڵە پەیامێکی زۆری تیا نووسیی، کە یەکێکیان بریتیی بوو، لە ( الآیة الکبری ) .[٢٢٢]

وەك مامۆستا لەم قوتابخانە نوێیەدا سەرگەرمی دانانی پەیامەکان بوو ، خوای گەورە چەند قوتابییەکی پاك و دڵسۆزی بۆ نارد تا لەو کارە پیرۆزەیدا کۆمەکیی بکەن کە ئەمانە ناودارەکانیانن :

---

[٢٢١] ذکریات عن سعید النورسي : ٤٦

[٢٢٢] هەروەها ئەم پەیامانەشی لە قەسطەموونیی نووسیی :

أ ـ تیشکی سێهەم، کە پەیامی ( مناجاة ) ە

ب ـ تیشکی چوارەم، کە پەیامی ( حسبیة ) یە

ج ـ تیشکی پێنجەم، کە باسی هاتنی ئاخرزەمان و دەججال ئەکات .

د ـ تیشکی شەشەم، کە مانای تەشەهھود و صەڵەوات ئەکات .

و ـ تیشکی نۆهەم، کە هاتنی رۆژی حەشر ئەسەلمێنێ .

ز ، ح ، ط ـ پاك نووسی تیشکی یەکەم و دووهەم و ، رێك و پێك کردنی پەیامی ( حزب الأکبر النوري ) کە پوختەی بریسکەی بیست و نۆهەمە . ( سیرة ذاتیة : ٣٢٠ ) .

فەیضیی ، ئەمین ، حیلمیی ، صادق ، نەظیف ، صلاح الدین، ئەمانە ، جگە لە ئەمین چایەر ، دوو ساڵ دوای هاتنی مامۆستا بۆ قەسطەموونیی ، واتـە لـە ١٩٣٨دا ، دەستیان دایە خزمەتی پەیامەکان، بەڵام ئەمین چایەر لە سەرەتاوە مامۆستای ناسیی وەك لە پێشەوە باس کرا [٢٢٣]

لەو ساڵانەدا، کە رۆژی بێ دینیی بوو، ناوی خوای باڵادەست لە بیری خەڵکیی برابوویەوە و ، بەرەی تازە دوور لە دین و رەوشت پێ ئەگەیشت .. هەر هـەموان لەبەردەم لافاوی ئیلحاددا دۆش دامابوون ..

وا بەرێز ( عبد الله یگن ) لە بیرەوەرییەکانیدا باسـی ئـەو رۆژانـە ئـەکات و ئەڵێت :

لە ساڵی خوێندنی ١٩٤٠ ـ ١٩٤١دا لە پۆلی دووهەمی ناوەندییدا بووم، و لە ئامادەیی قەسطەمونیی ئەمخوێند، دوای بیستنی هەواڵی مامۆستا لە هەندێ لەوانەی، کە سەردانیان ئەکردین ، کە یەکێکیان ئەو پیاوە بوو خانووی بە کرێ بە مامۆستا دابوو ، زۆر حەزم ئەکرد بە خزمەتی مامۆستا بگەم و سەردانی بکەم، پوختەی ئەوەی کە لە بارەیەوە بیستبووم ئەوەبوو، کە زانایەکی گەورەیە و، دیاریی و پێشکەشیی وەرناگرێت و ، رێگە بە هەموو کەسیش نادات سەردانی بکات

رۆژێکیان لە کاتی پشووی نێوان دەرسی قوتابخانـەدا باسـەکەم لای رەفعـەتی هاوەڵم درکاندو وتم : لە شارەکەمان‌دا زانایەکی گەورە هەیە، ئەویش وتی: من ئەیناسم ، ماڵەکەی لە بەردەم ماڵی ئێمەدایە و ، کەسێکی یـەکجار ناوازەیـە.. پێکەوە ئەچین بۆ لای ، چونکە من جار بە جار سەردانی ئەکەم .

---

[٢٢٣] سيرة ذاتية : ٣٠٢ ، رجل القدر : ١٨٧ ـ ١٨٨

زۆری پێ نەچوو ، لە کاتێکی گونجاودا سەردانمان کرد .. تەقەمان لە دەرگا دا و، سەرکەوتین بۆ نهۆمی سەرەوە و ، چووینە ژووری دەستە راست و ، یەکەم جار رەفعەت دەستی ماچ کرد و پاشان منیش و دانیشتین .. لەسەر شوێنێکی بەرز، کە لە قەرەوێڵە ئەچوو دانیشتبوو و ، هەتا ئەژنۆی بە لێفە داپۆشیبوو و ، بۆ دواوە پاڵی دابوویەوە و ، کتێبێکی بە دەستەوە گرتبوو و ، قژیشی هەتا نەرمی گوێچکەی بەردابوویەوە

لە کاتێکدا، کە بەسەر چاویلکەکانیەوە سەیری ئەکردین پێمانی وت : یا خوا بەخێر بێن ! پاشان دەربارەی من پرسیاری لە هاوەڵەکەم کرد، ئەویش وتی: هاوەڵی قوتابخانەمە، پرسیاری ناومی لێ کردم و ، لە گەڵمانا زۆر بە مەرحەمەت بوو و ، دەستی کرد بە باسی ئیسلام و ، جوانیی ئیمان و ، باسی مردن و قیامەتیشی کرد ماوەیەك لە خزمەتیا ماینەوە ، پاشان بەجێمان هێشت .

پاشان رۆژێکی تریش سەردانیم کرد خاوەنی تەوازوعێکی زۆر و ، دڵێکی گەورە بوو، کاریگەریی خراپی ئەو فیکر و بیرانەی، کە دژی دین بوون و ، هەندێ مامۆستا لە قوتابخانەدا برەویان پێ ئەدان ، مەگەر بچوومایەتە خزمەتی مامۆستا ئەوسا لە دڵ و دەروونم دوور ئەکەوتەوە، ئیتر، کە لە سەردانی ئەگەرامەوە دڵم لە ئارامیی و هیوا پڕ ئەبوویەوە ..

لە یەکێك لە سەردانەکانیشمدا پێم وت :

مامۆستاکانمان هەرگیز باسی خوامان بۆ ناکەن ، تکاتان لێ ئەکەم بەدیهێنەرمانمان پێ بناسێنن .

ئەوەبوو دەربارەی ئەو بابەتـە دەسـتی بـە شـییکردنەوەیەکی تێـر و تەسـەل کرد [٢٢٤]

مامۆستا بۆ ماوەی هەشت ساڵ لـە قـەسطەمـوونیی مایـەوە و ، بـەردەوام خەریکی نامە نووسین بوو، و هەموو رێگایەکی بەکار ئەهێنا هەتا دەنگی بگاتە لایان و پەیامی نووریان بۆ بنێرێت .. شایانی باسە، کە موسڵمانی وەها هـەبووە بە تەنها هەزار نوسخەی لە پەیامەکان نووسیوەتەوە، هی واش هەبووە بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە ماڵ دەرنەچووە و ، بەردەوام خەریکی نووسینەوەی پەیامەکان بووە، تا ئەوەبوو(٦٠٠,٠٠٠) شەش صـەد هـەزار نوسـخەیان لێ نووسـرایەوە و ، بـە نهێنیی بەسەر گوند و شارۆچکەکاندا دابەشیان ئەکردن ، بەمە کۆمەڵێك پیاوی بەغیرەت کەوتنە کارکردن تا لـە سەرانسـەری تورکیـادا پەیامـەکان بـە خـەڵك بگەیەنرێن و ولاّتیان پێ رووناك بکرێتەوە

ژمارەی ئەو نامانەی ،کە مامۆستا لە قەسطەموونییەوە ناردنی بۆ قوتابییەکانی لە ئیسپارتە و شارەکانی تر گەیشتە ( ٢٧٥ ) نامە ، کە هەیان بوو گشتیی بوو هەشیان بوو، تایبەتیی بوو . ( ب : ٢ / ٨٤٤ ) .[٢٢٥]

لە یەکێك لەو نامانەدا مامۆستا گرنگیی خزمەتی پەیامەکانی نوور ئەخاتـە پێش چاوی موسڵمانان .. دەری ئەبرێت، کە گرنگ‌ترین فەرمانبـەریی بـۆ ئـەو کەسانەی، کە پابەنـدی پەیامـەکانی نـوورن بریتییـە لـە نووسـینەوەیان و بـلاّو کردنەوەیان، جا هەر کەس لەو خزمەتـەدا بەشـدار بێـت ئـەوە ئەبێتـە قوتـابیی پەیامەکان و ، لە کردەوەی چاکی مامۆستاش بەشدار ئەبێت و ، لە خێری نـزا و

[٢٢٤] رجل القدر : ١٨٨ ـ ١٨٩
[٢٢٥] سيرة ذاتية : ٣٠٦

پارانەوەکانی مامۆستای دەست گیر ئەبێت ، کە لە بیست و چوار سەعاتدا(١٠٠) صەد جار زیاتر پێیان ئەپارێتەوە ، ئیتر با بەشداریی کردنی لە کردەوەی چاکی خوشك و برایانیدا لەولاوە بوەستێ .

سەرەرای ئەوەش ئەو قوتابییەی، کە خەریکی نووسینەوە و بلاوکردنەوەی پەیامەکان بێت ، بە چوار روو چوار جۆرە عیبادەتی وەرگیراوی بۆ ئەنووسرێت :

ئیمانی بەهێز ئەبێت .. هەولّ ئەدا ئیمانی کەسانی تریش لە تیاچوون سەرفراز بکات .. بیرکردنەوەی ئیمانیی دەست گیر ئەبێت ، کە هەندێك جار وەك عیبادەتی سالێکە و ، کەسانی تریشی بۆ هان ئەدات و .. لە کردەوەی چاکی مامۆستا نوورسییدا بەشدار ئەبێت ، چونکە ئەو خۆی خەتی خۆش نیە و ئەو نەهامەتییانەی، کە یەخەی مامۆستا ئەگرن ، یەخەی ئەمیش ئەگرن .[٢٢٦]

مامۆستا نوورسیی لە قەسطەموونیی سەرگەرمی دانانی پەیامەکانی نوور و ، وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانە بوو، کە لە قوتابیەکانیەوە ، یان لە کەسانی ترەوە ئاراستەی ئەکران ، هەموو جارێکیش بۆ گەران خۆی ئەگەیاندە باخە نزیکەکان و، چەندین سەعاتی رۆژەکانی لەسەر چیا نزیکەکان بەسەر ئەبرد ، وەك چیای ( قەرەداغ ) و چیای ( حاجی بەیرام ) ، یان سەرئەکەوتە سەر قەلا مێژووییەکەی قەسطەموونیی و ، لەوێ چەندین سەعاتی بە خواپەرستیی و سەرنج دان ، یان بە هەلگیریی پەیامەکانی نوور بەسەر ئەبرد

بەرێز یوونس چاویش باسی رۆژێکی مامۆستا نوورسیی ئەکات، کە سەر ئەکەوێتە سەر قەلاکە و ، ئەلێت :

---

[٢٢٦] الملاحق ـ ملحق قسطموني : ١١٤

رۆژێکيان بەيانيی زوو ، وەك هەموو جارێك ( بديع الزمان ) سەرکەوتە سەر قەلاَکە و ، لەسەر قوللە بەرزەکە، کە بەسەر شاردا ئەروانێت ، دانيشت و ، دەستی بە کاری خۆی کرد و ، هەردوو قاچيشی شۆر کردبوونەوە

لەو کاتەدا لە شەقامی شارەکەدا و ، لە خوارووی قوللەکەوە پياوێکی سەرخۆش دەرکەوت، کە ئەو شەوەی بە عەرەق خواردنەوە بەسەر بردبوو و ، بەرەو شوێنی کاری خراپ ئەرۆيشت، کەچيی هەر، کە ئەو سەرخۆشە گەيشتە ئەو شوێنەی، کە مامۆستا بە سەريدا ئەی روانيی ، لە جێی خۆی وشك بوو و ، نە ئەی توانيی هەنگاو بۆ پێشەوە بنێت و ، نە بۆ دواوە

بەلاَم ( بديع الزمان ) بەوپەری شەفەقەت و سۆزەوە سەيری کرد و ، سەلامی لێکرد ، پاشان پێی وت :

ـ براکەم ! بگەرێرەوە .. بگەرێرەوە ! نەچيت بۆ ئەوێ .. بگەرێرەوە بۆ ماڵەوە و، خۆت بشۆ و بگەرێرەوە بۆ لای خوا و ، دەست بە نوێژ بکە .

بە سەرسامیی و سەرسورمانەوە سەرخۆشەکە سەيری مامۆستای کرد و، نەی ئەزانيی چيی بکات، پاشان دەستی دايە گريان و ، بەدوای خۆيدا گەرايەوە و، بە خور فرمێسکيشی هەڵ ئەرێژا و ، رووی لە گەرماو نا و ، خۆی شۆرد و، تەوبەی کرد و ، گەرايەوە ماڵەوە لای ماڵ و منداڵی و ، لەو رەفتارە خراپانەی رزگاری بوو ..

بەرێز ( يوونس چاويش ) ئەوەش زياد ئەکات، کە ئەو پۆليسەی چاودێريی مامۆستای خرابووبە ئەستۆ، کە چاوی لە رووداوەکە ئەبێت ، تێ ناگات چيی

رووی داوە، بۆیە بە پەلە ئەچێت بە دوای سەرخۆشە گریاوەکەدا و کاکۆڵی ئەگرێت و ، پێی ئەڵێت :

ـ پێم بڵێ ! پێم بڵێ ! ئەو کوردە چیی پێ وتیت ؟! [٢٢٧]

لەو ساڵانەدا، کە مامۆستا لە قەسطەموونیی بوو ، ( مەدحەت ئالتی ئـۆق ) یش لەوێ والیی بوو، لێ پرسراوێکی دڵ رەق بوو و ، رقی زۆریشی لە مامۆستا بوو ، بۆیە بۆ هەلێك ئەگەرا شەری پێ بفرۆشێ و ئازاری بدات، جا مامۆستاش جل و بەرگی جارانی سەردەمی دەوڵەتی عوثمانیی لەبەردا بوو، و بە پێی یاسای نوێی وڵات ئەو جل و بەرگە لە ساڵی ١٩٢٥ ەوە یاساغ کرا بوو، بەو پێیە جل و بەرگی عوثمانیی بۆ پیاوان و بەرگی حەیای ئافرەتان قەدەغە کرابوون و، رووتیی بۆ ئافرەتان و بەرگی ئەوروپا و لەسەرکردنی شەپقە بۆ پیاوان سەپێنرابوو .. بۆیە رۆژێکیان والیی فەرمانی دا مامۆستا دەستگیر بکرێت و ، ببرێت بۆ لای.

ئەم دەنگ و باسە بڵاوەی کرد و ، خەڵك چاوەروانی ئـەکرد داخـۆ چـیی روو بدات، بە تایبەت فەرمانبەرانی دەوڵەت، کە پێش هەموو کەس لە فەرمانەکەی والیی ئاگادار بوون ، ئەوانیش چاوەروان بوون بزانن هەڵوێستی شێری نـاو بێشـە چۆنە و ، لەگەڵ والییدا چیی ئەکات ؟!

یەکێك لە فەرمانبەرەکانی ئەو شارە ، کە نـاوی "نیـازیی قـاراتکیی" بـوو باسەکە ئەگێرێتەوە و ئەڵێت :

مامۆستا نوورسیی هێنرا و برایە ژوورەوە لای والیی .. لەو کاتەدا دەرگاکە بە تەواویی دانەخرا بوو ، بۆیە دەنگی مامۆستامان بیست، کە بە تووڕەییەوە ئـەی وت :

---

[٢٢٧] رجل القدر : ١٩١ ـ ١٩٢

ـ مەدحەت ! گوێ بگرە ! ئەو مردنەی، کە ئێوە لێی ئەترسن تەنها پەردەیەکی تەنك لە نێوان ئێمە و ئەودا هەیە و ، هەرکە ئەو پەردەیەمان دریی ئیتر ئێمە لە هیچ شتێك ناترسین، جا ئەگەر لادانێکمان هەیە ئەوا یاسامان بەسەردا جێ بەجێ بکە و هەرچییشت لە دەست دێ درێغیی مەکە

دەم و چاوی والیی زەرد هەڵ گەرا و ، بە پەنجەی لەرزۆکەوە دەستی بۆ زەنگی سەرمێزەکە درێژ کرد و ، چەند پۆلیسێکی بانگ کرد و ، فەرمانی بەسەردا دان ماموستا بەرنەوە بۆ ماڵەوە .[٢٢٨]

لە قەسطەموونیی هەندێ لە قوتابییەکانی ماموستا سەریان لێ ئەدا و هەندێ کاری پێویستیان بۆ ئەنجام ئەدا ، کە یەکێك لەوانە بەرێز ئەمین چایەر بوو، کە لە وەرزی زستاندا بەیانیی زوو ئەچوو زۆپاکەی بۆ دائەگیرساند، وا هەندێ لە بیرەوەرییەکانی ئەو کاتەمان بۆ ئەگێڕێتەوە :

سەر لە بەیانیی زوو ئەچووم بۆ لای و زۆرپاکەیم بۆ دائەگیرساند .. رۆژێکیان وەك رۆژانی تر چووم بۆ لای .. رۆژێکی یەکجار سارد بوو و بێ ئەوەی بە خۆم بزانم نزیکەی دوو سەعات پێش بانگی بەیانیی چووم بۆ لای .. ئەبینم ماموستا لەسەر بەرماڵەکەی دانیشتووە و ، خەریکی خواپەرستییە . لەبەر شۆڵەی کزی مۆمدا و، لە سەرمایەکی یەکجار سەختدا ، بە دەنگێکی خەماوییەوە و ، بە گەرم و گوڕییەوە خەریکی تکا و پارانەوە بوو .. منیش وەستام و بۆ ماوەی سەعات و نیوێك سەیری ئەو دیمەنە پیرۆزەم ئەکرد و ، لەبەر سام و هەیبەتیش هەڵ ئەلەرزیم و، هەموو گیانم مووچورکەی پیادا ئەهات، لە دواجاردا لە دوورەوە دەنگی

[٢٢٨] رجل القدر : ١٩٢ ـ ١٩٣

بانگمان بەرگوێ کەوت، بەڵام بانگەکە بانگی ئەو سەردەمە بوو، ( واتە بانگی شەرعیی نەبوو ، بەڵکو تەرجەمە تورکییەکەی بوو ) .

ئاوڕی دایەوە بۆ لام و وتی :

ـ ئەمین ! .. هەڵەیەکی گەورەت ئەنجام دا .. من سوێند ئەخۆم چەند کاتێکم هەن، کە بە هیچ شێوەیەك ڕێ بە کەس نادەم بێتە ژوورەوە لام . هەڵەیەکی گەورەت کرد جارێکی تر ئەوە دووبارە نەکەیتەوە و ، زوو و ، پێش بانگ نەیەیت .

پێم وت : داوای لێ بووردنت لێ ئەکەم ، گەورەم ! هیوادارم چاوپۆشییم لێ بکەیت . کاتم لێ تێك چوو ، بە ڕاستیی ڕووناکیی مانگەشەوەکە خەڵەتاندمی .. لەمڕۆ بە دواوە پێش بانگ نایەم بۆ لات .[٢٢٩]

لەم کاتەدا مامۆستا زۆر دڵی بە قوتابیەکانی خۆش ئەبێت ، چونکە ئەگاتە ئەو قەناعەتە، کە ئەتوانن جێی مامۆستاکەیان بگرنەوە و ، ئەگەر دنیا بەجێ بهێڵێ هیچ داخێکی بە دڵدا ناچێت ، بگرە مەرگ بە دۆستێك سەیر ئەکات ، چونکە هەتا قوتابییەکانی لە ژیاندا بن و ، بەردەوامیی بە خزمەتەکەی بدەن ، خۆی بە زیندوو ئەزانێت ، بۆیە بەبێ ترس و دڵەراوکە و شڵەژان چاوەڕوانی ئەجەلی خۆیەتی .

پاشان داوا ئەکات، کە بۆ هەتا هەتایی خوا لێیان ڕازیی بێت .

هەروەها مامۆستا دەری ئەبڕێت، کە قوتابیانی پەیامەکانی نوور لەو ناوچانەدا گەیشتوونەتە قەناعەتی تەواو و ، ئەشتوانن سوێند بخۆن، کە هەر کاتێك سەرگەرمی خزمەتی نوور بن ژیان و گوزەرانیان بەرەکەتی تێ ئەکەوێت و، ژيانيان

---

[٢٢٩] رجل القدر : ١٩٣

ئاسان ئەبێت و ، دڵ و دەروونیان گوشاد ئەبێت و ، لە شادمانییدا نوقم ئـەبن.. هەروەها مامۆستا خۆیشی هەستی بەو لەزەتە ئیمانییە کردووە ، بە رادەیەك، کە نەفسی ئەمارە و شەیتانەکەشی لەبەردەم هێزی ئیمان‌دا سەرسام ئەبن !![٢٣٠]

مامۆستا بە نامە پەیوەندیی بە براکانیەوە ئـەکرد و ئامۆژگـاریی پێویسـتی پێشکەش ئەکردن هەتا بە جوان‌ترین شێوە خزمەتی پەیامەکان بکەن، لە یەکێك لەو نامانەدا، کە بۆ موحەممەد فەیضـیی[٢٣١] نـاردووە ، ئاگـاداری ئـەکات، کـە پێویستیی بە تەقوا و ئیخلاص هەیە هەتا ببێتە هاوتای پاڵەوانەکانی ئیسپارتە و، بتوانێ خزمەتی قورئان بکات .. ئەوەتا ئەڵێت :

(( فەیضیی برام !

ئەگەر پێت خۆشە لە پاڵەوانەکانی پارێزگای ئیسپارتە بچی ، ئـەوا لەسـەرت پێویستە بە تەواوەتیی وەك ئەوان وابی ..

لە بەندیخانەدا شێخێکی مەزن و رابەرێکی لەسـەر خـۆ و خـاوەن جازیبیـەتی ئەولیایانی تەریقەتی نەقشبەندییمان ـ رەحمەتی خوای لێبێ ـ لەگەڵدا بوو .. ئەم شێخە بۆ ماوەی چوار مانگ لەگەڵ نزیکەی (٦٠)شەصت قوتابیی نووردا دانیشت و تێکەڵیی کردن و گەلێ قسە و وت و وێژی دڵرفێنی لەگەڵ کردن بە نیازی ئەوەی بۆ سەر تەریقەتیان رابکێشێ، کەچیی جگە لە یەکێکیان ـ ئەویش بە شێوەیەکی کاتیی ـ نەی توانیی کەسیان رابکێشێتە لای خۆی .. بەڵام ئـەوانی تریـان هـیچ

---

[٢٣٠] ملحق قسطموني : ١١٣

[٢٣١] موحەممەد فەیضیی لە ساڵی ١٩١٢ دا لە قەسطەموونیی لە دایك بووە .. بـۆ مـاوەی شـەش سـاڵ لـە قەسطەموونیی لە خزمەتی مامۆستادا بوو و ، ساڵی ١٩٤٣ لە دەنیزلیی و ، ساڵی ١٩٤٨ یش لە ئافیوون لەگەڵ مامۆستادا بەند کراوە .. پیاوێکی خاوەن تەقوا و شارەزا لە دین بووە، لە ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کـردووە ، رەحمەتی بەلێشاوی خوای بەسەردا برژێ .. ( سیرة ذاتیة : ٣٠٨ ) .

پێویستییەکیان پێی نەبوو، هەرچەندە وەلییەکی پیاو چاك بوو ، چونکە ئەو خزمەتە ئیمانییە، کە پەیامەکانی نوور پێشکەشی ئەوانیان ئەکرد سەر و زیادیان بوو، و دڵیان پێی ئەکرایەوە، ئەوەبوو ئەو پاڵەوانانە بە دڵی هۆشیاریان تێ گەیشتن و بە بەصیرەتی نوورانییان ئەم راستییەیان بینیی کە :

خزمەتی پەیامەکانی نوور بریتییە: لە رزگارکردنی ئیمان ، بەڵام تەریقەت و مەشیەخەت پلە و پایەی ویلایەت دەست مرۆڤ ئەخەن .. رزگارکردنی ئیمانی تاقە کەسێکیش لە چنگی گومرایی گەلێ گرنگتر و پاداشتەکەشی یەکجار زۆرترە لە بەرزکردنەوەی دە ئیماندار بۆ پلەی ویلایەت، چونکە ئیمان بەوەی، کە بەختەوەریی هەمیشەیی پێشکەش بە مرۆڤ ئەکات ئەوا مولکێکی لە هەموو زەویی فراوانتری بۆ مسۆگەر ئەکات، بەڵام ویلایەت بەهەشتی ئیمان دار فراوانتر و گەشاوەتر ئەکات ، جا هەروەك بەرزکردنەوەی پلەی مرۆڤێکی ئاسایی بۆ پلەی پادشایی گەورەترە لە بەرزکردنەوەی دە سەرباز بۆ پلەی فەرماندە ، هەروەها پاداشتی رزگارکردنی ئیمانی تاقە مرۆڤێکیش گەورەتر و زۆرترە لەوەی دە کەس بۆ پلەی ئەولیای پیاوچاك بەرز بکرێنەوە

ئا ئەم نهێنییە وردە بوو، کە دڵە وریاکانی براکانی ئیسپارتەت بینیبوویان ، ئەگەرچیی عەقڵی هەندێکیان پەی پێ نەبردبوو .. لەبەر ئەوە دۆستایەتیی کەسێکی لاوازی گوناهباری وەك منیان گەلێك پێ باشتر بوو، لە دۆستایەتیی چەندەها ئەولیای گەورە گەورە ، بگرە موجتەهیدانیش گەر دەست بکەون .

جا لەسەر بناغەی ئەم راستییە :

ئەگەر قوطبێك لە ئەولیاکان یان شێخێکی گەورەی وەك گەیلانیی هات بۆ ئەم شارە و پێتی وت : ( لە ماوەی (١٠)دە رۆژدا بە پلەی ویلایەتت ئەگەیەنم ) و

تۆیش شوێنی کەوتیت و وازت لە پەیامەکانی نوور هێنا ، ئەوا ناتوانیت دۆستایەتیی پاڵەوانەکانی ئیسپارتە بکەیت ! )) . [٢٣٢]

مامۆستا بە باسێکی ناوکرۆکی دڵی خۆی غیرەت ئەخاتە بەر قوتابیەکانی تا بە هیچ شێوەیەك دەست لە خزمەتی پەیامەکانی نوور هەڵ نەگرن و ، دڵیان سارد نەبێتەوە

دەری ئەبرێت، کە بە نزیکەی هەزار تاقیکاریی قەناعەتی تەواوی کردووە، کە هەر رۆژێك خزمەتی پەیامەکان بکات ، بە پێی پلەی ئەو خزمەتە هەست بە ئاسوودەیی و بارسووکیی و شادمانیی و بەرەکەت ئەکات لە دڵ و لاشە و مێشك و ژیان و گوزەرانیدا، هەروەها زۆرێك لە براکانیشی لە شوێن و جێگای جۆر بە جۆردا ئەو هەستەیان کردووە و ، مامۆستاش بیروباوەری وەها بووە، کە ژیان و گوزەرانی بەو بۆنەوە بووە و ، ئەش گێرێتەوە، کە لە ئیمام شافیعییەوە خوا لێی رازیی بێت گێرراوەتەوە، کە فەرموویە: من زامنی رزقی ئەو قوتابییەم، کە بە خالیصیی دوای زانست کەوتووە ، چونکە بەرەکەت و فراوانیی لە رزقیاندا هەیە.

جا خۆ دیارە قوتابیانی پەیامەکانی نووریش ئەوەیان سەلماندووە، کە بە راستیی هەڵگری سیفەتی قوتابیی زانستن لەم سەردەمەدا، بۆیە لەسەر قوتابیان پێویستە دان بە خۆیاندا بگرن و ، واز لەو خزمەتە مەزنە نەهێنن ئەگەرچیی لەگەڵ گرانیی و برسێتیی رووبەروو بوونەتەوە .. بگرە لەسەریان پێویستە سوپاسێکی زۆری پەروەردگار بکەن وا بوونەتە هەڵگری ئەم خزمەتە مەزنە و ، قەناعەت بە کەم دەستیی و گوزەران تاڵیی بکەن تا لە خزمەتی پەیامەکان بێ بەش نەبن . [٢٣٣]

---

[٢٣٢] الملاحق ، ملحق قسطموني : ١٣٢

[٢٣٣] الملاحق ، ملحق قسطموني : ٢٠١

هەر لە قەسطەموونیی چەند جارێك لەلایەن كاربەدەستانی ئاسایشی حكومەتەوە هەوڵ درا ژەهر دەرخواردی مامۆستا بدرێت، ئەوەبوو ژەهریان ئەكردە ناو خۆراكەوە بۆی ، یان سیخورێكیان ئەناردە لای هەتا میوەی ژەهراویی پێ بدرێت .

جارێكیان مامۆستا ـ وەك جارانی تر ـ بە سواریی ئەسپێكی خوازراوی ناسراوێكی بەرەو چیا نزیكەكان رۆیشت ، هەتا بە برینی رێگای زۆر ماندوو نەبێت، لەوێ لەسەر شاخ پیاوێك لە مامۆستا نزیك ئەكەوێتەوە، كە زووتر مامۆستا ناسیی بووی ، بەڵام نەی زانیی بوو، بە كرێ گیراوی دەوڵەتە و ، هەندێ خۆراكی ژەهراویی دەرخوارد ئەدات ..

دوای ماوەیەك مامۆستا هەست بە ئازار ئەكات و ، ئەیەوێ بگەرێتەوە ، كەچیی بەسەر پشتی ئەسپەكەوە ئەكەوێتە خوارەوە و ، بە دەست ئازارەوە ئەتلێتەوە و ، ئەسپەكەش بە تەنیا ئەگەرێتەوە ناو شار .

كە یەكێك لە قوتابییەكانی دیی وا ئەسپەكە بەبێ مامۆستا گەراوەتەوە ، بە پەلە بەرەو شاخەكە كەوتە رێ و قوتابیەكە یارمەتیی مامۆستای دا و پێكەوە گەرانەوە دوا و ، لەسەر نوێنەكەی رای كشاند و ، چەند رۆژێك هەروا بە نەخۆشیی مایەوە ، تا لە ئەنجامدا خوا شیفای بۆ نارد [٢٣٤]

دەوڵەت بە هەموو شێوەیەك تەنگی بە مامۆستا هەڵ ئەچنی و ، بەردەوام كاربەدەستان هەڵمەتیان ئەبردە سەر ماڵی مامۆستا و قوتابیەكانی و دەستیان بە پشكنین ئەكرد

---

[٢٣٤] ذكريات عن سعيد النورسي : ٦٨ ـ ٦٩

بەرێز ئەمین ئەڵێت : پەیامەکانی نوور و نامەی ئاساییشمان لە گەنجینەی دار و تەختەدا و لە ژێر سووتەمەنییدا ئەشاردنەوە، ئەوەبوو جارێکیان توانییان دەست بەسەر هەموو ئەو نامانەدا بگرن، کە بۆ مامۆستا هاتبوون .. دایان بەسەر ماڵەکەدا و ، بە وردیی خەریکی پشکنینمان بوو، بە رادەیەك، کە پشتی سەعاتەکەیان لادا و سەیری ناوەوەیان کرد ، پاشان من و بەحریی برام و موحەممەد فەوزییان برد بۆ پۆلیسخانەکە و ، تەنگیان پێمان هەڵ چنی و ، پێمانیان ئەوت :

ـ ئێوە کۆمەڵەیەکی نهێنیتان پێك هێناوە، پێمان بڵێن : پەیوەندیی بە کێوە ئەکەن ؟ پاشان هەر یەکەمانیان خستە ژوورێکی سەربەخۆوە و بەندیان کردین .

موحەممەد فەوزیی بە بەڕێوەبەری پۆلیسخانەکەی وت :

ـ جەنابی بەڕێوەبەر ! مەبەستی پەیامەکانی نوور بریتییە لە روون کردنەوەی راستییەکانی قیامەت ، ئیتر ئێمە بایەخ بە کاروباری دنیا نادەین، ئەگەر پێیشت خۆش بێت چەند برگەیەکتان بۆ ئەخوێنمەوە

دەربارەی راستییەکانی ئیمان و راستییەکانی قورئان دەست بە خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور ئەکات، بەڕێوەبەریش ماوەیەك گوێی بۆ ئەگرێت ، پاشان بە توورەییەوە بێ دەنگی ئەکات و پێی ئەڵێت :

ـ بیروبۆچوونی منیش ژەهراویی ئەکەن ، بێ دەنگ بە

لە کاتی پشکنینی ماڵەکانماندا هەندێ پارە لە سندوقێکی ماڵەکەی مندا دۆزرایەوە بایەخێکی گەورەیان بە مەسەلەی ئەو پارەیە دا و ، لەسەری تەنگی زۆریان پێمان هەڵ چنی ، بە تایبەتیی ( عوني دۆغان ) ی والیی ، کە پرسیاری لێمان ئەکرد :

ـ ئەم پارەیەتان لە کوێ بوو ؟ بێ گومان ئەم پارەیە پارەی کۆمەڵە نهێنییەکەیە

پێم وت :

ـ کاتێك، کە لە شارەکەی خۆمەوە هاتم بۆ ئێرە ، ئەم پارەیەم هەبوو ، چونکە من لێپرسراوی بەخێوکردنی نزیکەی ( ١٥ ) کەسم، بێ گومان ئەوەندە کەسیش پێویستییان بە دوو هەزار لیرە ئەبێت، پاشان ئێوە ئەتوانن لە قائیم مەقامی شارەکەم ( ئاهەلت ) دەربارەی باری دارایییم پرسیار بکەن .

کە دییان هیچ بەڵگەیەکیان لە دژمان بە دەستەوە نیە و ، ئێمە هیچ تاوانێك یان گوناهێکمان ئەنجام نەداوە ، کەوتنە بایەخ دان بە مەسەلەی ئەو پارەیە، کە بریتیی بوو لە دوو هەزار لیرە [٢٣٥]

بۆ چۆنیەتیی بلاّوبوونەوەی پەیامەکان و زیادکردنی ژمارەی قوتابییانی نوور ، وا ئەم بیرەوەرییانەی بەرێز ( صلاح الدین ) چەلەبیی ، کە لەو ماوەیەدا مامۆستای ناسیوە و خەڵکی ئینەبۆڵیی بووە ، ئەخەینە بەرچاوی خوێنەری بەرێز، کە ئەنووسێت :

باوکم چوو بۆ قەسطەموونیی و ، کە گەڕایەوە پەیامی ( حسبنا الله ونعم الوكيل ) ی پێ بوو، کە تیشکی چوارەمە، ئەوەبوو نوسخەیەکی لەبەر نووسییەوە، ئەوسا دای بە من و ، دوای ئەوەی، کە ناونیشانی شوێنی مامۆستا و چۆنیەتیی دۆزینەوەی بۆ باس کردم ناردمی بۆ قەسطەموونیی .

کە گەیشتمە قەسطەموونیی ، گەڕام بە دوای بەرێز ئەمین چایەردا ، کە پیاوێکی عەشرەتی کورەسین بوو، لە خۆرهەلاّتی ولاّت و ، لە نزیك مزگەوتی ( نصر الله ) دا چایخانەیەکی ئەگێرا و ، هەروەها گەڕام بە دوای بەرێز ئەحمەد

---

[٢٣٥] رجل القدر : ١٩٤ ـ ١٩٥

قووزووی کوری حاجیی طـاهیریدا، کە لە ڕێـی ئەوانـەوە ئـەمتـوانیی مامۆسـتا بدۆزمەوە

لەگەڵ ( صلاح الدین ) ی کوری بەرێز ئەحمەد قووزوودا بەرەو ماڵی مامۆستا کەوتینە رێ، مامۆستا لە ماڵەوە نـەبوو ، بـەڵکو چـوو بـوو، بـۆ سـەر چـیای ( قەرەداغ ) ، ( صلاح الدین ) ئامادەیی دەربریی، کە بێت لەگەڵمدا بۆ ئەوێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی، کە منداڵێکی بچووك بوو، ئەوەم دایە دواوە و ، داوام لێ کرد ناونیشانی ڕێگاکەم بۆ هەڵ بدات، سەرکەوتمە سەر ئەو شاخەی، کە سەعاتێك لە شارەوە دوور بوو .. لەوێ لەسەر بەرزاییەکی شاخەکە و لە ژێر درەختێکی بەرزدا پیاوێك نوێژی ئەکرد و پۆشاکێکی یەکجار سپیی لە بەردا بوو، لە دڵـی خـۆمدا وتم : بێ گومان ئەمە خۆیەتی .. لێی نزیك کەوتمەوە و سەلامم لێکرد، بە سەری ئیشارەتی بۆ کردم، کە دانیشە، منیش دانیشتم .. بە دەنگێکی خەمبارەوە لـە خوا ئەپارایەوە و ، بۆ سەلامەتیی مرۆڤایەتیی و ، بـۆ ئاسـایش و بەختـەوەریی جیهانی ئیسلامیی لە دنیا و لە قیامەتدا دوعای ئـەکرد .. دوای تـەواوبوونی دوعاکەی وتم : ئامین، پاشان ئەو کتێبەی لەگەڵ خۆم هێنابووم دامە دەستی

پـێم وت : بـەخێر هاتیـت ، براکـەم ! هیـوادارم چـاوەڕوانیی بکـەیت هـەتا هەڵەگیریی ئەم پەیامە بکەم .

هەڵەگیرییەکە نزیکەی نیو سەعاتی خایاند بۆ یەکەم جار بـە وردیـی سـەرنجم دا .. بەوپەڕی بایەخ پێدانەوە خەریکی هەڵەگیریی پەیامەکە بوو .. هەڵـەگیریی هەر ناتەواوییەکی ئەکرد، کە لە پیت و وشەکان ، یان هەر ناتەواوییەك، کـە لـە خاڵەکاندا هەبێت ، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لام وەك بپرسـێت : مـا شـاء الله .. دەست خەتت چەندە خۆشە ! ئەگەر پەیامێکت بدەمێ ئایا لەبەری ئەنووسیتەوە ؟

کە پێم وت : من بە هەموو شادمانییەکەوە ئەو کارە ئەنجام ئەدەم ، نامیلکەی ( وتە بچووکەکان ) ی لە ( وتەی یەکەم ) ەوە هەتا ( وتـەی نۆهـەم ) دا پـێم . هەروەها ( وتەی یانزەهەم ) و ( وتەی دوانزەهەم ) ی نارد بـۆ بـاوکم بـۆ لەبـەر نووسینەوەی و ئەی وت :

ـ ئەگەر توانیی بینووسێتەوە با بینووسێتەوە پاشان بینێرێ بۆم بۆ هەڵەگیریی . گرنگ ئەوەیە نووسینەکە بە تەواویی وەك ئەسڵەکە بێت .

بەم شێوەیە پەیامەکانی نوور هاتنە ئینـەبۆڵیی .. ئـەوەبوو دوای ئـەو کاتـە صەدان پێنووس لەم شارۆچکەیەدا دەستیان دایە نووسینەوەی پەیامەکانی نوور.

لە نێوان نووسەرەوانی پەیامەکانی نـووردا بـەرێزان ، نافیـذ و ، ئیـبراهیم و، عیززەت و ، ضیاء و ، عوثمان و ، صالیح و ، عومەر و ، .. غەیری ئـەوانم لـە یادن .. پێنووسی ئەو بەرێزانە ، وەك چاپخانە ، بەبێ ماندوو بوون ، بە درێژایی پێنج ساڵ کاریـان کـرد هـەروەها پۆستەچـیی نـوور لـە نێـوان ئینـەبۆڵیی و قەسطەموونیی و ، لە نێوان ئینەبۆڵیی و شارەکانی تری ئەنادۆڵدا کەوتنە کار، کە ناودارەکانیان رەجەب دیلەك و ئەحمەد گور ئۆغلۆ و داگیرمانجیی ئۆغلۆ بوون ..

لە کاتێكدا کە چالاکیی بەم شێوەیە بەبێ پچران بەردەوام بوو ، لە یەکێك لە نووسینگەکانی ئەستەنبوڵدا چاوم بە ئامێرێکی رۆنیۆ کەوت .. ئەم ئامێرە توانای چاپ کردنی صەد لاپەرەی لە یـەك دەقیقـەدا هـەبوو، سـاتێك دوودڵ نـەبووم، ئەوەبوو کریم و ، هێنامەوە بۆ شارەکەم ئینەبۆڵیی، لەوێ دەستم بە چاپ کردنی چەند نوسخەیەك لە پەیامی ( آیة الکبری ) کرد ، کە بریتیـی بـوو لـە تیشـکی حەوتەم، کە نوسخەی یەکەمم نارد بۆ مامۆستا زۆر پێی شـادمان بـوو، و ئـەم دوعایەشی لە دوا لاپەرەیدا نووسیی :

( پەروەردگارم ! بەڕێز نەظیـف [٢٣٦] و هاوکارانی ـ ئەوانەی، کە بە یەك جـار ٥٠٠ نوسخەیان نووسییەوە ـ بە بەهەشتی فیردەوس بگەیەنە ) . [٢٣٧]

مامۆستا عەبـدوڵڵاّ یەگـەنیش لـە بیرەوەرییەکانیـدا باسـی بـارودۆخی ئـەو سەردەمە ئەکات و ئەڵێت :

لە بەهاری ١٩٤٣دا پشووی بەهار نزیـك بوویـەوە .. ڕۆیشـتین بـۆ سـەردانی مامۆستا .. چەند دەرسێکی ئیمانیی بەنرخی پێ وتین ، پاشان وتەیەکی ئاراستە کردین، کە هەرگیز لە بیرم ناچێت . وتی :

ـ براکانم ! ماوەیەکی زۆرم بەسەردا تێپەڕیوە بێ ئەوەی لە هیچ شوێنێكدا لە هەشت ساڵ زیاتر بمێنمەوە ، جا وا ئێستا هەشت ساڵ بەسەر هـاتنمدا بـۆ ئێـرە تێپەڕیوە ، لەبەر ئەوە یان ئەمساڵ من ئەمرم ، یان ئەگوێزرێمەوە بۆ شـوێنێکی تر .. لەبەر ئەوە لەوانەیە جارێکی تر بە یەك نەگەینەوە و ، ڕۆژێکیش دێت، کە قوتابیانی نوور بە هەموو لایەكدا بلاّوە ئەکەن ، جا ئێوە لە یەکتر جوێ نەبنەوە و، دەست بەرداری پەیامەکانی نووریش نەبن .

بەم وتەیەی مامۆستا هەستم بـە خەفـەتێکی قـووڵ کـرد، کـە خەمبارییـە زۆرەکەیـمی دیی پێمی وت :

ـ نەشلەژێیت و خەمباریش نەبیت ! .. إن شاء الله بە یەك ئەگەینەوە

دوای سێ مانگ پشوو تەواو بوو ، لەبەر ئەوە لە ( ئاراج ) ەوە [٢٣٨] گەرامەوە بۆ قوتابـخانە لە قەسطەموونیی، حەزم لە سەردانی بوو .. ئـەوەبوو زانـیم، کـە یەکێ لە قوتابییەکانی، کە بەڕێز ئەمین چایەر بوو ، ئاگادار کردووە و پێی وتووە :

---

[٢٣٦] مەبەست نەظیف چەلەبییە، کە باوکی خاوەنی ئەم بیرەوەرییانە کاك صلاح الدین چەلەبییە .

[٢٣٧] رجال القدر : ١٩٥ ـ ١٩٦

ـ کاربەدەستان چاودێرییم ئەکەن ، بۆیە وای بە چاك ئەبینم هیچ کەس سەردانم نەکات .

لەبەر ئەمە نەمان توانیی سەری لیّ بدەین .

رۆژێکیان ، لە کاتی پشووی نێوان دەرسەکاندا ، لە دواناوەندیی قەسطەموونیی زانییم مامۆستایان دەست گیر کردووە و سواری عەرەبانەیەکیان کردووە، کە ئەسپ رای ئەکێشا، سەبەتەیەك، کە لە پەلکی دارخورما چنرا بوو ، لەگەڵ کتلییەکی ئاو و ، کەل و پەلێکی سادەی چالێناندا لە تەنیشتیدا بوو .. عەرەبانەکە وەستا و ، ئەویش دابەزیی .. رەئیس عورەفایەکی پۆلیس لەگەڵ چەند پۆلیسێکدا لە تەنیشتیدا بوون خێرا خەڵکێکی زۆر لە دەوری جەم بوون .. کلاوێکی رەشی بەسەرەوە بوو، و جبەیەکی درێژی رەشیشی لەبەردا بوو .. لەو سەردەمەدا کارێکی موستەحیل بوو کەسێك بەو جل و بەرگەوە بگەرێت ، بە تایبەتیی لەگەڵ پۆلیسدا

کاتێك، کە قوتابییەکان بایەخ پێدان و سەرنج دانی منیان بۆ وێنەکەی مامۆستا دیی دەستیان کرد بە گاڵتەکردن لەگەڵمدا و وتیان :

ـ ئەمە موریدی ( بدیع الزمان ) ە

ئا لەو کاتەدا زەنگ لێی دا و ، چووینە پۆلەکانمانەوە [٢٣٩]

لە ساڵی ١٩٤٣دا دەوڵەت زیاتر تەنگی بە مامۆستا نوورسیی و قوتابییەکانی هەڵ چنیی .. ئەوەبوو لە ٣١ ی ئابی ١٩٤٣دا پۆلیس دایان بەسەر ماڵی مامۆستادا و کون و قوژبنیان پشکنیی و ، جگە لە چەند پەیامێکی نوور، کە

---

[٢٣٨] لەوە ئەچێت ناوی گوندەکەی بێت .

[٢٣٩] رجل القدر : ١٩٦ ـ ١٩٧

باسی ئیمان و رەوشتیان ئەکرد و ، جگە لە چەند نامەیەکی نێوان خۆی و قوتابیی و ناسراوانی هیچیان نەدۆزییەوە .

بۆ دووهەم جار لە ١٨ ی ئەیلوولی هەمان ساڵ دا ، کە لە (١٠)دە رۆژەی کۆتای رەمەزانی پیرۆزدا بوو ، دایانەوە بەسەریا و زۆر بە وردیی ماڵەکەیان پشکنیی، کەچیی وەك جاری پێشوو هەر تەنها پەیامی نووریان دۆزییەوە ..

بۆ جاری سێهەم دوای دوو رۆژ فەرمانی گرتنی مامۆستایان دەرکرد ، واتە لە ٢٠ ی ئەیلوول‌دا رەوانەی ئەنقەرە کرا

گرتنی ئەم جارەی مامۆستا لەسەر هەمان تاوانە پێشووەکان بوو، کە بریتیی بوون لە : پێك‌هێنانی کۆمەڵەیەکی نهێنیی و ، هەڵنانی جەماوەر دژی حکومەتی عەلمانیی و ، هەوڵدان بۆ رووخاندنی رژێمی حوکم و ، برینی سیفەتی دەججال بەسەر موصطەفا کەمال‌دا

وا بەرێز ( ضیاء دیلك ) یش بیرەوەریەکانی دەربارەی گواستنەوەی مامۆستا نوورسیی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

سواری پاس بووم تا بگەمە شوێنی فەرمانبەرییەکەم لە شاری ئیلگاز ئەوەبوو لە ئەلووك باش لەلایەن پۆلیس و ژاندرمەوە ئوتومبێلەکە وەستێنرا ، کە ئەوەبوو سێ کورسیی دواوەی تەرخان کردبوو بۆ مامۆستا نوورسیی .

کاتێك، کە ئوتومبێلەکە کەوتە رێ تەندروستیی مامۆستا تێك چوو ، کە ئەو کاتە پیرەمێردێك بوو لە تەمەنی حەفتا ساڵییدا، کاتێکیش، کە مامۆستا وتی: ( مادەم ئەوان بە تاوانبارێکی سیاسییم لە قەڵەم ئەدەن ، ئەوا لە سەریان پێویست بوو بۆ گواستنەوەم ئوتومبێلێکی تەکسییم بۆ تەرخان بکەن ) ، ئەو سەربازەی، کە لە تەنیشتم‌دا دانیشتبوو لە جێی خۆی هەستا و بە مامۆستای وت : ( مامۆستا گیان ! فەرموو ، لە جێگەکەی مندا دانیشە )، بەم شێوەیە سەربازەکە و

مامۆستا جێ گۆرکێیان کرد      من ئەترسام ، لەبەر ئەوە نەم ئەتوانیی بایەخ بە مامۆستا نوورسیی بدەم ، یان دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکەم .

کە مامۆستا لە تەنیشتمدا دانیشت پرسیاری ناومی لێ کردم و ، کە پێم وت ناوم ( ضیاء دیلك ) ە ، وتی : ضیائی دۆستمان تۆیت ؟ ئایا هاتووی لـە بریـی دانیشتوانی قەسطەمـوونیی خواحـافیزییم لێ بکـەیت ؟ پاشـان ئـاوری بـۆ لای ( صفوت ) ی سەرباز دایەوە ، کە پاسەوانی بوو، و لە دوایەوە دانیشتبوو و پێی وت : صەفوەت ! کاتێك، کە داتان بەسەر ماڵەکەمدا ، من چ ئایەتێکی قورئانی پیرۆزم ئەخوێند ؟ پاشان پارچە کاغەزێکی داوا کرد و ئەو ئایەتەی بۆ نووسییم ، پاشان کاغەزەکەی دایە دەست صەفوەت و ئەو ئایەتەی پیشان دا، کە ئایـەتی :

﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ۝٤٨ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ۝٤٩ ﴾ ( الطور : ٤٨ ـ ٤٩ )

پاشان ئاوری دایەوە بۆ لام و وتی :

ـ ضـیاء ! مژدە بە دۆستەکانت بدە و ، پێیان بڵێ : خەمیان نـەبێت ، بریـار دەرناچێت بۆ تاوانبارکردنمان ، یان هودنەیە ، یان رێك کەوتن .

ئەوەبوو لە رێی منەوە سەلام و هەندێ هەواڵی بۆ دۆستانی ئەنارد، کـە بەنـد کرابوون ، بە مەرجێك من هێشتا بەند نەکرابووم .

پاشان وتی :

ــ هیـوادارم داوا لـە کـاکی شـۆفێر بکـەن ـ ئەگـەر رازیـی ئـەبێت ـ بـا ئوتومبێلەکەی بوەستێنێ ، هەندێ ئامۆژگارییم پێیە بۆ ئەو برایانەی، کە لێرەدان، چونکە لە دیندا زۆرکاریی نیە

شۆفێر ئوتومبێلی وەستاند و ، مامۆستایش ئاوری بـۆ لای دانیشـتوانی نـاو ئوتومبێلەکە دایەوە و وتی :

ئەمشەو ئيحتمالی زۆرە شەوی قەدر بێت ، پاداشتی خوێندنی قورئان لە ڕۆژانی ئاساييدا دە چاكەيە بۆ هەر پيتێك و ، لە ڕۆژانی مانگی ڕەمەزاندا پاداشت ئەبێتە هەزار چاكە ، بەلأم لە شەوی قەدردا پاداشت(٣٠,٠٠٠) سيی هەزار چاكەيە، ئەگەر پێتان بلێم پێنج ليرەی زێرتان دەست ئەكەوێت ئەگەر فلأنە كار بكەن ، ئايا ئێوە حەز ئەكەن ئەو ليرانەتان دەست بكەون ؟

نەفەرەكان وەلأميان دايەوە : بەلێ ، حەزمان لێيەتی، پێی وتن :

ئێوە لە بەختكردنی هەموو توانا و هەموو هێزێكتاندا بۆ دەست خستنی پێنج ليرەی زێر لەم دنيا بەفەناچووەدا هيچ درێغييەك ناكەن ، دەی ئايا حەز ناكەن هەندێ توێشوو هەڵ بگرن بۆ ژيانی هەميشەيی و نەمرييتان .

كاتێك، كە نەفەرەكان وەلأميان دايەوە : بەلێ حەزمان لێيەتی ، پێی وتن :

كەواتە ، ئەگەر هەموو موسڵمانێك لێرە سێ جار سوورەتی ( الإخلاص ) و ، يەك جار سوورەتی ( الفاتحة ) و ( آية الكرسي ) بخوێنێ ئەوا هەندێ توێشووی بۆ ژيانی هەميشەيی پاشەكەوت كردووە

شۆفێرەكە و نەفەرەكان وتيان : خوا لێت رازيی بێت مامۆستا گيان .

دوای كەمێك كاتی بەربانگ هات و ئوتومبێلەكە لەبەردەم كانياوێكی سەوزەلأنەكانی ئيلگازدا، كە بە جوانيی و رازاوەيی بەناوبانگن ، وەستا بۆ خواردنی نانی ئێوارە ، لەوێ ئەو خواردنەی، كە شارەوانيی نادبووی بۆ مامۆستا لەگەڵ ئەو خواردنەی، كە پێم بوو، گۆڕيمانەوە .. بەربانگمان كردەوە و ، لەوێ ماينەوە هەتا نوێژی عيشا و پێكەوە نوێژمان كرد ، ئيتر لەوێ لە مامۆستا جيا بوومەوە و ، بەرەو كارەكەم ڕۆيشتم ، بەلأم دوای ماوەيەك منيشيان گرت و بردميان بۆ دەنيزليی، كاتێك، كە گەيشتمە دەنيزليی هێشتا مامۆستايان بۆ

نەهێنا بوو .. لەوێ لە بەندیخانەی دەنیزلیی بە گەرمیی لێیـان ئەپرسـیم : ئایـا ماماۆستات بینیی ؟

ئەو کاتە ئەو ئایەتەم هاتەوە یاد، کە مامۆستا لە ڕێگای ئیلگـازدا و لـەناو ئوتومبێلەکەدا بۆی خوێندمەوە تا بی نووسم، لـە گیرفـانمدا دەرم هێنـا و بـۆم خوێندنەوە، دوای ئەوە ئەوەی لە ڕێگـادا رووی دا بـۆم گێرانـەوە، دۆسـتان بـە بیستنی ئەمە مژدەیان وەرگرت و زۆرێك شادمان بوون و دەروونیان حەسایەوە

مامۆستا گەیشتە ئەنقەرە و ، لە ئوتێلێكدا دابەزیی و ، بریار وا بـوو، دوای چاوپێکەوتنی والیی ئەنقەرە لەسەر گەشتەکەی بەردەوام بێت .

( صلاح الدين ) چەلەبیی، کە یەکێکە لە قوتابیانی نوور و بەر ئەو بەندکردنەی ئەنقەرەش کەوتووە ، باسی ئەو کاتە ئەکات :

لەم کاتانەدا رەئیس عورەفا ناجیی هات و بە هەڵ چوونێکەوە ، وەك هەواڵێکی ناخلۆفیی گەورە بلاّو بکاتەوە ، وتی :

مامۆستا ( بديع الزمان ) يان لە قەسطەمونییەوە هێناوە و ، ئەمشەوی لـە ئـوتێلێکی ناوچـەی ( جـانقری قـاپی ) بەسـەر بـردووە و ، خزمـەت گـوزارانی ئوتێلەکەیان گۆریون بە پۆلیس ، هەروەها پۆلیسێکیان لە بەرگی شاگرددا خستۆتە خزمەتیەوە

دوای کەمێك بانگیان کـردم بـۆ ژووری بەرێوەبـەری لقـی یەکـەم .. چـوومە ژوورەوە مامۆستا دانیشتبوو .. چەمامەوە بەسەر دەستیدا و ماچـم کـرد دەستی گەرم بوو .. دەستیم لە دەستمدا هێشتەوە و زۆریش نـەخۆش و مانـدوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا رووی وتاری کردە بەرێوەبەر و وتی :

ئەمانە رۆڵەی ئیماندار و قوربانیی دەرن بۆ ئەم نیشتمانە، هەرگیز نـاگونجێ ئاسایش تێك بدەن، بە پێچەوانەوە ئەمان پارێزگاریی ئەمن و ئاسایش ئەکەن .

پاشان ئاوری دایەوە بۆ لام و وتی : نەترسیت .[٢٤٠]

مامۆستا لە گەڵ (١٢٦)سەد و بیست و شەش قوتابیی نووردا، کە لە شارە جۆر بە جۆرەکانەوە ، بە بیانووی دۆزینەوەی تیشکی پێنجەم، کە باسی دەجال و سوفیانیی ئەکات ، کۆ کرابوونەوە ، گەیەنرانە ئەنقەرە[٢٤١]

هەر، کە والیی ئەو کاتەی ئەنقەرە نەوزاد طان دۆغان هەواڵی گەیشتنی مامۆستا نوورسیی بیست ، ناردی بە دوایدا، دەنگ و باسێکی یەکجار زۆری لە بارەیەوە بیستبوو، ئەم پیاوە چۆن پیاوێکە وا لە ماڵ دەرناچێ و ، سیخور و هەواڵدەر وان بە دەوریدا ، کەچیی لەگەڵ ئەوەش‌دا کاری کردۆتە سەر هەموو تورکیا ؟! ئەم پیاوە چۆن توانیویەتی بەرامبەر بە دەوڵەت بووەستێ و جل و بەرگێك بپۆشێت، کە پێچەوانەی یاسای دەوڵەتە ؟ والیی هاتە سەر ئەو بریارە، کە ئەبێت سنوورێك بۆ ئەم باروودۆخە دابنرێت و ، نوورسیی ناچاری جل و بەرگ گۆرین بکرێت ..

مامۆستا نوورسیی لەگەڵ پاسەوان‌دا هێنرایە بارەگای والیی و ، برایە ژوورەوە

لەو کاتەدا بەرێز ( صلاح الدين ) چەلەبیی لەوێ ئامادە بوو، و ئاگاداری ئەو هەڵوێستە بوو ، ئەڵێت :

لە یەکێك لە دوا رۆژەکانی مانگی رەمەزانی پیرۆزدا، کە رۆژێکی گەرم بوو من بەرۆژوو بووم و ، لەبەردەم ژوورەکەی والیی بەرێز نەوزاد دا وەستابووم .. مامۆستا ( بديع الزمان ) ئامادە کرا و ، برایە ژوورەکەی والیی و ، دەرگا داخرا .. دەنگەکان ئەوەندە بەرز و توند بوون ، لە ژوورەکە ئەهاتنە دەرەوە ،

---

[٢٤٠] رجل القدر : ١٩٧ ـ ٢٠٠

[٢٤١] سيرة ذاتية : ٣٢٤

پاشان دەنگی زەنگێك بەرز بوویەوە و ، دەرگەوان چووە ژوورەوە ، پاشان هاتە دەرەوە، لەو کاتەدا ( بدیع الزمان ) بە توورەییەوە بە والیی ئەوت :

من لە جێی باوباپیرانتم .. من بە گۆشەگیریی ئەژیم .. لەبەر ئەوە یاسای ( بەرگ و بالاّ ) بەسەر گۆشەگیراندا جێ بەجێ ناکرێت .. من لە ماڵ دەرناچم ، بەڵکو ئێوە ناچاری دەرچوونم ئەکەن، دەی خوا بدا بە تەوقی سەرتدا [٢٤٢]

لەم کاتەدا .دەرگەوان گەرایەوە و شەبقەیەکی بێ نرخی بە دەستەوە بوو و چۆوە ژوورەکەی والیی [٢٤٣] دوای ئەوە چەند کاربەدەستێك لە قاتی سەرەوە هاتن و ، هەندێ نووسراویان دا بە دەست پۆلیسەکانەوە، دوای ئەوە ( بدیع الزمان ) هاتە دەرەوە و ئەی وت :

ـ مەترسە ئەی صلاح الدین .. مەترسە .. مەترسە .. بە خوات ئەسپێرم ..

پاشان هاتە دەرەوە و ، چەند پۆلیسێك دەوریان گرتبوو، بە پێی ریوایەتەکەی مامۆستا زوبەیر گۆندۆز ئاڵپیش مامۆستا ( بدیع الزمان ) بە نەوزاد طان دۆغان ئەڵێت :

ئەم مێزەرەیە لە سەرم داناماڵرێ بە لێکردنەوەی سەرم نەبێت .[٢٤٤]
کەی مرۆڤ بە شتی وەها تاوان بار ئەکرێت ؟
یان کەی ئەمە تاوانە ، مرۆڤ بیەوێ چ پۆشاکێك بپۆشێت ؟!

---

[٢٤٢] ئەم والییە دڵ ڕەقە بە مەرگی ئاسایی نەمرد ، بەڵکو لە ٩ی تەمووزی ١٩٤٦دا گوللەیەکی نا بە تەوقەسەری خۆیەوە و خۆی کوشت ، شایانی باسە، کە بە شێوەی گشتیی مامۆستا نوورسیی دوعای شەڕی لە دەوڵەت و کاربەدەستانی تورکیا نەکردووە ، ئەگەرچیی ماوەی(٣٥) سیی و پێنج ساڵ نەیان هێشت پشوویەك بدات .

[٢٤٣] وا دەر ئەکەوێت، کە والیی ئەیەوێت بەم شەبقەیە مامۆستا ناچاری جل و بەرگ گۆڕین بکات .

[٢٤٤] رجل القدر : ٢٠٠ ـ ٢٠١ . مامۆستا نوورسیی خۆیشی ئەگێڕێتەوە، بەڕێز نەوزاد ، والیی ئەنقەرە ویستی دەست کاری بەرگ و بالاّم بکات ، بەلاّم ئەوەبوو لەم هەوڵەیدا سەرنەکەوت و ، بەوەش، کە خۆی کوشتەوە بە دەستی خۆی سزای خۆی وەرگرت . ( ب ٢ / ٩٨٥ ، عن ملف دنیزلي مخطوط ) .

### بەشی دەهەم

# بەندیخانەی دەنیزلیی

## قوتابخانەی یووسفیی دووهەم

٢٠ / ئەیلوول / ١٩٤٣ ـ ١٥ / حوزەیران / ١٩٤٤

پۆلیسەکان لەلای والیی ئەنقەرە هاتنە دەرەوە و مامۆستا نوورسییشیان لەگەڵدا بوو و ، روویان بەرەو وێستگەی شەمەندەفەری ئەنقەرە نا ، تا مامۆستا بەرن بۆ ئیسپارتە و ، لەوێیشەوە رەوانەی شاری دەنیزلیی بکەن و ، بیشیگەیەننە بەندیخانەکەی .

مامۆستا بە تەنیا لەم بەندیخانەیەدا بەند نەکرابوو، بەڵکو کۆمەڵێك لە قوتابیانی نووریش دەستگیر کرابوون .. ئەمانە لە شاری ئیسپارتە و قەسطەموونیی بە تایبەت و لە شارەکانی تریشەوە کۆ کرابوونەوە، کە ژمارەیان ( ١٢٦ ) قوتابیی بوو .

بەندیخانەی دەنیزلیی بینایەکی شێدار بوو، لە دەرەوەی شار ، کە پەنجەرەکانی بچووك بوون و هۆڵەکانی هەوای پاکیان تیا دەست نەئەکەوت .. چەند ژوورێکیان لە هۆڵی تاوانە گەورەکان بۆ قوتابیانی نوور تەرخان کرابوو و ، تێیان خزێنرابوون .

ئەو بەندیخانەیە یەکجار نارەحەت و دڵ تەنگ بوو، بەڵام خوای گەورە دوو شتی رەخساندبوو تا دڵ تەنگیی و ئازاری قوتابیان برەوێنەوە :

**یەکەمیان** قوتابیان هەواڵیان زانیی،کە مامۆستا وا لێیانەوە نزیکە و پێکەوە بەند کراون .

**دووهەمیان** ئەم بەندکردنە بووە هۆ بۆ ئەوەی قوتابیان یەکتر بناسن و، دۆستایەتیی و برایەتییان بەهێز ببێت، ئیتر ئەوەبوو زۆری پێ نەچوو لەلایەن مامۆستاکەیانەوە سەلامیان بۆ هات :

ـ یاخوا بەخێر بێن .

بەم بەخێرهاتنە قوتابیان دڵ و دەروونیان فێنك بوونەوە

کاربەدەستانی بەندیخانە ، لە سەرووی هەموویانەوە شەوقیی بەڕێوەبەری بەندیخانە و ، یارمەتیدەری ( مدعي عام ) جەمیل سویلماز ، بەندییەکانیان ئاگادار کردبوون، کە بەندکراوێکی مەترسییداری بیروباوەڕ خوار و خێچ ئەهێنرێتە ئەم بەندیخانەیە ، وریا بن قسەی لەگەڵ نەکەن .. کەچیی زۆری پێ نەچوو کاربەدەستان تووشی سەرسورمان بوون .. سەرنجی دیاردەیەکی نامۆیان دا .. ئەو بەندییە تاوانبارانەی، کە پاسەوانەکانی بەندیخانە لێیان ئەترسان و لێیان نزیك نەئەکەوتنەوە تەوبەیان کرد و گەڕانەوە بۆ لای خوا و ، لەگەڵ قوتابیانی نووردا دەستیان بە نوێژ کرد، لە هەموویان بەناوبانگ‌تر پیاوێك بوو بە ناوی ( سلیمان خونکار ) کە گەنجێکی پێکەوتوو بوو، و هەموان لێی ئەترسان و ، لەسەر پیاو کوشتن (٢٤)بیست و چوار ساڵ حوکم درا بوو .. بۆ ئەم تەوبەکارانە قوتابییەکانی مامۆستا ئەڵقەی دەرس خوێندن و قورئان لەبەرکردنیان دانا .. هەتا ئەوانەش، کە پیاویان کوشتبوو دەستیان دایە قورئان لەبەرکردن و ، پێش‌نوێژییان بۆ نوێژکەران ئەکرد [٢٤٥]

---

[٢٤٥] رجل القدر : ٢٠٥ . نزیکەی (٢٠٠)دووصەد بەندیی تەوبەیان کرد ، ئەمەش لە ماوەی سێ مانگ یان زیاتردا هەتا پیاوێکیان سێ کەسی کوشتبوو ، کەچیی دوای گەڕانەوەی بۆ لای خوا نەی ئەوێرا بچوکترین گیان لەبەر بکوژێت، بەڵکو ئەندامێکی بەسۆزی لێ دەرچوو . فەرمانبەرە لێپرسراوەکان سەریان سووڕ ئەما .. ئەم جەردە و پیاوکوژانە چۆن گۆڕان ؟ هەتا گەنجێکی بەندیی بەر لەوەی بڕیاری دادگا وەربگرێت ، بە ئاشکرا وتبووی :

ئەو تاوانەی درابوویە پاڵ مامۆستا و قوتابیەکانی هەمان تاوانی جارانی پێشوو بوو، کە گوایە خەریکە کۆمەڵەیەکی نهێنیی دروست ئەکات و ، خەریکە میللەت لە دژی جومهووریی عەلمانیی هەڵ ئەنێت ، بەو نیازەوە کـە رژێـم برووخێنـێ و، سەرەرای ئەوەش، کە موصطەفا کەمالی بە دەججال و سوفیانیی ناو بردووە..

دەربارەی تۆمەت بارکردنی بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی نهێنیی ئەڵێت :

بەڵێ ، ئێمە کۆمەڵەین .. ئەو کۆمەڵەیەی، کە لە هەموو چەرخێکدا سێ صەد و پەنجا ملیۆن ئەندامی هەیە، جا ئەمانە جەخت لەسەر رێز و ئیحترامی تەواو و، پەیوەندیی و پەیوەستی راستگۆیانەیان بـە بنـەماکانی ئـەو کۆمەڵـە پـیرۆزەوە ئەکەنەوە ، ئەویش بە بەجێهێنانی نوێژ رۆژانە پێنج جار و ، لە درێژکردنی دەستی کۆمەکیی و یارمەتییدا بۆ یەکترییش پێش برکێ ئەکەن ، ئیترسا بـە پارانـەوەی کەسیی بێت لە پاش ملەدا ، یان بە دەست کەوتە رۆحییە فرەکانیان بێت ، ئەویش بە دەستووری فەرمایشتی خوای بالآدەست :

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴾ .

بەم شێوەیە ئێمە لەو کۆمەڵە پیرۆزە مەزنەدا ئەندامین .

بەلآم فەرمانبەرییمان لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵەیەدا بریتییە لە :

**یەکەم** : تەبلیغ کردنی ئەو حەقیقەتە ئیمانییانەی، کە لە قورئـانی پـیرۆزدا هەن بە خوازیارانی حەق و ئیمان بە راستترین و پاکترین شێوە ..

---

ئەگەر قوتابیانی نوور لە بەندیخانە بێننەوە ئێمەش حوکمی خۆمان ئەدەین و خۆمان تاوانبار ئەکەین تا لەگەڵیان بێنینەوە و ، قوتابێتییان بکەین و ، بە رێنماییەکانیان خۆمان چاك بکەین و ، وەك ئـەوانمان لێ بێـت، ( سیرة ذاتية : ٣٣٠ ) .

**دووهەم** : رزگارکردنی خۆمان لە تیاچوونی هەمیشەیی و ، لە بەندیخانەی تاکەکەسیی هەتاهەتایی ..

بەڵام ئەو کۆمەڵە دنیاییانەی، کە لەسەر فروفێڵ و گزیکاریی سیاسەت دامەزراون ، ئێمە دوور و نزیك پەیوەندییمان پێیانەوە نیە، هەروەها پەیوەندییشمان بەوەوە نیە، کە پێی تاوانبار کراوین، کە گوایە سەر بە کۆمەڵە نهێنییەکان بین. ئەمە درۆیەکی هەڵبەستراوە نە ئەصلی هەیە نە سەنەد و ، بە هیچ شێوەیەکیش پەیوەندیی بە راستییەوە نیە ، چونکە دەروونی بەرزی ئێمە خۆی لەوە بە بەرزتر ئەگرێت، کە سەر بەو جۆرە کۆمەڵانە بین و ، بە یەکجاریی لە هەموو شێوازێکی ئەو بەسەربوونە خۆی دوور ئەگرێت .[٢٤٦]

کە مامۆستایان کردە بەندیخانەوە بۆ ماوەی دوو رۆژ لەبەردەم ئاودەستەکانی بەندیخانەدا شوێنیان بۆ تەرخان کرد هەتا تیایا بمێنێتەوە، پاشان لە ژوورێکی بچکۆلەدا، کە بە نارەحەت جێی نوێنێکی تێدا ئەبوویەوە، بە تەنیا بەندیان کرد ژوورێکی بچووکی شێدار بوو، کە هەواکەی بۆنی کردبوو و ، بە پێی شاهێدیی یەکێ لە قوتابییەکانی لە ئەشکەوتێکی بچکۆلە ئەچوو ..

دیارە بەندیخانەکە لە دادگاوە دوور بووە و ، لە رۆژانی دادگاییکردندا دەستی مامۆستا بە ئاسن ئەبەسترا بە دەستی یەکێ لە قوتابییەکانیەوە و، ئەکەوتە پێشی کاروانێکەوە، کە لە حەفتا کەس پێك هاتبوو و ، کۆمەڵێك سەربازی چەك بە دەستیش دەوریان گرتبوون .

کاروانەکە لە بەندیخانەوە ، لە دەرەوەی شارەوە ، رێی ئەگرتە بەر و ، لە رێگا بەلای قەبرستانێکی کۆندا تێ ئەپەریی .. مامۆستا ئەوەستا و هەردوو دەستی ـ

---

[٢٤٦] رجل القدر : ٢٠٨ ، نقلاً عن رسائل النور لا تنطفيء : ٤٣ ـ ٤٤

کە کۆت کرابوون ـ بەرز ئەکردنەوە بۆ ئاسمان و ، بـۆ مردوانـی ئـەو قەبرسـتانە دوعای ئەکرد و ، بەندییەکانی تریش لە دوایەوە ئەوەستان و ، ئەوانیش دەستیان بەرز ئەکردەوە و ، دوعایان ئەکرد

کە کاروانەکە ئەگەیشتە شار و ، بە شەقامەکەدا بەرەو دادگا ئەکەوتـە ڕێ ، خەڵکی شارەکە ، بە ژن و پیاو و منداڵەوە لە هەردوو لای شەقامەکەدا ئەوەستان و، چاویان لە دیمەنی دڵ تەزێن ئەبوو .. هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو تا ئەو داماوانە ڕزگار بکەن .. ئەوەندەیان لێ ئەهات بە دەست سەلام لەو زانا بە ساڵا چـووە و، ئەو گەنجە خوێنگەرمانە بکەن، کە بەبێ تاوان بەرەو دادگا درابوونە بەر .[٢٤٧]

مامۆستا سەرەرای بەندکردنی خـۆی ، خەفـەتێکی زۆری بـۆ تـووش بـوون و بەندکردنی براکانی ئەخوارد ، لەولاشەوە کاری نوور بڵاوەی نەئەکرد و ، پیریی و نەخۆشییش سەریان لێ دابوو، ئەمانە هەر هەموو کاریـان کردبـووە سـەر دڵ و دەروونی و بێزاریان کردبوو، کەچیی چاودێریی پەروەردگار فریای کەوت و ، ئەو بەندیخانە ناهەموارەی بۆ گۆریی بە قوتابخانەیەکی نووریی .. لە هـەمان کـاتدا پەیامەکانی نـوور ، بـە هیممـەتی پاڵەوانـەکانی قوتابخانـەی زەهـرا ، کەوتنـە بڵاوبوونەوە و پەرەسەندن، چونکە ئەو بەرێزانە بە قەڵەمە کارامە ئەڵماسییەکانیان دەستیان دایە نووسینەوەی پەیامەکان، ئەوەبوو پاڵەوانی نوور لە ماوەیەکی کەم دا، کە لە چوار مانگ تێپەری نەئەکرد ، بیست نوسخەی لـە هـەردوو پـەیامی ( بەری درەختی ئیمـان ) و ( بـەرگریی ـ دفـاع ) نووسـییەوە ، هەرچـەندە لـە بارودۆخێکی سەختدا ئەژیان .. شایانی باسە، کە ئەم نوسخانە بوونە هۆی دەست خستنی فتووحات لە ناو بەندیخانە و ، دەرەوەیشیدا ، بە رادەیـەك، کـە هـەموو

---

[٢٤٧] رجل القدر : ٢٠٦

زەرەر و زیانەکان گۆران بۆ سوود و قازانج و ، ماتەمینیی و خەفەت باریی گۆران بـۆ شـادمانیی و ، ئایـەتی پیرۆزیـی : ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾ ( البقرة : ٢١٦ ) جارێکی تر یەکێ لە نهێنییەکانی نواند [٢٤٨]

لەو کاتەدا دەوڵەت لە هەندێ فەرمانبەری سادە لیژنەیەکی پێك هێنا کە گوایە ئەمانە شارەزان ، تا لە پەیامەکانی نوور بکۆڵنەوە و ، بزانن ئایـا لـە مەسـەلە سیاسییەکان ئەدوێن یان نەء ، ئەوەبوو چەند پەیامیان دەست کەوتبوو هەموویان خستە بەر دەستی لیژنەکە [٢٤٩]

ئەم لیژنەیە راپۆرتێکی رووکەشیان نووسیی، کە پری بـوو لـە هەڵـە و ، بـەو بۆنەوە بەیانێکی رەق و توند لە دژی مامۆستا و قوتابیەکانی بـلاّو کرایـەوە و ، وەزیری پەروەردەش هێرشێکی توندی کردە سـەریان ، بـە رادەیـەك کـە هەنـدێ داوایان لە دەوڵەت ئەکرد بەندکراوەکان بدرێن لە سێدارە

کە مامۆستا نوورسیی ئەو هەواڵەی بیست یەکجار پێی ناخۆش بوو و توورەش بوو ، چونکە ئەندامانی ئەو لیژنەیە نەفام بوون و ، ئەو توانایەیان نیـە تـا لـەو مەسئەلەیەدا حوکم بدەن ، بۆیە نارەزایی دەربریی، کە ئەوانە خاوەنی هیچ جۆرە پسپۆرییەك نین و ، ناتوانن لە پەیامەکانی نوور بکۆڵنەوە، بۆ ئەمە داوای کـرد لیژنەیەکی زانستییانەی بالاّ لە رۆشنبیرانی ئەنقەرە پێك بهێنرێت ، بگرە بـا لـە ئەورووپاوە فەیلەسووفان بانگ بکرێن ، تا هەرچیی مەسـەلەیەکی دژە یاسـا لـەو

---

[٢٤٨] سیرة ذاتیة : ٣٢٧ ـ ٣٢٨

[٢٤٩] رجل القدر : ٢٠٧

پەیامانەدا هەیە بخرێتە روو و ، ئەو کاتەش مامۆستا بە توندترین سزا رازیی ئەبێت .[٢٥٠]

ئەوەبوو دەوڵەت ئەم داوایەی وەرگرت و ، لە ئەنقەرەی پایتەخت لیژنەیەکی پێك هێنا ، کە زانا و مامۆستا و پسپۆری گەورە تیایا بەشدار بوون، ئەمانە دەستیان دایە لێکۆڵینەوەی پەیامەکان و سەرنج دانی ئەو نامانەش، کە مامۆستا ئەیناردن بۆ قوتابیەکانی، کە لێبوونەوە راپۆرتیان پێشکەش بە دەوڵەت کرد و، دەریان بریی، کە لە پەیامەکانی نووردا هیچ چالاکییەکی سیاسیی نیە و، مامۆستاش هەوڵی پێك هێنانی کۆمەڵەی نهێنیی یان تەریقەتی صۆفیگەریی نەداوە ، بەڵکو نووسراوەکانی هەر هەموو باسی ئیمان ئەکەن و ، تەفسیری قورئانی پیرۆزن .[٢٥١]

کە راپۆرتەکە درایە دەستەی دادگا و ، دادگاش گوێی بۆ بەرگرییەکەی مامۆستا گرت ، دادگا لەسەر بێ تاوانیی مامۆستا و قوتابیەکانی قەناعەتی کرد و، بە یەکدەنگیی لە ١٦ / ٦ / ١٩٤٤دا ، لە ژێر ژمارە ١٣٦ / ١٩٩ بریاری بێ تاوانییانی دەرکرد و ، دادگای تەمییزیش بە یەکدەنگیی تەصدیقی ئەو بریارەیان لە ٣٠ / ١٢ / ١٩٤٤دا کرد و ، پەیامەکانی نووریان گێرایەوە بۆ خاوەنەکانیان ..

---

[٢٥٠] نوورەدین گۆبجۆی مامۆستای فەلسەفە لە ئەستەنبوڵ ئەڵێت : دادگای جەزای گەورەی دەنیزلیی پەیامەکانی مامۆستا نوورسیی دایە دەست لیژنەیەکی شارەزایان، کە لە دوو مامۆستای دواناوەندیی پێك هاتبوو . یەکێکیان مامۆستای ئەدەبی تورکیی و ، ئەوی تریشیان مامۆستای مێژوو بوون و ، هەردووکیشیان مولحید بوون و، هیچ دینێکیان نەبوو .. ( سيرة ذاتية : ٣٢٨ ) .

[٢٥١] رجل القدر : ٢٠٧ ، سيرة ذاتية : ٣٢٨

مامۆستا نوورسیی لەگەڵ هەندێك لە قوتابییەكانیدا لە بەندیخانەی دەنیزلیی نۆ مانگ بەند كران، كە لەوێش هەوڵ درا ژەهری دەرخوارد بدەن ، بەلاّم خوای بالآدەست گەیشتە فریای و لەو پیلانەش دەربازی كرد [٢٥٢]

لەو بەندیخانەیەدا مامۆستا پەیامی ( میوە ـ بەری درەختی ئیمان ) ی نووسیی ، ئەمەش لە ماوەی دوو حەفتەدا .. ئەم پەیامە ئامانج و بناغە و مەبەستەكانی پەیامەكانی نوور بە كورتیی ئەخاتە روو و ، بریتییشە لە پەیامی بەرگریكردن لە پەیامەكانی نوور .

مامۆستا ئەوەندە دڵی بە نووسینی ئەم پەیامە كراوەتەوە ، هاتۆتە سەر ئەو قەناعەتە، كە ئەگەر تەنگ و چەڵەمە و نارەحەتییەكانی بەندیخانە ببنە صەد ئەوەندەش ، ئەوا ئەم پەیامە چەند قاتی ئەوە فەرمانبەریی ئەنجام داوە ، چونكە پەیامێكی یەكجار بەكارە بۆ پێشكەش كردنی ئیمان هەتا بە مل پێچیكەران .[٢٥٣]

مامۆستا روو ئەكاتە ناحەزانی و پێیان ئەڵێت : هەی بەدبەختان ! ئەی ئەوانەی دەستتان خستۆتە قورگمەوە ! چیی ئەكەن بی كەن و ، چیش بریار ئەدەن بریاری لەسەر بدەن ، بە راستیی كردەوەكەتان بیّ بایەخە و ، هەموو ئەو بەلاّ و موصیبەتانەش، كە ئەی هێنن بەسەرماندا ئاسان و هیچن ، بەڵكو هەموویان بۆ ئێمە چاودێریی و سۆزی پاڵفتەی خوایین ..

---

[٢٥٢] رجل القدر : ٢٠٧

[٢٥٣] مامۆستا جگە لە بەری درەختی ئیمان هەندێك پەیامی تری نووسیوە، كە ئەمانەن :

١ - تیشكی دوانزەهەم، كە بریتییە: لە كۆمەڵە بەرگرییەكی لە دادگای دەنیزلیدا

٢- تیشكی سیانزەهەم، كە بریتییە: لە نامەی دڵ دانەوە و بۆ قوتابیانی نووری ناردوون .

٣- نامەی ئامۆژگاریی، كە ناردوونی بۆ قوتابییەكانی و ، ژمارەشیان ( ١٢٠ ) نامەیە . ( ب ٢ / ١١١٤ ) .

پەیامی بەری درەختی ئیمان هەشت مەسەلەی پێشەوەی لە ساڵی ١٩٤٣ دا نووسرا ، بەلاّم مەسەلەی نۆهەم لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤دا نووسرا . ( ب ٢ / ١٠٢٣ ) .

بەم دەربرينە دڵخۆشيی تەواوی دەستگیر ئەبوو .. [٢٥٤]

بەڵێ مامۆستا و قوتابیەکانی چاوەروان بـوون لەلايـەن ليژنـەی شـارەزاکانی ئەنقەرەوە رەخنەيان لێ بگیرێت ، کەچـيی لـە راپۆرتەکـەياندا ئەوپـەری رێـز و پایەدارییان بۆ پەیامەکانی نوور دەربرِیی .. ئەوەبوو لە ناو پێنج سندوقدا کە، لە پەیامەکان پر بوون تەنها چەند هەڵەیـەکیان دۆزییـەوە کـە، لـە (١٠)دە هەڵـە تێپەریان نەئەکرد ، هەرچەندە مامۆستا لەبەردەم دادگادا سەلماندی، کـە ئەوانـە هەڵە نین، بەڵکو حەقیقەتن و ، ئەندامانی ليژنەکە خۆيان هەڵـەن و ، مامۆسـتا روونيشی کردەوە، کە ئەو راپۆرتەيان، کە لە پێـنج پـەرە کاغـەز پێـك هـاتبوو نزیکەی دە هەڵەی تێدایە، بەمە مامۆستا و قوتابیەکانی هەستیان بە چاودێریی خوایی ئەکرد و، بۆشیان دەرکەوت، کە ئەندامانی ليژنەکە حەزيان لە دۆسایەتییە و ، بە قەطعییش چەسپا، کە حەقیقەتەکانی پەیامەکانی نوور ، بە فەزڵی خوا ، بەسەریاندا زاڵ بوون، بە رشادەیەك، کە دەستیان بە خوێندنەوەیان کـرد و ، وەك مورشیدێکی رۆحیی سوودیان لێیان وەرگرت و ، ئەو دائیرە فراوانانـە وەك چـەند قوتابخانەیەکی نوورییان لێ هات و ، زۆرێك لە سەرگەردان و سەرلێ شـێواوانیان رزگار کرد و، ئیمانیان بەهێز کردن ، بەمەش مامۆستا و قوتابیانی چەند قـاتی ئەو تەنگانە و نارەحەتییە شادمان بوون . [٢٥٥]

---

[٢٥٤] الملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢٣٨

[٢٥٥] سيرة ذاتية : اللمعات : ٤٠٥

لە بەندیخانەدا "حافیظ عەلیی "پاڵەوانی نوور نەخۆش کەوت .. ئەم مامۆستا بەرێزە لاشەی لاواز بوو و بەرگەی بەندییخانەی شێداری نەگرت و نەخۆش کەوت و هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد .[٢٥٦]

مامۆستا نامەیەکی بۆ "حافیظ عەلیی" نووسیی و ، تیایدا ئامۆژگاریی کرد، کە بایەخ بە نەخۆشییەکەی نەدات و ، دوعاشی بۆ کرد، کە خوای گەورە شیفای بۆ بنێرێت .. ئەوەشی پێگەیاند، کە سەعاتێك خواپەرستیی ناو بەندیخانە ئەوەندەی دوانزە سەعات خێری هەیە و ، ئەم نەخۆش‌کەوتنەشی بریتییە: لە هەڵ گرتنی هەندێ لە ئازار و نەخۆشیی مامۆستاکەی .

لە لایەکی ترەوە مامۆستا نوورسیی دەری ئەبرێت، کە دوژمنە شارراوەکانی ژەهر ئەکەنە ناو خواردنەوە بۆی و ، حافیظ عەلییش لەو خواردنە ئەخوات و ، بەو بۆنەوە ئەیبەن بۆ خەستەخانە و ، پاشان کۆچ بۆ جیهانی بەرزەخ ئەکات و، مامۆستا و قوتابییەکانیشی شیوەنێکی گەرم و گوری بۆ ئەکەن .

بەر لەوەی مامۆستا و قوتابییەکانی بخرێنە بەندیخانەوە ، لەسەر قەڵاکەی قەسطەموونیی ، چەندین جار هاوار ئەکات: براکانم ! گۆشت مەخەنە بەردەم ئەسپ و ، گیاش مەخەنە بەردەم شێر .. لەو کاتەدا حافیظ عەلیی لە شوێنێکدا بوو، کە حەوت رۆژ رێگا دوور بوو و ، بە شێوەیەکی مەعنەویی ئەو ئامۆژگارییەی مامۆستا ئەبیستێت و ، هەر ئەو کاتە نامە بۆ مامۆستا ئەنێرێت و ئەڵێت : بەڵێ ، مامۆستا گیان ! یەکێك لە کەرامات و ، تایبەت‌مەندییەکانی پەیامەکانی نوور ئەوەیە، کە گۆشت بە ئەسپ و ، گیاش بە شێر نادەن ، بەڵکو گیا بە ئەسپ و ، گۆشتیش بە شێر ئەدەن ..

---

[٢٥٦] رجل القدر : ٢٠٦

دوای حەوت رۆژ نامەکەیان بە دەست ئەگات و ، کە لێکی ئەدەنەوە ئـەبینن حافیظ عەلیی لەو کاتەدا ئەم رستەیەی نووسیوە، کە مامۆستاش بەسەر چیاکەی قەسطەموونییەوە دووبارەی ئەکردەوە

مامۆستا لە چەند لایەکەوە خەم و خەفەت سەری لێ دابـوو، کۆچـی دوایـی پاڵەوانی نوور حافـیظ عەلیی و .. هەوڵ دانی دوژمـنان تا لە بەر چاوی دەوڵـەت تاوانبار بکرێت و سزایان پێ بچەژن و .. رەوانەکردنی خۆیشی بۆ خەستەخانە بە بۆنەی نەخۆش کەوتنیەوە بە ژەهر دەرخوارددان ، کەچیی لەم بارودۆخە سەختەدا کۆمەکیی و چاودێریی خوایی فریایان ئەکەوێت و ، بە بۆنەی دوعای پـاك و بـێ گەردی براکانیانەوە لە مەترسیی ژەهر پێ دانەکەش رزگاریان ئەبێت ..

مامۆستا ئەوەش باس ئەکات، کە دوژمنەکانیان چوونەتە سەر ئەو رایە، کـە دەرکردنی قوتابیانی نوور لە بەندیخانە کارێکی پێویستە لـە ترسـی ئـەوەی، کـە پەیامەکان بە شێوەیەکی فراوان لە نێوان بەندییەکاندا بلاّوەیان کردووە و، ئەمەش بۆتە هۆی تەوبەکردنی ئەو بەندکراوانە

دوای شەهیدبوونی حافـیظ عەلیی مامۆستا نوورسیی نامەیەکی سەرەخۆشیی نارد بۆ قوتابیان تا سەرەخۆشیی لە خۆی و لە قوتابیان و لـە پەیامـەکانی نـوور بکات و ، پیرۆزباییش لە حافیظ عەلیی شەهید و ، قەبرستانی دەنیزلیی ئەکات، چونکە برای ئازیزی شەهید بە جوانیی لە مەبەستی پەیامی بەری درەختی ئیمان گەیشتبوو و ، مژدەش ئەدات، کە حافیظ عەلیی لاشەکەی بە تەنیا لە قەبرەکەیدا بەجێ هێشتووە و ، خۆی وەك مەلائیکەت سەرکەوتووە بۆ لای ئەستێرەکان و بۆ جیهانی رۆحەکان ، تا بگاتـە پلـەی ( عـین الـیقین ) و ( حق الـیقین ) و ، دوای تەواوکردنی ئەرکی سەرشانیشی بە چاك ترین شێوە ، پشوویەك بدات .

پاشان مامۆستا دوعایەکی زۆری بۆ ئەکات و ، فەرمانیش ئەدات قوتابیان لە دوعاکانیاندا بۆی بپارێنەوە

مامۆستا سوپاس و ستایشێکی زۆری خوا ئەکات، کە ئەوانی گەیاندۆتە پلەی بەرزی قوتابیانی زانستە شەرعییەکان و کردەوە مەزنەکانیان ، لەم کات و شوێنە سەیرەدا .. دەریشی ئەبڕێ، کە حافیظ عەلیی لە قەبرەکەیشیدا هەر خەریکی خزمەتکردنی پەیامەکانی نوورە ، وەك لە دنیادا خەریك بوو و ، دوای شەهید بوونیشی بە شێوازی شەهیدان ژیان بەسەر ئەبات .

هەروەها مامۆستا دوعا بۆ موحەممەد زوهدیی و حافیظ موحەممەدیش ئەکات هەتا خوای گەورە بۆ خزمەتی قورئان رامیان بکات و تا رۆژی قیامەت سەرگەرمی ئەو کارە پیرۆزە بن ..[٢٥٧]

یەکێك لەو تاوانانەی، کە درابووە پاڵ مامۆستا ئەوەبوو، کە دژی دەوڵەتی کۆمارییە مامۆستاش ئەم تاوانە ئەداتە دواوە و ئەڵێت :

مێژووی ژیانم، کە لەبەر دەستتاندایە ، چاکترین بەڵگەیە، کە من کۆمارییەکی دیندار بووم بەر لەوەی ئێوە لە دایك بن ، جگە لە سەرۆکی دادگای بەتەمەن .

بە کورتیی مەسەلەکە بریتییە لەوەی، کە من ـ وەك ئێستەش وەهام ـ پیاوێکی کەنارگیر بووم و ، لە ژێر بنمیچێکی چۆڵدا ئەژیام، ئەو خواردنەش، کە پێم ئەدرا بریتیی بوو: لە شۆربا ( ی ساوەر ) و نان، جا دەنگە گەنمی ناو شۆرباکەم بەسەر مێروولەکاندا دابەش ئەکرد و ، خۆم نانەکەم بە ئاوی شۆرباکەوە ئەخوارد، هەندێك لەوانەی، کە ئەو کارەیان بیستبوو لە دانایەتیی ئەوە پرسیاریان کرد، و منیش وەڵامم دانەوە، کە ئەو مێروولانە یاسایی و کۆمارین و ، بە بۆنەی

[٢٥٧] الشعاعات : ٣٨٤ ـ ٣٨٥

ئەوەشەوە دەنگە گەنمەکانم بەسەریاندا دابەش کرد ، چونکە ئەوانە یاسا و رێك و پێکییان خۆش ئەویست، ئەوانیش بەرهەڵستم ئەوەستان و ئـەیان وت: تـۆ بـەم کارەت پێچەوانەی پێشیینە پیاوچاکەکان ئەجوولێیتەوە، منیش وەڵامم ئەدانەوە : بە خوای حەق هەموو خەلیفەیەك لە خەلیفە راشیدەکان خوا لێیـان رازیـی بێـت خەلیفە بووە، و لە هەمان کاتیشدا سـەرۆك کۆمـار بـووە، بـۆ نـموونە: ئایـا صددیقی ئەکبەر خوا لێی رازیی بێت دەرهەق بە دە کەسـە مـژدە پێدراوەکـە و، هاوەڵە بەرێزەکانیش هەر هەموویان لە جێی سەرۆك کۆمـار نـەبووە ؟ هـەروەها خەلیفە راشیدەکانی تریش .. بەڵام ئەو دەوڵەتە کۆمارییە تەنها ناوی رووت ، یان شێوازێکی بێ کرۆك نەبوو . بەڵکو بە تەواویی بە پێچـەوانەوە ، ئـەوان سـەرۆك کۆماری دینداری مانادار بوون ، کە لە دوو توێیدا ماناکانی حەق و عەدالەت و سەربەستیی شەرعیی بەوپەری لێهاتنەوە لە خۆ گرتبوو ..

دوای ئەوە مامۆستا روو ئەکاتە ( مدعي عام ) و ئەندامە بەرێزەکانی دادگـا و، ئەیدا بە گوێیاندا، کە بە پێچەوانەی بیروبۆچوونێك تاوانباری ئەکەن، کە پەنجا ساڵ لەوەوبەر باوەری پێی هەبووە، بۆشیان روون ئەکاتـەوە، کـە ئـەو کۆمـاریی عەلمانیەتەی لە گۆرێدایە ئەم وەهای لێ تێ ئەگات، کە ئەبێت بێ لایـەن بێـت . واتە وەك ئازادیی تـەواوی بـە مولحیـدان و سـەفیهان داوە ، بـە پێـی ئـازادیی بیروبۆچوون ، وەهاش ئازادیی بە خواناسان و ئەهلی تەقوا بدات .

بۆشیان روون ئەکاتەوە، کە ئەوە بیست و پێنج ساڵە ئەو لە کۆمەڵگا دابراوە و، نازانێت یاسای کۆماریی بەرەو کوێ چووە، جا ئەگەر ئـەو دەوڵەتـە کۆمارییـە سەربەستیی لەوانە زەوت ئەکات، کە خەریکی خزمەتی ئیمان و ئاخیرەتن و ، بە نارەوا موحاسەبەیان ئەکات و ، ماوە ئەدات ئیلحاد و بێ دینیی پەرە بسـێنێ ، ئەوا ئەو بە دەنگی بەرز ئاشکرای ئەکات و ئەی دا بە گوێی هەمواندا کە :

ئەگەر هەزار رۆحی ببن ، ئەوا ئامادەیە هەر هەموویان بکاتــە قوربــانیی لــە پێناوی ئیمان و ، ئاخیرەتدا!! جا چیی پێ ئەکەن با بیکەن و ، چۆنی حوکم ئەدەن با بیدەن و دوا وتەی ئەمەیە ( حسبنا الله ونعم الوكيل ) !

هەروەها ئەیدا بە گوێیاندا، کە ئەگەر بە ناڕەوا حوکمی لــە سـێدارەدان یــان کاری قورسی هەتاهەتایی بەسەردا بدەن ، ئەوا ئەو هیچــی لێ نایــەت ، بــەڵکو بەرەو جیهانی نوور و بەختەوەریی ئەکەوێتە ڕێ ..

پاشان ڕووی وتاری ئەکاتە دوژمنە شاراوەکانیان، کە بــە هــەموو شـێوەیەك ئەیانەوێ خزمەتکارانی ئیمان لە ناو بەرن و گومرایی و بێ دینیی پەرە پێ بدەن و، تێیان ئەگەیەنێت، کە ڕۆژێك دێت ئەوان بۆ هەتاهەتایی لە سێدارە بــدرێن و، بگەن بە بەندیخانەی تاکەکەسیی هەتاهەتایی و ، بەبێ هیچ گومانێك بە توندترین و سەختترین شێوە تۆڵەیان لێ بکاتەوە   بۆیە باکی لە هــیچ نیــە و ئامادەیــە گیانی ببەخشێت .

ناحەزانی مامۆستا تــاوانێکی تــری ئەخەنــە پــاڵ، کــە ئــەویش بریتییــە لــە بەکارهێنانی هێز بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و حوکم .

تێیان ئەگەیەنێت، کە ئەو شەفەقەت و بەزەیی و حەق و چاکەویستییەی، کە لە پەیامەکانی نووردایــە ، ڕێ بــە شــوێن کــەوتوانیان نــادەن دەســت بخەنــە کــاری سیاسەتەوە ، چونکە بێ تاوانی زۆر لەو پێناوەدا تووشی موسیبەت و کارەسـاتی ناخۆش ئەبن، چونکە ئەم چەرخە چەرخی ئەنانیــەت و ڕەگەزپەرسـتیی و زوڵــم و زۆری سەربازییە، کە بە جەنگی جیهانیی دووهەم فەراهەم هاتووە، هەروەها لــە ئەنجامی گومرایی و لادان لە ڕێی ڕاست دڵەکان وەك بەرد ڕەق بوون، ئەمانــەش بوونەتە هۆی بەرپابوونی زوڵم و ستەم ، ئەمەش ڕێ بە ئەهلی حەق نادات بە زۆر

مافی خۆیان وەربگرنەوە ، چونکە بێ تاوانی زۆر لە بەین ئەچێ و ، هیچ کات ئەهلی حەق لەو ڕێگەیەوە بە ئاوات ناگەن ..

خۆ ئەگەر یاسای تۆڵەسەندن بە بەرامبەر جێبەجێ بکەن، کە یاسایەکی زاڵمانەیە ، ئەوا لە تۆڵەی دوو کەسی خراپدا بیست سیی بەستەزمانی بێ تاوان پێوە ئەبن ، ئەو کاتەش بە ناوی حەق و عەدالەتەوە زوڵمێکی گەورە ئەکرێت و، ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی کە مامۆستایان لە سیاسەت دوور خستۆتەوە.

دوای ئەوە دەری ئەبڕێت، کە مادەم هەموو شتێك فانیی و کاتییە و، مەرگیش نامرێت و ، دەرگای قەبریش دەمی والا کردووە و ، داناخرێت و ، لەوانەیە زەحمەت و نارەحەتیی بگۆڕرێت بە ڕەحمەت و خۆشیی ، کەواتە وا چاکە بێ دەنگ بن و ، پشت بە خوا ببەستن و ، لە تەنگانەدا خۆیان بە ئارام گرتن برازێننەوە و، لە خۆشییش‌دا بە سوپاس کردن ..

دەریشی ئەبڕێت، کە پێویست ناکات کاربەدەستان و سیاسەتمەداران و پیاوانی هەڵسووڕێنەری کاروباری دەوڵەت و پاسەوانان و خەم خۆرانی وڵات خۆیان بە مامۆستا و قوتابیەکانیەوە بپەشۆکێنن .. چونکە لەوانەیە هەندێ لە زیندیقە بێ دینە شارراوەکان بە فروفێڵی شەیتانییان هەندێ لە کاربەدەستان لە دژیان هەڵ بنێن، دوای ئەوە بەڵێن ئەدا، کە قوتابیانی نوور پشت بە خوا و بە هێزی قورئان تێك ناشکێن ، ئەگەرچیی دوژمنان سەرانسەری دنیا بکەنە سەربازی خۆیان و ئەوانی خواناس بە هیچ شێوەیەك جڵەو بۆ ئەو موڵحید و زیندیق و پاشگەزبووانە شل ناکەن ..[٢٥٨]

---

[٢٥٨] رجل القدر : ٢٠٨ ـ ٢١١

پاشان مامۆستا بەرگریی لە پەیامەکانی نوور ئەکات و ، گرنگییان دەرئەخات و ، رشوونیشی ئەکاتەوە، کە قوتابییەکانی بێ تاوانن ، کە ئەڵێت :

هیچ کەس مافی ئەوەی نیە ، بە هۆی هەڵەی شەخسیی منەوە ، یان هەڵـەی هەندێ لە برایانمەوە ، هێرش بکاتە سەر پەیامەکانی نوور ، چونکە پەیامـەکانی نوور پاڵیان بە قورئانەوە داوە و ، بەهێزترین پەیوەندییشـیان پێـوەی هەیـە و ، قورئانیش راستەوخۆ بەستراوە بە عەرشی ئەعظـەمـەوە ، جـا کـێ ئـەتوانێ لـە سنووری خۆی بترازێ و دەستی بۆ ئەوێ درێژ بکات ، بـۆ ئـەوەی ئـەو گوریسـە ئەستوورانە بکاتەوە ؟

پەیامەکانی نوور، کە بەسەر دەستیدا بەرەکەتی ماددیی و مەعنەویی بۆ ئەم نیشتمانە بەدیی هاتووە و ، چەندین خزمەتی لە رادەبەدەری وەهای پێشکەش پێی کردووە، کە بە هیچ پێوانەیەکی ماددیی مەزەندە ناکرێ .. ئەم پەیامانە ناگونجێ لە هەڵە شەخسیی و لادانە مرۆییەکانی ئێمە بەرپرسیار بن، بەڵام ئەگـەر هـەر کۆڵتان نەدا و ، ئەو هەڵانەتان خستنە ئەستۆی ئەوان و لەسەر ئەوە سوور بـوون، کە تاوانەکە بخەنە گەردنی ئەوان ، ئەوا با چاك بزانن، کە ئـەوە چـەندین زیـانی ماددیی و مەعنەویی بەم وڵاتە ئەگەیەنێت ، کە بە ئاسانیی لە ناو نابرێن، یـان بەر لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەیان ناگیرێت، بەڵام ئەو پیلانە ناپاکانەی، کە بە نهێنیی نەخشەیان بۆ ئەکێشرێت و ، بە هۆی کۆمەڵێك پیاوخراپەوە لە دوژمنـە شاراوەکانمان و ، بە شەیتانێتیی دەستەیەك لە زیندیقە داخ لە دڵەکان تەگبیریان بۆ ئەکرێت و بەرێوە ئەبرێن ، ئەوانە ـ إن شاء الله ـ دۆران بەشیانە، قوتابیانی نوور هەرگیز لەگەڵ غەیری خۆیاندا پێوانە ناکرێت ، چونکە بە ئاسانیی بڵاوەیان پـێ ناکرێت ، یان هەوڵی ئەوەیان لەگەڵ نادرێت، کە لە بانگەوازەکەیان واز بهێنن .. ئەوان ژێر ناکەون و .. بە کۆمەکیی و پارێزگاریی خوا نابەزێن .

لەبەر ئەوەش نەبوایە، کە قورئان لە بەرگریی ماددیی قەدەغـەی کـردووین ، ئەوە بەس نەبوو ناوی ئەو قوتابییانە ـ کە وەك دەماری خوێن بەری گەل وەهان و ، ڕەزامەندیی گەورە و بچووکیان بە دەست هێناوە و ، لە هەموو شوێنێکیش‌دا هەن ـ تێکەڵ بە ڕووداوی هەندەکیی بێ ئەنجام بـبن ، وەك ڕووداوی شـێخ سـەعید و، ڕووداوی ( منمن ) بۆ نموونە . بگرە ئەگەر تووشی ستەمی قورس بـوون ، یـان ـ خوا نەخواستە ـ مەینەتێکی توند یەخەی پێ گرتن و ، بە ناچاریی دەستیان دایە بەرگریی لە خۆ ، ئـەوا ئـەو زیندیقانـەی خۆیـان حەشـار داوە و ، هاوکۆمەکـە مونافیقەکان و غەیری ئەوانیش بەبێ گومان هەزار جار پەشیمان ئەبنەوە .

کورتەی باس : مادەم ئێمە دەست لە کاروباری ئەهلی دنیا وەرنادەین ، ئـەوا ڕاست‌تر و چاك‌تر وەهایە کە ئەوانیش لەلایـەن خۆیانـەوە دەسـت لـە کاروبـاری قیامەتیی و ، خزمەتی ئیمانیی ئێمە وەر نەدەن ..[٢٥٩]

هەروەها مامۆستا ئەڵێت :

ئەشڵێن : ئەوە بیست ساڵە بۆچیی تاقە جارێك شەبقەکەمان لەسەر ناکەیت و، بۆچیی تاقە جارێکیش سەرت بۆ دادگاکەمان ڕووت ناکەیت ، لەگەڵ ئەوەدا، کە حەڤدە ملیۆن کەس لەگەڵ لەبەرکردنی جل و بەرگ‌دا ڕاهاتوون ؟

منیش ئەڵێم : حەڤدە ملیۆن نین و ، حەوت ملیۆنیش نین ، بـەڵکو کـەمێکی یەکجار کەمیش نین ئەوانەی بە ویست و هەڵبژاردنی خۆیان ئەو جل و بەرگـەیان پۆشیوە و ، جگە لە کۆمەڵێك گەلحۆ کـە بـەدوای ڕەوشـتە سـووك و ڕسـواکانی ئەورووپادا هەناسە برکێیان پێ کەوتووە

---

[٢٥٩] رجل القدر : ٢١١ ـ ٢١٢

پیاوێکی وەك من ، کە ماوەی بیست و پێنج ساڵە وازم لە ژیانی کۆمەڵایەتیی هێناوە ، لەمەدا پێی ناوترێت سەرپێچیکارە یان قیرسیچمەیە، وەهاش دابنێین ئەمە قیرسیچمەییە، جا مادەم "موصطفا کەمال" خۆی نەی توانیوە ئەو قیرسیچمەییە بشکێنێ و ، دوو دادگا و ، حکومەتی سێ پارێزگاش نەیان توانی کارم تێ بکەن ، ئیتر ئێوە چین تا لەم گاڵتەجارییەدا کات بەسەر بەرن ؟

لە بەشێکی تری بەرگرییەکەیدا ئەڵێت :

ئەمە راستییە و ، ئێمەش بە هەموو هێزێکەوە ئەڵێین :

ئەی ئەوانەی، کە دینی خۆتان بە دنیا فرۆشتووە .. هەی بەدبەختان ! چیتان لە دەست دێت درێغیی مەکەن .. سەرەنجام دنیا ئەبێتە نەگبەتیی بۆتان .. ئەم بانگەوازە پیرۆزە ملیۆنەها پاڵەوان خۆیان کردۆتە قوربانی و ، ئێمەش ئامادەین گیانمان بکەینە قوربانیی .. ئێمە پێمان چاکترە هەزار جار لەم بەندیخانەدا بمێنینەوە، نەك چاومان لە دەست درێژی بێت بکرێتە سەر حەیا و شەرەف، لە سایەی ئەم زۆردارییەدا ناتوانرێ بوترێ : سەربەستیی هەیە .. سەربەستیی زانست، یان سەربەستیی ویژدان ، یان سەربەستیی دەربڕین ، یان سەربەستیی دین .. بۆ سەربەستی خوازان تەنها ئەوە ماوەتەوە، کە بمرن ، یان لە بەندیخانەکان دا بمێننەوە و ، خۆیان بدەنە پەنای خوای گەورە و بڵێین : ( حسبنا الله ونعم الوكيل ) .

ئەو داوایەی، کە لەسەر پەیامەکانی نوور تۆمار کراوە ، کارێکی شەخسیی و، شتێکی ساکار نیە ، هەتا لە شانی کەم بکرێتەوە، ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی بە ئوممەت و نیشتمان و دەوڵەتەوە هەیە و ، پەیوەندییشی بە ئوممەتی ئیسلامەوە هەیە و ، سەرانسەری جیهانی ئیسلامیی بەوپەڕی گرنگیی پێدانەوە لەم مەسەلەیە ئەکۆڵێتەوە

ئێمە ئاشکرای ئەکەین، کە ئێمە سەر بەو کۆمەڵە ئیسلامییەین، کە زیاتر لە سێ صەد ملیۆن موسڵمانی تێدایە، کەواتە ئێمە کۆمەڵی خواین و ، کۆمەڵە برای هاوکارین و ، خزمەتکاری قورئان و ، سەرباز و کۆمەڵی خواین .

بەرێزان ! سەرۆکی دادگا !

ئێوە، کە ئەم حوکمانە بەسەر پەیامەکانی نوور و قوتابییەکانیدا ئەدەن و ، واز لە کوفر و ئیلحاد ئەهێنن و ، هەوڵیش ئەدەن، کە حەقیقەتە قورئانیی و ئیمانییەکان لەبەر چاوی مرۆڤ دا بشارنەوە و ، بەمەش ئەتانەوێ ئەو رێگایە دابخەن ، کە ملیۆنەها بەڵکو صەدەها ملیۆن موسڵمانی لێوە تێپەریون و ، بە بەختەوەریی هەتاهەتایی راستەقینە گەیشتوون ، ئێوە جگە لە رق و قین و سووک تەماشاکردنیان بۆتان هیچتان دەست ناکەوێت .

زیندیقان و مونافیقان ئێوەیان لە خشتە بردوون و ، داویشیانە بە تەوقەسەری حەق و عەدالەتدا و ، دەوڵەتیشیان لە کاری راستەقینەی خۆی لاداوە و ، بە چەند کارێکی بێ کەڵکەوە پەشۆکاندوویانە و ، لە ئیستیبداد کۆماریی و ، لە پاشگەزبوونەوە رژێم و ، لە نەفامیی و سەفاهەت شارستانیەت و ، لە زوڵم و زۆر یاسایان بەرپا کردووە ، بەمەش ناپاکییان بەرامبەر بە نیشتمانیان کرد و ، بە جۆرێك لێیان داوە کە بێگانە نەی ئەتوانیی وەها لێی بدات .[٢٦٠]

بەڵێ ، دادگا بریاری بێ تاوانیی مامۆستا نوورسیی و هەر هەموو قوتابیەکانی لە هەموو تۆمەتێك دەرکرد و ، دادگای تەمییزیش بە یەك دەنگیی تەصدیقی ئەو بریاری بێ تاوانییەی کرد ، کەچیی لەگەڵ ئەوەش دا کاربەدەستان مامۆستایان ئازاد نەکرد ، بەڵکو فەرمان بە لێ پرسراوان درا، کە بیبەن بۆ میوانخانەیەك و

[٢٦٠] رجل القدر : ٢١٢ ـ ٢١٣

لەوێ بەندی بکەن و ، چاوەڕوانی تەعلیماتی نوێ بن دەربارەی ئەو لە ئەنقەرەی پایتەختەوە پێیان بگات .. [٢٦١]

ئەوەبوو لە ئوتێل شەهر لە شاری دەنیزلیی نزیکەی دوو مانگ مایەوە ، بەڵام قوتابیان ئازاد کران و هەر یەکە گەڕایەوە ماڵی خۆی و ، ئەو کتێبانەش کە دەستیان بەسەردا گیرابوو گێڕرانەوە بۆ خاوەنەکانیان .

بڕیاری دادگا، کە بە یەکدەنگیی بێ تاوانیی مامۆستا و قوتابیانی ئەگەیاند ژمارە ١٩٩ / ١٣٦ لە ١٦ / ٦ / ١٩٤٤دا بوو بەڵام بڕیاری تەصدیق کردنی دادگای تەمییز ژمارە ٣٠٠٠٥ / ٢١٩٣ بوو لە ٣٠ / ١٢ / ١٩٤٤ عەدەدی ٢٠١٩ [٢٦٢]

دوای کۆتایی هاتنی دادگای کردن و ، دەرچوونی بڕیاری بێ تاوانیی قوتابیان، بەندییەکانی تر هەستیان کرد وا برا رابەرەکانیان بەجێیان ئەهێڵن ، هەندێك لەو بەندییانەش چەند ساڵێك حوکم درا بوون و هەندێکیش سەرانسەری ژیانیان، بە راستیی دیمەنێکی کاریگەر بوو .. فرمێسك بە خوڕ لە چاوی بەندییەکان ئەهاتە خوارەوە، کە جاران دڵیان ئەوەندە رەق بوو هیچ سۆز و بەزەییەکی تێدا نەبوو.. بەڵام ئێستا بە وێنەی دڵی منداڵی پاك و بێ تاوان ئەوانیش دڵیان نەرم بوو بوو و، بە گریانەوە ئەیانوت :

ـ ئێمە نە خوامان ئەناسی و نە پێغەمبەر .. ئێوە رێی راستتان پیشاندا جا هەرچیی بکەین ئەوا نە ئەتوانین پاداشتی مامۆستا نوورسیی بدەینەوە و سوپاسی بکەین ، نە هی ئێوە

---

[٢٦١] رجل القدر : ٢١٣
[٢٦٢] سيرة ذاتية : ٣٥٤

بەڵێ قوتابییانی نوور هەر هەموو لە بەندیخانە ئازاد بوون و هاتنە دەرەوە، جگە لە یەکێکیان کە ئەویش حافیظ عەلیی بوو و ، لە ناو بەندیخانەدا بە هۆی ژەهر پێ دانەوە و ، بە هۆی ئەوەوە لاشەی لاوازی بەرگەی شێداریی بەندیخانەی نەگرت بە شەهیدیی سەری نایەوە [٢٦٣]

بەندییەکان بە دڵێکی شکستەوە خواحافیزییان لە قوتابیانی مامۆستا کرد و، یەکجار بێ تاقەت بوون .. ساڵانی دوور و درێژی بەندیخانە بەبێ ئەوان چۆن بەسەر بەرن ؟ بەلاّم مامۆستا مژدەی بۆ ناردن، کە با دڵ گران و خەم بار نەبن چونکە حکوومەتێکی نوێ دێتە سەر حوکم و چاوپۆشیی لە هەموو بەندکراوان ئەکات و، إن شاء الله ئەو کاتە لە بەندیخانە دەر ئەچن ..

هەروایش بوو ، مامۆستا چاکی پێکا بوو ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٠دا پارتی دیموکراتیی لە هەڵبژاردنەکان دا سەرکەوت و چاوپۆشیی لە بەندییەکان کرد و هەر هەموو ئازاد بوون .[٢٦٤]

دوای دوو مانگ لە بەندکردنی مامۆستا لە میوان خانەی شەهر لە دەنیزلیی ، لە ئەنقەرەی پایتەختەوە تەعلیمات هات، کە نەفیی بکرێت بۆ شاری ئەمیرداغ، کە قەزایەکە لە قەزاکانی پارێزگای ئافیوون، ئەوەبوو لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٤دا سەفەری کرد و ، بۆ ماوەی دوو حەفتە لە میوانخانەیەکدا مایەوە هەتا ژوورێکی بۆ بە کرێ بگیرێت، کە خۆی کرێکەی ئەدا، بەمە لاپەرەیەکی ژیانی مامۆستا تەواو بوو، و لاپەرەیەکی نوێ دەستی پێ کرد [٢٦٥]

---

[٢٦٣] سيرة ذاتية : ٢٤٩ ، رجل القدر : ٢٠٦

[٢٦٤] رجل القدر : ٢٠٦

[٢٦٥] رجل القدر : ٢١٤ ، سيرة ذاتية : ٣٥٥

کاتێك، کە مامۆستا نوورسیی لە بەندیخانەدا بوو، نامەی بۆ براکانی و قوتابیە بەوەفاکانی ئەنووسیی و ، دڵخۆشیی ئەدانەوە تا ورەیان بەرز بێت و، بەرگەی ئەو ستەمە بگرن کە بەرامبەریان ئەنجام ئەدرێت پیرۆزبایی شەوی قەدر و جەژنی رەمەزانی لێ ئەکردن .. هەروەها تێی ئەگەیاندن، کە قوتابیانی نوور بە کەمترین نارەحەتیی و ئێش و ئازار گەورەترین کار و ئەرکی پیرۆز ئەنجام ئەدەن، کە ئەمەش فەزڵ و بەخشایشی خوای گەورەیە چونکە کوفری موتڵەق پەرەی سەندووە و ، تا بە کافریی نەچنە قەبرەکەیانەوە .. دیارە ئەمەش پێویستە بەوپەڕی تاسەمەندیی و سوپاس گوزاریی و ئارامەوە ئەنجام بدرێت ..[٢٦٦]

لە نامەیەکیشیدا قوتابیان لە فێڵ‌وفری زیندیق و مونافیقان ئاگادار ئەکاتەوە، کە ئەیانەوێ بەو هۆکارانەی، کە تەریقەتی نەقشبەندیی و تەریقەتەکانی تریان پێ شکست هێنا ، پەیامەکانی نووریش لەناو بەرن ، ئەویش بە پەرتەوازەکردنی قوتابیان و ، نەهێشتنی خۆشەویستیی نێوانیان .. بەڵام رێبازی پەیامەکان لەسەر ئیخلاصی تەواو دارێژراوە و ، بە یەکجاریی ئەنانیەتیش وازی لێ هێنراوە و، قوتابیان چاویان بریوەتە سۆز و بەزەیی پەروەردگار و ، بە دوای لەزەت و چێژە قیامەتییەکان‌دا ئەگەڕێن و ، بۆشیان دەرکەوتووە، کە لەزەتی پاڵفتەی دنیاییش هەر لە ئیمان‌دایە، کەواتە بەو ئاسانییە پەیامەکان لەناو نابرێن و ، دوژمنان هەر ماندووبوونیان بۆ ئەمێنێتەوە[٢٦٧]

لە نامەیەکیشیدا مژدە ئەدات بە قوتابیە دامەزراوەکان، کە لە تاقیی کردنەوەی هەردوو قوتابخانە یووسفییەکەدا ، بەندیخانەی ئەسکی شەهر و دەنیزلیی

[٢٦٦] سيرة ذاتية : ٣٤٦ ـ ٣٤٧
[٢٦٧] سيرة ذاتية : ٣٤٨

، سەرکەوتنیان بە دەست هێنا و ، وازیان لە دەرسی ئیمان نەهێنا، مژدەیان پێ ئەدات، کە مەلائیکەت و رۆحانیی و ، ئەهلی حەقیقەت و بەرەی داهاتوو پیرۆزبایی خزمەتی بێ هاوتایان لێ ئەکەن .. بۆیە پێویستە براکان چاویان لە یەکتر بێت و دڵخۆشیی یەکتر بدەنەوە و ، پشتیوان و کۆمەك بن بۆ یەکتریی، مژدەشیان ئەداتێ، کە رۆژێك جبەکەی شێخ مەولانا خالیدیان [٢٦٨] بۆ ئەنێرێت، کە تەمەنی(١٢٠)صەد و بیست ساڵە و ، شێخ بۆ مامۆستای ناردووە هەتا لەبەری بکات، واتە شێخ مەولانا خالید ئیجازەی خزمەتی قورئان و ئیمانی بە مامۆستا نوورسیی داوە و ، ئەمانەتی خزمەتی دینی پێ سپاردووە، ئەی نێرێت تا قوتابیەکانیش لەبەری بکەن .. [٢٦٩]

مامۆستا لە نامەیەکی تردا مژدە بە برا بەوەفا خۆشەویستەکانی ئەدات، کە مادەم بە مەبەستی پاداشتی قیامەت دەستیان بە رێبازی پەیامەکانی نوورەوە گرتووە و ، جۆرە خواپەرستییەکیش ئەنجام ئەدەن ، ئەوا بێ گومان هەر سەعاتێکی تەمەن بەسەربردنیان لەو بارودۆخە سەختەدا لە حوکمی خواپەرستیی

---

[٢٦٨] مەولانا خالید : ئەبولبەهاء ، ضیائوددینە، کە بە مەولانا خالیدی شارەزووریی بەناوبانگە ( ١١٩٠ ـ ١٢٤٢ ك ) . نوێخوازی سەردەمی خۆیەتی و ، یەکێکە لە ئیمامەکانی تەریقەتی نەقشبەندیی ، کە لە زانست و تەقوادا پێشی زانایانی چەرخەکەی داوەتەوە و ، زۆرێك لە ئەولیایانی پەروەردە کردووە .. لە لای عەبدوڵڵای دەهلەویی دەرسی خوێندووە و ، لە شام کۆچی دوایی کردووە، ئەو جبەیەی کەوتە دەستی خاتوو ئاسیا و هەڵی گرت و پاراستی هەتا ئەوەبوو بە هەدیە دای بە یەکێك لە قوتابیانی نوور لە ئیسپارتە ، تا ئەویش بە هەدیە تەسلیمی مامۆستا نوورسیی بکات، کە ئەویش هەتا کۆچی دوایی کرد پاراستی .

شایانی باسە، کە ئەم جبەیە ئێستا وا لە لای بەرێز مامۆستا عەبدولقادر بادللیی لە شاری ئۆرفە و ، کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٧ دا سەردانی تورکیامان کرد خوا بە قسمەتی ئێمەشی کرد بە لەبەرکردنی ئەو جبەیە شەرەفمەند بین ، هەرچەندە بە ئاسانیی بۆ هەموو کەسێك مۆڵەتی لەبەرکردن نادرێت .

[٢٦٩] الشعاعات : ٣٦٠

بیست سەعات‌دا ئەبێت و ، ئەو (٢٠)بیست سەعاتەش کارکردن بۆ خزمەتی قورئان و ئیمان، چونکە بریتییە: لە جیهادی مەعنەویی ، ئەوەندەی (١٠٠)صەد سەعات گرنگ ئەبن و، ئەو (١٠٠)صەد سەعاتەش ، کە بە گەیشتن بە موجاهیدی راستەقینە لە برایانی بەرێز ـ کە هەر یەکەیان ئەوەندەی صەد کەس گرنگن ـ و ، بەستنی پەیمانی برایەتیی لەگەڵیان و ، داواکردنی کۆمەکیی لێیان و ، کۆمەکیی کردنیان و، بەردەوام بوون لە گەڵیانا لەسەر خزمەتی ئیمان بەوپەری ئیخلاص و دامەزراوییەوە و ، کەڵك وەرگرتن لە رەفتارە جوانەکانیان و ، دەست خستنی پلەی قوتابێتیی لە قوتابخانەی زەهراء دا ، پێویست بە سوپاس و ، دان بەخۆداگرتن ئەکات تا بەرگەی هەموو کۆسپ و نارەحەتییەك بگرن و ، بیریش لەو هەموو کەڵکانە بکەنەوە، کە باس کران.[٢٧٠]

دوای ئەوەی قوتابییەکان لە بەندیخانە ئازاد کران و ، هەر یەکەیان بەرەو ناوچە و مەنزڵی خۆی گەرایەوە و ، مامۆستایان لە میوان‌خانەی شەهر لە دەنیزلیی بۆ دوو مانگ هیشتەوە ، رۆژێکیان مامۆستا لەسەر نهۆمی سەرەوەی میوانخانەی شەهر دانیشتبوو سەرنجی ئەو سپیی چنارانەی دەوروبەری خۆی ئەدا، کە لە باخچە رازاوەکان‌دا بوون ، سەرنجی دا ئەو درەختانە بە جم و جووڵەکەیان زۆر شادمانن و ، بە خۆیان و لق و گەڵاکانیانەوە بە شنەی شەماڵ سەمایان ئەکرد، وەهای بە بیردا هات، کە ئەوانیش وان لە ئەڵقەی ذیکری خۆیان‌دا و، تەسبیحاتی پەروەردگار ئەکەن .

جم وجووڵی ناسکی درەختەکان پێکەوە کاری کردە سەر دڵ و دەروونی مامۆستا و ، هەستی بە ماتەمینیی و خەفەت ئەکرد لە دوورکەوتنەوە و

---

[٢٧٠] الشعاعات : ٣٦٥

جیابوونەوەی لە برا قوتابیەکانی .. ئا لەم کاتە خەفەتاوییەدا لەبەر تەنیایی ، لە ناکاو دیمەنی پاییز و زستانی دێتە یاد، کە گەڵای ئەو درەختە جوانانە ئەوەرێت و جوانیی و قەشەنگیی بەسەر ئەچێت و مامۆستا بۆ ئەو دیمەنە و بۆ هەموو زیندەوەرانی تر ئازار بە دڵی ئەگات و ، هەردوو چاوی پر لە فرمێسك ئەبن و، خەم و خەفەتێکی زۆر سەری لێ ئەدەن ..

کە مامۆستا لەم حاڵەتەدا ئەبێت ئەو نوورەی، کە حەقیقەتی موحەمەدیی ﷺ پێشەکەشی ئەکات ـ وەك بە هانای هەموو ئیمانداریکەوە دێت و فریای ئەکەوێت ـ بە هانای ئەویشەوە دێت و ، ئەو هەمووە خەم و خەفەتانە، کە سنووریان نیە ئەگۆرێت بۆ خۆشیی و شادمانییەکی بێ سنوور ، بە رادەیەك، کە ئەوپەری منەت باریی دەربخات بۆ حەقیقەتی موحەمەدیی، کە تیشکێك لە نووره زۆر و زەبەندەکانی گەیشتە فریای و رزگاری کرد و دڵخۆشیی تەواوی دایەوە [٢٧١]

---

[٢٧١] الشعاعات : ٣١٥

بەشی یانزەهەم

# نەفیی کردن بۆ ئەمیرداغ

## *قوتابخانەی نووریی سێهەم*

مامۆستا بە تاقی تەنیا و کاربەدەستانیش بە هێز و دەسەلاتی حکومەتێکەوە لە زۆرانبازییدا بوون .. دەوڵەتێك بە هەموو توانا و لێهاتنیەوە دژایەتیی پیرە پیاوێکی غەریب و نەخۆش و بێ کەس و بێ خزمەتی ئەکرد ، بێ ئەوەی ئەو بەستەزمانە تاوانێك ، یان خراپەیەکی ئەنجام دابێ .. تەنها بیری لە رزگارکردنی ئیمان ئەکردەوە ئاواتەخواز بوو دوژمنانیشی بتوانن ئیمانی خۆیان رزگار بکەن .. بەڵکو بە ئاگری دۆزەخ نەسووتێن ..

مامۆستا چەند جارێك درا بە دادگا و بێ تاوان دەرچوو .. دادگای تەمییزیش هەر بێ تاوانی دەرکرد ، کەچیی دەوڵەتەکەی ئەو رۆژەی تورکیا هەموو یاسایەکی خستە ژێر پێی و ، هەموو ویژدانێکی پشت گوێ خست و ، بریاری دا مامۆستا نەفیی بکات بۆ ئەمیرداغ و ، لەوێ دەست بەسەر بێت .

لە عەسری رۆژێکی مانگی ئابی ساڵی ١٩٤٤دا مامۆستا نوورسیی بە هۆی ئوتومبێلێکەوە گەیەنرایە پۆلیسخانەکەی ئەمیرداغ و لەوێ تەسلیم کرا

کاربەدەستان بریاریان دا خانوویەکی گونجاوی بۆ پەیدا بکەن تا بە ئاسانیی بە شەو و بە رۆژ چاودێریی بکەن ، واتە ئەبێت لە پۆلیسخانەکەوە نزیك بێت .

کاربەدەستی پۆلیسخانەکە پۆلیسێکی بانگ کرد کە ناوی ئیبراهیم مەنکووەرلیی بوو، و فەرمانی بەسەردا دا لە بەردەم پۆلیسخانەکەدا ماڵێك بە کرێ بگرێ بۆ مامۆستا نوورسیی .

ئیبراهیم یەکێك بوو، لەو ژاندرمانەی، کە لەو ناوچەیەدا بوون و ، جار لە دوای جار لە شوێنێکەوە ئەگوازرایەوە بۆ شوێنێکی تر ، تا ئەوەبوو گەیشتە ئەمیرداغ . دوای یەك دوو حەفتە فەرماندەی دەستەکەی بانگی ئەکات و، ئەویش ئەچێت بۆ لای ، ئەبینێ پیاوێك بە جل و بەرگی عوثـمانییەوە ، بە جبە و مێزەرەوە قنج لە لای سەرۆکی پۆلیس‌دا وەستاوە

فەرماندەکەی وتی : وەرە ! وەرە ! ئەوە تۆ لە کوێیت ؟

ئیبراهیم ئەڵێت : من لێرەم .. إن شاء الله خێرە .. ئایـا هـیچ شـتێك رووی داوە؟

فەرماندە ئاماژەی بۆ ئەو پیاوەی تەنیشتی کرد :

ئەمە ئەناسیت ؟

ئیبراهیم ئەڵێت : کاتێك ئەو پیاوەم بە جل و بەرگی عوثـمانییەوە ، بە جبە و مێزەرەیەکەوە بینیی ، ناوی زانا بەناوبانگەکـەم بـە بـیردا هـات ، بـەڵام باسـم نەکرد

وتم : کێیە ؟

فەرماندە وتی : ( بدیع الزمان ) ە

هاوارم کرد : چیی ؟ پاشان چەمیمەوە بەسەر هەردوو دەستی ( بدیع الزمان ) دا هەتا ماچیان بکەم .. کەواتە ئەمـە زانـا بەناوبانگەکەیـە لـە بـەردەمم‌دا هەمووان سەیری منیان ئەکرد

فەرماندە وتی : پێویستە خانوویەك بۆ مامۆستا سەعیدی نوورسیی بـە کـرێ بگرین ، جا تۆ ئەم کارە ئەنجام ئەدەیت ، چونکە ناسراوت زۆرن .

هەروەها وتی: بەڵام پێویستە خانووەکە لەبەردەم پۆلیس‌خانەدا بێت .

لەبەردەم پۆلیس‌خانەکەدا بینایەك هەبوو، کە نهۆمی ژێرەوەی دووکان بوو و ، نهۆمی سەرەوەش ماڵی پیاوێك بوو بە ناوی ( حسن باقرچیی )، خانووەکە دانرابوو بدرێت بە کرێ .. حەسەنی خاوەن ماڵ بـە شـەو و بـە رۆژ سـەرگەرمی عـەرەق خواردنەوە بوو و ، جار بە جار منیش لە گەڵیا ئەم خواردەوە .. لەسـەر عـەرەق خواردنەوە وەها راهاتبوو، کە هەرگیز نەی ئەتوانی دەستی لێ هەڵ بگرێت و، لە بنەرەتیش‌دا خەڵکی طەرابزوون بوو .

چووم بۆ بازار و ، رووم لە دووکانی حەسەن نا، و پێم وت : وەستا حەسـەن ! نهۆمی سەرەوە بدە بە کرێ تا مامۆستا بێتە ناوی .[٢٧٢]

وتی : براکەم ! من پیاوێکی سەرخۆشم و ، ئەویش زانای دینە ، چۆن لەگەڵیا ئەگونجێم ؟

حەسەن هەرچەندە سەرخۆش بوو، بـەڵام راسـتی ئـەوت، عـەرەق خۆرێـك و مەلایەك پێکەوە ناژین .

ئیبراهیم ئەڵێت : وەهام بە بیردا هات، کە مامۆستا پیاما هەڵ ئەشـاخێت و ئەڵێت :

( بۆچیی داوای خانووت لەو پیاوە سەرخۆشە کردووە ؟ ) .

دوای کەمێك چووم بۆ لای مامۆسـتا و باسـەکەم بـۆ گێرایـەوە و پـێم وت : خانووەکە هەیە ، بەڵام خاوەنەکەی عەرەق خـۆرێکی سەرخۆشـە، ئـیتر هـەواڵم نەدایێ، کە خۆیشم سەرخۆش ئەبم و هاوەڵی عەرەق خواردنەوەی ئەوم .

[٢٧٢] نهۆمی سەرەوە هەمووی بە کرێ ناگرێت بۆ مامۆستا ، بەڵکو حەسەنی خـاوەنی مـاڵی خۆیشـی لـەوێ ئەبێت

کاتێك، کە پێم وت : خاوەن ماڵەکە سەرخۆشە ، بە تەمابووم مامۆستا توورە ببێت ، کەچیی توورە نەبوو ، هەروەك هەستی توورەبوونی نەبێت ..

پێمی وت : قەی ناکا براکەم .. با سەرخۆش بێت .

خێرا هەواڵەکەم گەیاندە لای حەسەن و پێم وت : وا خانووەکەمان بە کرێ گرت .

هەر ئەو ئێوارەیە مامۆستا گواستیەوە بۆ ناو ئەو خانووە، کاتێك، کە ئەڵێم گواستمانەوە بۆ ناوی ، ئەوەی ئێمە گواستمانەوە بۆ ئەوێ بریتیی بوو: لە چەند شتێکی یەکجار سادە ، وەك سەبەتەی نان و مەسینەی دەست نوێژ ، ئیتر وەك خەڵکی تری ئەهلی دنیا کەل و پەلی نەبوو ..

حەسەن لەوێ چاوەروانمان بوو .. مامۆستا کەوتە قسە لەگەڵیا :

ـ وەستا حەسەن ! وەرە بۆ ئێرە

حەسەن لەوپەری خەجاڵەتییدا هات بۆ لای و وتی :

ـ بەڵێ ، مامۆستا گیان !

ـ ئایا عەرەق ئەخۆیتەوە ؟

ـ بەڵێ گەورەم .. بەیانیی و ئێوارە ئەی خۆمەوە

مامۆستا دەستی بەرز کردەوە و خستیە سەر پشتی حەسەن و سێ جار دەستی بە پشتیا هێنا و وتی :

ـ ئادەی کورەکەم .. بە ئیزنی خوا لەمە رزگارت ئەبێت .

ئەو پیاوەی، کە بەیانیان و ئێواران دەستی لە عەرەق خواردنەوە هەڵ نەئەگرت، نوێژی فەجری ئەو رۆژەی لەگەڵ مامۆستادا بەجێ هێنا و ، دوای ئەوە ئیتر بە هیچ شێوەیەك تامی عەرەقی نەکرد ، بەڵکو لەسەر نوێژکردن لەگەڵ مامۆستادا بەردەوام بوو .. ئای، کە جێی سەرسورمانە ! ئەو حەسەنەی، کە دەربارەی دین یان

نوێژ هیچی نەئەزانیی چۆن بەو جۆرە گۆڕرا !! هەرگیز ئەوەم بە بیردا نەئەهات، لەبەر ئەوە مامۆستام بەلاوە زۆر گەورە بوو .[٢٧٣]

مامۆستا باسی ئەو ژوورەی ئەکات، کە لە ئەمیرداغدا بە دەست بەسەریی تیایا ئەژیا و ، لەلایەن کاربەدەستانەوە چاودێریی ئەکرا ، بە رادەیەك نارەحەت ئەبێت، ئاوات ئەخوازێت، کە خۆزگە هەر لە بەندیخانەکەی دەنیزلییدا بوایە ، یان مردن و چوون بۆ ناو قەبر لەوە چاکترە ، هەتا دەری ئەبڕێت، کە ڕۆژێکی ئەو جۆرە ژیانە ئەوەندەی مانگێکی بەندیخانەی تاکەکەسیی سزا و ئازاری ئەدات ، چونکە لەو زستانە سەختەدا و لە تەمەنی پیرییدا و لەوپەری لاوازیی و کەم هێزییدا هەموو خزمەتێکیان لێ قەدەغە کردووە ، سەرەرای ئەوەی، کە نزیکەی بیست ساڵە ئەمە حاڵ و گوزەرانیەتی .[٢٧٤]

مامۆستا لە زۆر شوێنی پەیامەکاندا دەری ئەبڕێ، کە ڕێکخراوەیەکی نهێنیی دژایەتیی ئەم ئەکات و ، ترس و لەرزی بردۆتە ناو دڵی بەشێك لە فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە تا لێی بترسن و ، بە کەسێکی مەترسییداری لە قەڵەم بدەن، جا دەریشی ئەبڕێت، کە هەر کاریگەرییەك لە گۆڕێدا بێت ئەوە لە بەرەکەتی قورئانەوەیە و بەس .. هەر خێر و بەرەکەتێکیش لە پەیامەکانەوە دەستگیر ببێت بۆ ئاسوودەیی میللەت و پایەداریی نیشتمانە و ، پەیامەکان نابنە مایەی زیان بۆ هیچ کەسێك .. هەتا ئەوەبوو خەڵکێکی زۆر لە بەندییە تاوانبارەکان بە تێکەڵیی قوتابییانی نوور تەوبەیان کرد و ، روویان کردە خوا و ، بە چاکیی دەستیان دایە

[٢٧٣] رجل القدر : ٢١٤ ـ ٢١٧
[٢٧٤] سيرة ذاتية : ٣٥٧ ، رجل القدر : ٢١٨

خواپەرستیی، هەتا ئەوەبوو بەڕێوەبەری بەندیخانە دەری بریی، کە بەندیخانەکەیان بۆتە قوتابخانەیەکی پەروەردەیی .[٢٧٥]

مامۆستا بۆ دەوڵەتی روون ئەکاتەوە، کە هەموو مافێکی مرۆڤانەی پێ شێل کراوە و ، ئەمەش ئەوپەری زوڵم و ستەمە، کە لە میللەت ئەکرێت، چونکە پەیامەکانی نوور مایەی قازانجن بۆ ئوممەتی ئیسلام و ، هەتا پاگەندە دژی خۆی و پەیامەکانی بکرێت میللەت چاکتر باوەشی خۆشەویستیی بۆ نووری قورئان ئەکاتەوە

هەروایش بوو، ئەوەبوو لە ئەمیراغدا بنەماڵەی چالیشقان بە گەورە و بچووکیانەوە بوونە خزمەتگوزاری مامۆستا و بە هەموو شێوەیەك چاودێرییان ئەکرد و ، باکیان لە هەڵوێستی دەوڵەت نەبوو ، ئەگەرچیی پاسەوانی دەوڵەت ساتێك دەرگای ماڵەکەی مامۆستای بەجێ نەئەهێشت .[٢٧٦]

لە راستییدا مامۆستا لە هەموو شوێنەکان‌دا ستەمی لێ ئەکرا ، بەڵام ئەو سزا و ئازارەی، کە لە ئەمیرداغدا ئەی چەشت وێنەی نەبوو .. چونکە ئەوەبوو لە ماوەی بیست ساڵدا ، بەر لەوەی بێتە ئەمیرداغ ، سەری لە کاربەدەستان نەئەدا و، جگە لە تاقە جارێك بانگ نەکرا بۆ لای والیی ، کەچیی لە سێ ساڵ و نیوی ئەمیرداغ دا پانزە جار لە لایەن کاربەدەستانەوە بانگ کرا و ، لەو ماوەیەش‌دا یەك لە دوای یەك سکاڵای ئەخستە بەردەم لێ پرسراوان و ، ئەو ستەمەی باس ئەکرد، کە لێی ئەکرا .. جارێك بۆ وەزیری ناوخۆ و ، جارێك بۆ بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش و ، جارێك بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی ئافیوون و ، جارێك بۆ سەرۆکی

---

[٢٧٥] سيرة ذاتية : ٣٥٨

[٢٧٦] سيرة ذاتية : ٣٥٨ ـ ٣٥٩

ئەنجومەنی ئوممەت و ، جارێك بۆ كاربەدەستانی ئانقەرە و ، جارێـك بـۆ سـەرۆك كۆمار و ، جارێك بـۆ ( مـدعي عـام ) و ، جـارێكیش بـۆ دادوەری تـەحقیقیی ئەمیراغ .[٢٧٧]

لە كاتی گونجاودا مامۆستا هات و چۆی مزگەوتی ئەكرد ، كەچیی ئەفسـەری ئاسایش بە رەسمیی پێی را ئەگەیەنێت، كە نابێت هات و چۆی مزگەوت بكـات، ئەویش بریار ئەدات، كە نەچێت .[٢٧٨]

بە پێی دانپیانانی پزیشكی دەوڵەتیی لە ئەمیرداغ كە دكتۆر ( طاهر بارچن ) بوو ، هەوڵ دراوە مامۆستا دەرمان خوارد بكرێت، ئـەوەبوو دەسـتێكی چـەپەڵ ژەهری كردە ناو خۆراكەوە بۆی و ، مامۆستای تەمەن لـە حـەفتا سـاڵیی زیـاتر حەفتەیەكی تەواو بە دەست ئێش و ئازارەوە ئەتلایەوە ، تا خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی شیفای بۆ نارد، ئەم كارە لەلایەن یەكێ لە پاسـەوانەكانەوە ئـەنجام دراو ، كاربەدەستانیش ئاگاداربوون و ویستیان زانای خواناس لـە كـۆڵی خۆیـان بكەنەوە، لە ماوەی ئەو حەفتەیەدا مامۆستا شتێكی ئەوتۆی پێ نەخورا، بەڵكو بەردەوام خەریكی خوێندنی ویردەكـان بـوو، بـە تایبـەت ( الجوشـن الكـبير ) و ( الأوراد القدسـية ) ی شاهی نەقشبەند، ئەم ژەهر دەرخوارددانە سێ جار ئەنجام درا ، بەڵام سێهەمیان زۆر توند بوو ، بە رادەیەك، كە مامۆستا كەوتە جێگاوە و، جگە لە نوێژە فەرزەكان هیچی تری پێ ئەنجام نەدرا

دوان لەو قوتابیانەی، كە سەروكاریی مامۆستایان ئەكرد ئەگێرنەوە، كـە لـە یەكێ لە رۆژانی ئەو نەخۆشییەیدا ، لە كاتی فەجردا ، لەسەر نوێنەكانی خۆی رێك

---

[٢٧٧] سیرة ذاتیة : ٣٥٩ ( ب ٢ / ١٢٠٦ ) .

[٢٧٨] سیرة ذاتیة : ٣٥٩ ، رجل القدر : ٢١٧

ئەكات و ، بە چاوی نوورقـاوەوە و بـە دەنگێكـی یـەكجار نـزم بـۆ سـەركەوتنی بانگەوازی نوور و سەلامەتیی و بێ وەیی قوتابیانی نوور لە خوا ئەپارێتەوە ، ئیتر دوای ئەوە بێ هۆش ئەكەوێت و ئەكەوێتە جێگاوە [٢٧٩]

مامۆستا پێویستیی بە هەوای پاك ئەبوو ، بۆیە لە هاوین و بەهاردا ئەچـووە دەرەوە بۆ ناو باخ و باخاتـە نزیـك و دەشـت و دەرە سـەوزەكان و ، پۆلیسـێكی چاودێریش دوای ئەكەوت ، بۆ ئەوەی لە هەموو جم و جۆوڵێكی ئاگادار بن، هەتا جارێكیان گوللەیەكیان لە دواوە تێ گرت ، بەلاّم نەپێكرا

كاربەدەستان بە شێوەیەكی تریش سزا و ئازاری مامۆستایان ئەدا ، ئەویش بە بیانووگرتن دەربارەی ئەو جل و بەرگەی، كە لە بەریدا بوو .. ئەیانویست جـل و بەرگی عوثـمانیی دابكەنێت و مێزەرەكـەی سـەری لابـەرێت و ، جـل و بـەرگی ئەورووپیی لەبەر بكات و شەبقەی گاورانیش لەسەر بكات، هەتا دوو جار لەسـەر ئەوە بانگ كراوەتە دادگا و فەرمانی بەسەردا دراوە جـل و بـەرگی نـوێ لەبـەر

---

[٢٧٩] سیرة ذاتیة : ٣٥٩ ـ ٣٦٠ ، رجل القـدر : ٢١٧ . دەوڵەت لە زۆربەی شوێنەكاندا هەوڵی داوە مامۆستا دەرمان خوارد بكات، كە ئەمە هەوڵەكانیەتی :

١ ـ لە ئانقەرە ، لە ساڵی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ ، لە ئەنجومەنی نوێنەراندا بە دەرزیی .

٢ ـ لە بەندیخانەی ئەسكی شەهر ساڵی ١٩٣٥

٣ ، ٤ ، ٥ ـ لە قەسطەموونیی ساڵی ١٩٣٦ ـ ١٩٤٣

٦ ، ٧ ، ٨ ـ لە بەندیخانەی دەنیزلیی ساڵی ١٩٤٣ ـ ١٩٤٤ كە ئەوەبوو لە ژەهر پێدانی سێهەم دا حـافـیظ عەلیی شەهید بوو .

٩ ، ١٠ ، ١١ ـ لە ئەمیرداغ ساڵی ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ كە ئەوەبوو لە ژەهرپێدانی سێهەمدا حەسەن فـەیضـیی شەهید بوو . ( ب ٢ / ١١١٩ ) ، سیرة ذاتیة : ٣٦٠

بکات، کەچیی مامۆستا ئەو فەرمانەی ئەدایــە دواوە و ئەگەرایــەوە ژوورەکــەی خۆی .[٢٨٠]

لەگەڵ ئەو هەموو سزا و ئازارەدا خوای گەورە دڵی مامۆستای ئەدایەوە ، هەتا ورە بەر نەدات و لەسەر کاری پیرۆزی بەردەوام بێت ..

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٤٦دا ئامێری ڕۆنیۆ بۆ چاپ‌کـردن هاتــە تورکیــاوە و ، قوتابیانی نووریش مەردانە هەڵمەتیان دا و ، ئامێرێکیان کریی و لە ئیسپارتە و ئینۆبۆلییدا قوتابیان چالاکانە دەستیان بە چاپ‌کردنی پەیامەکان کرد و ، هەوڵیان دا بیان‌گەیەننە زۆربەی گوند و شــارەکانی تورکیــا .. ئــەو ئــامێرە بــە جارێــك (٥٠٠)پێنج صەد نوسخەی لە پەیامەکان چاپ ئەکرد و ، مامۆستاش ئەم کارەی بە فتووحاتی خوایی ئەزانیی، کە پێشکەش بە پەیامــەکانی نــووری کــردووە و ، هەزار و یەك جار سوپاسی خوای ئەکرد[٢٨١]

ئەوەندە توند و تیژیی و ستەم دەرهەق بە مامۆستا بەکار هێنرا ، ناچـار بــوو نامەیەك بۆ بەڕێوەبــەری گشــتیی هێــزی ئاسایشــی نــاخۆی پارێزگــای ئــافیوون بنوسێت،کە شارۆچکەی ئەمیرداغ سەر بەو پارێزگایەیە، لە نامەکەیدا ئەنووسێت :

نازانم بۆ گوێ بەو موعامەلە نایاسایی و بێ ویژدانییە نادەیت، کە من پێوەی گیرۆدە بووم و ، هەتا ئێستا هاوشێوەی ئەوە نەبینراوە ، بۆ نموونە : کە ئەمەوێت بچم بۆ مزگەوت ، ئەویش لەو کاتانەدا، کە خەریکە چۆڵ بێت تا پاداشتی نوێژی جەماعەتم لەگەڵ چەند کەسێکی کەم‌دا دەست‌گیر ببێت ، ئەوا فەرمان دەرئەچێت و بە شێوەیەکی قەطعیی چوون بۆ مزگەوتم لێ قەدەغە ئەکات .. چ یاسایەك ئەم

[٢٨٠] سيرة ذاتية : ٣٦٠ ، رجل القدر : ٢١٧

[٢٨١] سيرة ذاتية : ٣٦٠

موعامەلە دەرهەق بە کەسێك رێ پێ ئەدات، کە بە دەست غەریبیی و نەخۆشیی و پیریی و دەستکورتییەوە بنالێنێ ؟! ئەوە چ بەرژەوەندییەکی تیایە؟! پاشان دۆستایەتیی چەند کەسێك، کە لە چەند کاروبارێکی پێویستمدا یارمەتییم ئەدەن چیی تیایە ، کە من ـ هەر وەك لە بەندیخانەی تاکەکەسییدا بم ـ لە ژوورێکی سارد و لە بارودۆخێکی غەریبایەتیی و نەخۆشیی و هەژاریی و پیرییدا ئەژیم ؟ چ یاسایەك ئەوە قەدەغە ئەکات ؟! چ یاسایەك پەیوەندی کردنم بە کەسێك یان دوو کەسەوە لێ قەدەغە ئەکات ، کە پێیان خۆشە هەندێ خزمەت گوزاریی پێویستم بۆ جێبەجێ بکەن ، کە خۆم ناتوانم جێ بەجێیان بکەم؟![٢٨٢]

کاربەدەستان هەوڵیان ئەدا هەموو ئازادیی و سەربەستییەك لە مامۆستا زەوت بکەن ، بەلاّم هەتا ئەهات خەڵکەکە مامۆستایان خۆش ئەویست و ، بە دڵ و بە گیان کەڵکیان لە نووسینەکانی وەرئەگرت .. چەندە دەوڵەت دژایەتیی مامۆستای ئەکرد ، لەوە زیاتر مامۆستا لە دڵی خەڵکییدا جێی خۆی کردبۆوە، ئەگەرچیی هەندێك لە ترسی دەوڵەت ئەو خۆشویستنەیان دەرنەئەبریی .

بۆ نموونە : دەوڵەمەندێکی شاری ئەمیرداغ، کە بازرگانی فەرش بوو ئوتومبێلێکی خستە خزمەتی مامۆستاوە هەتا بی گەیەنێتە کێڵگە و باخەکانی دەوروبەری ئەمیرداغ ، کە ئەگەر بە پێ بۆیان بچوایە چەند سەعاتێکی پێ ئەچوو و، دیارە ئەو هەموو رێگایە بۆ پیاوێکی تەمەن حەفتاساڵیی بە نارەحەت ئەبررێت .

کاربەدەستان بەم رەفتارەی ئەو موسڵمانە دەوڵەمەندە تووڕە بوون .. ئەوەبوو گرتیان و دایان بە دادگا و لەوێ پرسیاریان لێکرد :

---

[٢٨٢] رجل القدر : ٢١٧ ـ ٢١٨

ـ ئایا ئەو ئوتومبێلەت پێشکەشی کردووە ؟
ـ بەڵێ ، ئەو ئوتومبێلەم پێشکەشی کردووە خۆ ئەگەر تۆ توانییت بچیتە دڵمەوە و خۆشم ویستی ، ئەوا من ئامادەم فرۆکەیەکت بۆ بکرم ! بگرە من ئامادەم سامانەکەم هەر هەمووی لە پێناوتا خەرج بکەم ..[٢٨٣]

نەك هەر خەڵکەکە ، بەڵکو کارمەندانی دەوڵەتیش ، بە تایبەت ئەو پۆلیسانەی، کە تێکەڵیی مامۆستایان ئەکرد ، بە پیاوێکی موبارەکیان ئەزانی ، بۆیە لە قووڵایی دڵیان‌دا خۆشیان ئەویست ، ئەگەرچیی دانرابوون چاودێریی بکەن .

لە پێشەوە باسی ئیبراهیمی پۆلیسمان کرد، کە خانووی بەکرێ گرت بۆ مامۆستا .. ئەو پۆلیسە لە کۆتایی سەردەمی مانەوەی مامۆستادا لە ئەمیرداغ لە بیرەوەرییەکانیدا ، کە مامۆستا رەوانەی دادگای ئافیوون ئەکرێت ، ئەڵێت :

چاوەروان ئەکرا مامۆستا بدرێت بە دادگا ، لەبەر ئەوە جەماوەرێکی زۆر لە هەموو کون و قوژبنێکەوە هاتبوون بۆ ئافیوون .. شەقام و کۆڵانەکان ، بە وێنەری رۆژی مەحشەر ، پر بوون لە خەڵك مامۆستاش ، هەروەك پیاوکوژێکی خوێن رێژ بێت و ، دەیان کەسی کوشتبێت ، ئەبرا بۆ دادگا منیش تا ئەو کاتە لە خزمەت‌دا بووم .. لە ناکاودا لەگەڵ مامۆستا نوورسییدا رووبەروو بوومەوە و ، خێرا سەلامی سەربازییانەم بۆ کرد .. تا لەو کاتەدا یارمەتییدەری هێزی ئەسپ سواران تێپەری کرد .. هەر کە دیمی سەلامم لە مامۆستا کرد قیڕاندی :
ـ سەربازان ! ئەو پۆلیسە بگرن !

---

[٢٨٣] رجل القدر : ٢١٩

گرتـــميان و ، بردميـــان بـــۆ ژووری فەرمانـــدە .. یارمەتییـــدەر دەســـتی بـــە گێڕانەوەی باسەکە کرد و وتی :

ـ ئەم پۆلیسە سەلامی لە ( بدیع الزمان ) کرد

فەرماندە لە یاریدەدەرەکەی زۆر خراپتر بوو .. هەرکـە ئـەوەی بیسـت ، وەك شێت هەڵ چوو و ، خەریك بوو مووی خۆی هەڵ ئەکێشا و ، پێمی وت :

ـ ئایا راستە سەلامت لە ( بدیع الزمان ) کردووە ؟

وتم : بۆچ من کەسێکی کافرم و دینم نیە ؟ من موسڵمانم ..

وەك شێت قیراندی : درێژی بکەن بۆ فەلاقە

درێژیان کردم بۆ فەلاقە کردن ..

هەرچی داریان لە قاچم ئەدا هاوارم ئەکرد :

ـ مادەم سەلامم لە مامۆستا کردووە و قسەم لە گەڵیا کردووە ، چیتان پـێ خۆشە بیکەن .

بەم قسانە زیاتر رقیان ئەجویی و هاواریان ئەکرد :

ـ کەسێکی سەربازیی بۆی نیە سەلام لە مامۆستا بکات .

منیش وەڵامم دانەوە: بەڵکو بۆی هەیە .. بۆچ ئێوە کەسێکی سـەربازیی بـە چیی ئەزانن ؟ ئایا موسڵمان نیە ؟

دوای لێدانەکەش بۆ مـاوەی حەفتەیەك بەندیان کردم .[٢٨٤]

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٧دا حکومەت لە پارێزگای ئافیوونـەوە سـێ پۆلیســی نهێنیی ، بە ناوی کرێکاری کارەباوە ناردن بۆ ئـەمیرداغ ، کـە عەبـدوررەحمان و حەسەن و صاڵحیان ناوبوو ، بـە نیـازی ئـەوەی دەربـارەی مامۆسـتا نوورسـیی سیخوریی بکەن، جا جگە لە فەرمانداری ئەمیرداغ و فەرماندەی ژاندرمە هیچ کەس بە حاڵی ئەمانەی نەئەزانیی

---

[٢٨٤] رجل القدر : ٢١٩ ـ ٢٢٠

پۆلیسەکان بە دەوری ماڵەکەی مامۆستادا ئەخولانەوە و هات و چۆیان ئەکرد، گوایە ئەیانەوێ گیروگرفتی کارەبای ئەو ناوچەیە چارەسەر بکەن، دوای چەند سەعاتێك لە چاودێریی لە قاوەخانەیەکی بەردەم ماڵەکەی مامۆستادا دانیشتن و خۆیان وەها پیشان دا کە خەریکی قومارکردن و چا خواردنەوە بن ..

دوای ماوەیەکی کەم یەکێك لە قوتابییانی نوور ، کە بەرێز جایلان چالیشقان بوو، هاتەلایان و ، سەلامی لێ کردن و ، پێی راگەیاندن، کە مامۆستا ( بدیع الزمان ) بانگیان ئەکات تا سەرێکی لێ بدەن لە ماڵەکەیدا

پۆلیسە هەواڵ دەرەکان واقیان ور ما و ، بە سەرسورمانەوە سەیری یەکترییان ئەکرد ، پاشان یەکێکیان بە جایلانی وت : ( بدیع الزمان ) کێیە ؟

وەلآمی دایەوە : وا لەو خانووەدا نیشتەجێ بووە، کە لە بەرامبەری قاوەخانەکەدایە، بانگتان ئەکات و پێی خۆشە چاوی پێتان بکەوێت .. عەبدوررەحمانی سەرۆکی پۆلیسەکان وای بە چاك زانیی ئەم پێشنیارە نەدەنە دواوە، ئەوەبوو حەسەنی هاوەڵی بە تەنیا نارد بۆ لای مامۆستا

حەسەن چووە ژوورەوە لای مامۆستا و ، ئەویش بەخێرهاتنی کرد و، دەربارەی فەرمانبەرییەکەی پرسیاری لێ کرد و ، حەسەنیش تێی گەیاند، کە کرێکاری کارەبایە

مامۆستا دەربارەی حەقیقەتە ئیمانیی و رەوشتییەکان، کە لە پەیامەکانی نووردا هەن دەستی بە باسێکی نایاب کرد و تێی گەیاند، کە ئەم مانایانە چاودێرێکی مەعنەویی لە دڵ و دەروونی مرۆڤ دا پێ ئەگەیەنێت، کەواتە پەیامەکانی نوور رۆڵێکی گرنگیان هەیە بۆ پەخش کردنی ئەمن و ئاسایش لە سەرانسەری وڵآتدا

پۆليسە نهێنييەكە سەری لەم فەرمايشتانەی مامۆستا سـور ئـەما و ، ئـەوە ئەهات بە دڵيدا، كە ئايا مامۆستا نوورسيی لە سروشتی كارەكەيان ئاگادارە ؟ جا كێ ئاگاداری كردبێت ؟ هەرچۆن بوو حەسەن بە فەرمايشتەكانی مامۆستا كـاری تێ كرا و ، كە گەرايەوە لای هاوەڵانی ئەوانيشی ئاگادار كرد [٢٨٥]

لە ماوەی مانەوەی مامۆستا لە ئەميرداغ، كە سێ ساڵ و نيوی خاياند چـەند پەيامێكی دانا وەك :

١ ـ مەسەلەی يانزەهەمينی پەيامی بـەری درەختـی ئيمـان، كـە دەربـارەی بەروبوومی ئيمان بە مەلائيكەت ، ساڵی ١٩٤٥

٢ ـ ئۆمێدی چواردەهەم لە بريسكەی بيست و شەشەم، كە بريتييە: لە سەرنج و تێ رامانەكانی لە ئايەتی پيرۆزی ﴿ حَسبُنَا اللهُ وَنِعمَ الْوَكِيلُ ﴾ .

٣ ـ ئۆمێدی شانزەهەم لە بريسكەی بيست و شەشەم دەربارەی نەفيكردنی بۆ قەسطەموونيی و رووداوەكانی دواتر .

٤ ـ نزيكەی ( ٢٥٠ ) پەيامی ئامۆژگاريی بۆ قوتابييەكانی .

٥ ـ پەيامێك دەربارەی دووبارەبوونەوەی فەرمايشتەكانی قورئان ، كە ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٣٢دا مامۆستا بەرگوێی كەوت، كە زينديقێكی بێ دين دڵ پيسـيی خۆی ئاشكرا كردووە و دەستی داوەتە تەرجەمەی قورئانی پيرۆز بۆ سووك كردنی قورئان، بەڵام بە كۆمەكيی خوا پەيامەكانی نوور توانييان ئەو نەخشە گڵاوە لەبار ببەن ، چونكە دەسەڵات داران ويستبوويان لەسەر خەڵكەكەی فەرز بكەن لە نوێژدا ئەو تەرجەمەيە بخوێنرێت .. [٢٨٦]

مامۆستا بوو بووە خۆشەويستی هەمووان .. لە هەموو لايەكەوە خەڵك رووی لە ئەميرداغ ئەنا بە هيوای چاو پێ كەوتن و بەخزمەت گەيشتنی مامۆستا ، بەڵام

---

[٢٨٥] رجل القدر: ٢٢٠ ـ ٢٢١

[٢٨٦] سيرة ذاتية : ٣٦٣

کەمێکیان بۆیان رێك ئەکەوت سەردانی بکەن ، چونکە دەوڵەت زۆر بــە تونــدیی چاودێریی مامۆستای ئەکرد، ئەوانەی، کە بە خزمەتی ئەگەیشتن مامۆستا بە پێی ئاســتی خۆیــان ئــەی دوانــدن و ، دەربــارەی مەســەلە ئیمانییــەکان لەگــەڵیان

[287] سيرة ذاتية : ٣٦٤

بەشی دوانزەهەم

# لە بەندیخانەی ئافیوون دا

## *قوتابخانەی یووسفیی سێهەم*

٢٨ / ١ / ١٩٤٨ ـ ٢٠ / ٩ / ١٩٤٩

لەگەڵ ئەوەدا، کە دەسەلاتداران مامۆستا و قوتابیی و میوانەکانی مامۆستایان خستبوونە ژێر چاودێرییەوە و ، نەیان ئەویست پەیامەکان دەوری خۆیان ببینن ، کەچیی بە چاوی خۆیان کاریگەریی و پەرەسەندنی پەیامەکانیان ئەدیی و ، ئەیانزانیی لە سەرانسەری تورکیادا بلاوەیان کردووە و ، خەڵکێکی دیندار باوەشی خۆشەویستیی بۆ کردوونەتەوە ، بە تایبەت دوای دەرچوونی بریاری بێ تاوانیی بۆیان لە دادگای دەنیزلییەوە کاربەدەستان کەوتنە بیری ئەوە، کە پێویستە کارێکی وەها ئەنجام بدەن چالاکیی و پەرەسەندنی پەیامەکان بوەستێنن، چونکە لق و پۆپیان بۆ هەموو گوند و شار و شارۆچکەیەك هاویشتووە و ، هەموو چینەکانی گەلی موسڵمان بە سەرباز و کارمەند و قوتابیی و بازرگان و کاسپ کارەوە سەرگەرمی خوێندنەوەیانن و ، خەریکن خۆیان پێ یان پەروەردە ئەکەن .

ئەوەی، کە زیاتر رقی کاربەدەستانی هەڵ ئەساند ئەو سەرکەوتنە بێ وێنەیە بوو، کە ئەو چالاکییە قورئانییە بە دەستی ئەهێنا، بێ ئەوەی تاقە قوتابییەك دەست بداتە کارێکی نایاسایی هەتا دەوڵەتیش بیانووی دەست بکەوێت و لێیان بدات.. بۆ ئەو هەموو پەرەسەندنە تاقە کەسێکیان گوللەیەکی نەتەقاند ، یان ئاژاوەیەکی بەرپا نەکرد ، یان رێ پێوانێکی نەکرد ، یان کۆمەڵەیەکی سیاسیی پێك نەهێنا.. دەوڵەت لە هەلێك ئەگەرا تا ئەو بەرێزانە تاوانبار بکات ، بەلام

مامۆستا نەخشەیەکی وەها جوانی بۆ کارەکەی کێشا بوو، ماوەی نەئەدا خۆی و قوتابیانی هەڵەیان لە دەست دەربچێت، ئەوپەری غیرەتیان ئەکێشا و دانیان بە خۆیاندا ئەگرت و ، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەئەدا ..[٢٨٨]

دوژمنانی پەیامەکانی نوور، کە ئەو سەرکەوتنەیان بە پەیامەکانەوە ئەدیی، دڵیان بەرگەی نەئەگرت ، بۆیە هەندێ لە کاربەدەستانی دەوڵەتیان لە دژیان هەڵ نا .. ئەوەبوو جارێکی تر ژیان قورس و نارەحەت بوویەوە ، بەڵام خـوای خـاوەن سۆز گەیشتە فریای مامۆستا و قوتابیەکانی .. ئەوەبوو کاربەدەستان بەوپەری شەوق و تاسەمەندییەوە ، دەستیان دایە خوێندنەوەی پەیامەکان و ، کەڵکێکی چاکیان لێیان وەرگرت و ، زۆر بە چاکیی دڵیان بۆ ئامۆژگارییەکانیان نەرم بوو .. بەمە بازنەی قوتابخانەکانی نوور فروان تر بوو، چونکە لە جیاتیی رەخنە گـرتن کەوتنە ستایشی پەیامەکان ..

ئەمەش صەد قاتی زیانە ماددییەکان کەڵك و سوودی بۆ پەیامەکان هەبوو و، بووە مایەی رەوینەوەی خەم و خەفەتی مامۆستا و قوتابیەکانی ..

دوای ماوەیەکی کەم موونافیقەکان کەوتنەوە پیلان گێران .. ئەوەبوو دەوڵەتیان لە دژی مامۆستا خۆی هەڵ نا ، کە گوایە ئەم پیاوە لە ساڵانی رابوردوودا دەستی لەگەڵ سیاسەتدا تێکەڵ کردووە و ، مەترسیی لێ ئەکرێت، بەم بۆنەوە حکومەت دەستی دایە گرتن و تەنگ پێ هەڵ چنینی قوتابیان و ، دەست بەسـەردا گرتنـی پەیامەکان، بەمە جارێکی تر چالاکیی قوتابیانی نوور وەستایەوە

هەرچەندە هەندێ کاربەدەست و کارمەندی حکومەت هەوڵیان ئەدا کەسایەتیی مامۆستا تێك بشکێنن ، بەڵام هەر هەوڵێکیان دا بێ هوودە بوو، و سەرشۆڕیی

---

[٢٨٨] رجل القدر : ٢٢١ ـ ٢٢٢

نەبێت هیچیان دەست نەکەوت و ، نەشـیان تـوانیی قەناعـەت بـە هـیچ کـەس بکەن .. لەگەڵ ئەوەش‌دا مامۆستایان بۆ مـاوەی دوو رۆژ بـە بیـانووی هـیچ و پووچەوە خستە بەندەوە .. بـە تـەنیا خسـتیانە هـۆڵێکی گـەورەوە، کـە جێـی شەست(٦٠) کەسی تێدا ئەبوویەوە ، کە دنیا وەك زەمهەریر سارد بوو و ، بـەفر هەموو شوێنێکی داپۆشیی بوو .. بە مـەرجێ مامۆسـتا بـە بۆنـەی لاوازیـی و پیرییەوە بەرگەی ئەو سەرمایەی نەئەگرت ، چونکە ئەو لە ماڵەکـەی خۆیـدا لـە ئەمیرداغ بەردەوام ئاگری ئەکردەوە و ، رۆژانە چـەند جـارێکیش زۆپاکـەی هـەڵ ئەکرد[٢٨٩]

دەوڵەت هەوڵی زۆری دا تاوان بۆ مامۆستا و قوتابیەکانی بدۆزێتەوە ، کەچیی هیچی دەست نەکەوت ، ناچار پەنای بردەوە بەر تاوانە پێشووەکان، کـە بریتیـی بوون لەم تاوانانە :

١ ـ پێك‌هێنانی کۆمەڵەیەکی سیاسیی .

٢ ـ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونی دژ بە رژێمی کاربەدەست ..

٣ ـ دواکەوتنی مەبەستێکی سیاسیی دیاریکراو ..

٤ ـ برینی سیفەتی دەججالی سوفیانیی بەسەر موصطفا کەمال‌دا

جا بۆیە ئەو پاگەندانە بە ناو خەڵك‌دا بڵاو ئەکرانەوە ، تا دەوڵەت بۆی هـەبێ دەستیان بۆ بەرێت و بەندیان بکات .

ئەوەبوو دەوڵەت مامۆستا و پانزە قوتابیی لە ئەمیرداغ دەسـت گـیر کـردن و بەرەو دادگای جەزای گەورەی ئافیوون رەوانە کـران و ، لـە پارێزگاکـانی تـریش ژمارەیەك لە قوتابیانی نوور گیران و ئـەوانیش رەوانـەی لای مامۆسـتا کـران و

---

[٢٨٩] سیرة ذاتیة : ٣٨٣ ـ ٣٨٤ ، رجل القدر : ٢٢٢ ـ ٢٢٣

ژمارەی هــەر هــەموویان ئەگەیشتە (٤٨)چل و هەشت کەس و ، هەر هەموویــان لــە ٢٣ / ١ / ١٩٤٨ خرانە بەندیخانەوە [٢٩٠]

دوای لێکۆڵینەوەی رەسمیی، کە یەکجار توند بو، هیچ ماددەیــەکیان دەســت نەکەوت تا تاوانباریان بکەن ، کەچــیی بــە قەناعــەتی حــاکم دادگــا بریــاری دا مامۆستا نوورسیی بیست مانگ بەند بکرێت و ، زانایەکی بەرێزیش هەژدە مانگ و، (٢٢)بیست و دوو قوتابییش هەر یەکــە شــەش مــانگ و ئــەوانی تــریش لــە ٦ / ١٢/ ١٩٤٨ دا ئازاد کران .

بەرامبەر بەم بریارە کوێرانەیە مامۆستا و قوتابیەکانی رەخنــەیان گــرت تــا دادگای تەمییز بریار بدات، بەڵام دادگا جارێکی تر دەستی بە لێکۆڵینەوەی بێ تاوانەکان کرد و ، قوتابیانیش داوایان لە دادگای ئافیوون کــرد، تــا بریارەکــەی دادگای تەمییز جێبەجێ بکات، بەڵام دادگا ئەوەندە خۆی خلافاند هەتا مامۆستا و قوتابیەکانی حوکمە ناهەقییەکەیان بەسەر برد ، هەرچەندە بێ تاوانیش دەرچوون بوون !

دواجــار لــە ٢٠ / ٩ / ١٩٤٩دا مامۆســتا بــەر درا ، بــەڵام کاربەدەســتانی بەندیخانە لە کاتی ئاساییدا بەریان نەدا، کە سەعات 10:00دەی سەر لە بەیانییــە. نەوەکو خەڵکێکی زۆر لە دۆستانی مامۆستا لەبەردەم بەندیخانــەدا کۆببنــەوە و، خۆشەویستیی ئەو پیشان بدەن ، بۆیە لەگەڵ ژمارەیەك لە قوتابیانی و لەگەڵ دوو

---

[٢٩٠] سیرة ذاتیة : ٣٨٤ ، بەڵام لە ( رجل القدر ) دا ل ٢٢٢ هاتووە، کە لە پارێزگاکانی ئیسپارتە و ، دەنیزلیی وئایدن و ، قەستەموونیی و ، ئینەبۆلیی و ، ئافیوون دا(٥٤) پەنجا و چوار قوتابیی گیراون و لە ژێر پاسەوانییەکی توندا و لە سەرما و سۆڵەی زستان دا رەوانەی بەندیخانەی ئافیوون کراون .

پۆليس دا لە كاتی بەرەبەيان دا بەر دران و ، مامۆستا برايە خانوويەكەوە، كە بۆی ئامادە كرابوو .[٢٩١]

لەو كاتەدا دەسەلاتی ولات كەوتە دەست پارتی ديموكرات و ، ئەويش چاوپۆشيی گشتيی راگەياند، بەلام دەستەی دادگای ئافيوون پەيامەكانی نووری ئازاد نەكردن، بەلكو لەسەر برياری دەست بەسەردا گرتن بەردەوام بوو، بەلام دادگای تەمييز برياری دادگای ئافيوونی دايە دواوە و ، دادگای ئافيوونيش ناچار بوو دەست لەو بريارە هەلّ بگرێت و پەيامەكان ئازاد بكات، بەلام دادگای تەمييز داوای لە سەرۆكايەتيی كاروباری دينيی كرد، كە وردبينيی پەيامەكان بكەن و، ئەويش تەقريرێكی چاكی دەربارەيان نووسيی، بەلام ئازادكردنی يەكجارييان تا سالّی ١٩٥٦ی خاياند، ئەوەبوو دادگای ئافيوون بە يەك دەنگيی برياری بێ تاوانيی پەيامەكانی دا و ، پەيامەكان بە ئازاديی چاپ و پەخش ئەكران .

مامۆستا نوورسيی لە بەنديخانەی ئافيوون دا سزا و ئازارێكی بێ سنووری چەشت، كە سزای رۆژێكی ئەو بەنديخانەيە بەرامبەر بە سزای مانگێكی بەنديخانەی دەنيزليی بوو، لەم بەنديخانەيەش دا هەولّ درا مامۆستا دەرمان خوارد بكەن، ئەوەبوو لە بەنديخانە و دەست بەسەرييەكانی پێشەوە يانزە جار هەولّ درا دەرمانی ژەهراويی دەرخوارد بدرێت، لەم بەنديخانەش دا سێ جار هەولّی ژەهرپێدانی درا، و مامۆستا بۆ چەند رۆژێك توانای شت خواردنی نەبوو .. لە هەمان كات دا كاربەدەستان رێيان نەئەدا كەسێك خزمەتی بكات و يارمەتيی بدات ، ئەويش

---

٢٩١ سيرة ذاتية : ٣٨٤ ، رجل القدر : ٢٣٤

پیرێکی بە ساڵا چوو بوو .. هەر جارێکیش، کە لەو هۆڵە گەورەیەدا سەرمای ئەبوو ، تای بە توندیی ئەگرت و ، کەسێکیش نەبوو چاودێرییەکی بکات . [292]

کاربەدەستان هەمیشە ئەگەران بە دوای سەرەداوێكدا هەتا مامۆستا و قوتابیەکانی پێ تاوانبار بکەن ، ئیتر نە شەرم و نە حەیایان بەلاوە نەمابوو:

بۆ نموونە :

لە ماوەی یەك مانگدا ئەو سیخورانەی، کە چاودێریی مامۆستایان ئەکرد هیچ بەڵگەیەکیان دەست نەکەوتبوو، بۆیە چوون تەقریرێکی ساختەیان بەم شێوەیە پر کردەوە : (( خزمەت کارەکەی سەعید چووە لە دووکان عەرەقی بۆ کریوە )) . ماوەیەکی زۆر ئەگەڕێن بەڵکو کەسێکیان دەست بکەوێت ئیمزای بکات،کەسیان دەست ناکەوێت جگە لە کەسێکی غەریبی سەرخۆش ، بە هەرەشەوە داوای لێ ئەکەن تەقریرەکە ئیمزا بکات، ئەویش بە سەرخۆشیەوە ئەڵێت : (( أستغفر الله، کێ ئەتوانێ ئیمزای تەقریری وەها بکات و تەصدیقی درۆی وەها سەیر بکات؟ )) . ناچار ئەی دڕێنن .

نموونەیەکی تریش :

مامۆستا بە بۆنەی نەخۆشییەوە پێویستیی بە هەڵمژینی هەوای پاك ئەبێت ، بۆ ئەمە پیاوێك، کە مامۆستا نەی ناسیوە ئەسپ و عەرەبانەیەکی ئەداتە لا ، تا گەشتێکی یەك دوو سەعاتیی پێ بکات و بچێت بۆ دەرەوەی شار ، مامۆستاش بەڵێن بە خاوەن عەرەبانەکە ئەدات، کە لە کرێیدا بایی پەنجا لیرە کتێبی بداتێ، تا لە یاساکەی خۆی دەر نەچێت و ، نەچێتە ژێر هیچ منەتێکەوە، بۆ ئەم کارە بێ زیانە دایەرەی پۆلیس و ، داد و ، ئەمنی ناوخۆ و ، هەتا پارێزگاریش زیاتر لە

---

[292] سيرة ذاتية : ٣٨٤ ـ ٣٨٥ ، رجل القدر : ٢٢٣

پەنجا جار پرسیویانە، کە ئەم ئەسپ و عەرەبانەیە هی کێن ؟ هەر وەك كارێکی سیاسیی مەترسییدار رووی دابێت و ، ئەمن و ئاسایشی ولات کەوتبێتە مەترسییەوە، بۆ بن بر کردنی ئەو پرسیارە ، پیاوێك ئەڵێت، کە ئەسپەکە هی ئەوە و ، یەکێکی تریش ئەڵێت عەرەبانەکە هی ئەوە و ، فەرمان بۆ گرتنی هەردووکیان دەرچوو و برانە بەندیخانە لای مامۆستا نوورسیی !! [٢٩٣]

وا یەکێك لە قوتابیەکانیشی لە بیرەوەرییەکانیدا دەربارەی بەندیخانەی ئافیوون ئەڵێت :

« لە هەموو شتێك گرنگتر، کە لە بەندیخانەدا پێوەی سەرقاڵ بووین نووسینەوەی پەیامەکانی نوور بوو، هەر کاتێك، کە نزیکی ئەو هۆڵە ئەبووینەوە، کە مامۆستای تێدا بوو دەنگێکمان ئەبیست، کە وەك دەنگی هەنگ بوو .. ئەوە دەنگی مامۆستا بوو، کە خەریکی خوێندنی ویرد و ذیکر و دوعا و نزاکان بوو .. لە هەر سەعاتێکی شەویشدا، کە سەرنجی ژوورەکەیان ئەدا چراکەی داگیرسا بوو و، دەنگیشی بەرگوێمان ئەکەوت، کە ذیکری خوای ئەکرد

هەمیشە مامۆستامان لە یاد بوو، و هەموو کاتێکیش لە هەل ئەگەڕاین تا سەردانی بکەین و ، دەستی ماچ بکەین و داوای دوعای خێری لێ بکەین ، بەلام پاسەوانەکان ئەم جۆرە سەردانانەیان قەدەغە ئەکرد و ، دەستیان ئەدایە لێدان و ئیهانەکردنمان و ئەیان وت: ئێوەش دوای ئەم کابرایە کەوتوون ؟

لەم بەندیخانەیەدا تیشکی پانزەهەم ( الحجة الزهراء ) نووسرا و ، لە کاتی نووسیندا لەبەردەم پەنجەرەکەی مامۆستاوە تێپەرمان ئەکرد، کە مامۆستا چاوی پێمان ئەکەوت پاکەتە شقارتەی بۆمان هەڵ ئەدا ، کە پارچە کاغەزی بچووکی تێ

---

٢٩٣ سيرة ذاتية : ٣٨٦ ـ ٣٨٧

خستبوو و ، خۆی لەسەری نووسیی بوون . ئێمەش ئەو پارچە کاغەزانەمان ئەهێنا و خێرا ئەمان‌نووسینەوە

خەریك بووم بە لای کاك جایلان چالیشقانەوە فێری نووسینی پیتە قورئانییەکان ( پیتە عەرەبییەکان ) ئەبووم . کاتێکیش، کە پاسەوانەکان چاویان پێمان ئەکەوت وا ئەنووسین ، هەوڵیان ئەدا بمان‌ترسێنن و ، هەرەشەمان لێ بکەن و، ئیهانەشمان بکەن ، بەڵام، کە بە خزمەتی مامۆستا ئەگەیشتم ئەیفەرموو:

ـ نەترسیت ... خوای گەورە بە سۆزی خۆی تۆی ناردووە بۆ ئێرە .. تۆ یەکجار خاوەن بەختیت و ، لەسەرت پێویستە زۆر سوپاسی خوا بکەیت .

فەرمایشتەکەی خەم و خەفەتێکی زۆری لە کۆڵمان ئەکردەوە و ئەی ڕەواندەوە . ئێمەش بە شەو و بە ڕۆژ سەرگەرمی نووسینەوە بووین، مامۆستاش هەڵەگیریی ئەوەی ئەکرد، کە ئێمە ئەمان‌نووسییەوە و دوعاشی بۆ ئەکردین ....

ئێمە بە هەموو جۆرە بیانوویەك چاوەڕوانی هەلێك بووین بۆ سەردانی مامۆستا .. بە بیانووی چوون بۆ لای سەرتاش، کە ژوورەکەی بەرامبەر ژوورەکەی مامۆستا بوو ، ئەمان توانیی سەردانی بکەین .[٢٩٤]

کاربەدەستان لە ئازاردانی مامۆستا و قوتابیەکانی دەست کۆتا نەبوون و ، مامۆستاش خەریکی خواپەرستیی و دانانی پەیامەکان بوو، و قوتابیەکانیش سەرگەرمی نووسینەوە و لێکۆڵینەوەی پەیامەکانی نوور و ، ڕێنمایکردنی بەندییەکان بوون ..

بەڵێ ، لەم بەندیخانەیەش دا زۆرێك لە تاوان باران تەوبەیان کرد ، کە هی وایان هەبوو بە بۆنەی تاوانی کوشتنەوە حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو بوو، وەك

---

٢٩٤رجل القدر : ٢٢٣ ـ ٢٢٤

بەندیی طاهیر کە نازناوی قەصابی لێ نرابوو، و بەندییەکان لێی ئەترسان، لەبەر ئەوەی لاشەیەکی کەتەی بەهێزی هەبوو دەست و پێی کۆت و زنجیر کرابوون .. لەبەر ئەوەش، کە بەندییەکان لێی ئەترسان هەرچیی بوتایە بە گوێیان ئەکرد و هیچ کەس بە پێچەوانەی ویستی ئەو نەئەجوولایەوە، سەیر لەوەدابوو، کە ئەم پیاوە تاوانبارە هەر بە یەك سەردانی لە مامۆستا لە ژوورەکەی خۆیدا بە تەواویی گۆڕرا ، بە شێوەك کە هەموو بەندیی و پاسەوان و لێ پرسراوەکان پێی سەرسام بوون، بووە مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ و نوێژەکانی لە کاتی خۆیاندا ئەنجام ئەدا و ، قسەی کەمی ئەکرد و ، قوتابیانی نووریشی خۆش ئەویستن ..[٢٩٥]

کاربەدەستان بەندیخانەکەیان کردبووە گۆڕستان ، بەوەی ترس و لەرزێکی زۆریان بردبووە دڵی بەندییەکانەوە و ، بۆ هەلێك ئەگەران سزایان بدەن .

ئەوەبوو لەسەر ئەوەی، کە بەندییەك لە پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستاوە سەلامی لە مامۆستا کردبوو زۆر بە توندیی لێیان دابوو .

کاتێکیش، کە مامۆستا زوبێر گوندۆز ئاڵب هەلی دەست کەوتبوو بچێتە ژوورەکەی مامۆستاوە تا هەندێ پێویستیی بۆ جێبەجێ بکات ، گرتبوویان و هێنابوویان بۆ ژووری ئەشکەنجە و لەوێ لەسەر زەوییەکە درێژیان کردبوو و بە دار فەلاقەی ژێر پێیان کردبوو، هەرچیی دارەکە بەر پێی ئەکەوت هاواری ئەکرد :

ـ لێی دە ! لێی دە ! با بژیت دۆزەخ بۆ ستەم کاران ! با بژیت دۆزەخ بۆ ستەم کاران ![٢٩٦]

---

[٢٩٥] رجل القدر : ٢٢٣ ـ ٢٢٤ ..

رجل القدر : ٢٢٥

جارێکیان موحەممەد کایهانی بەڕێوەبەری بەندیخانەی ئافیوون لە ڕۆژی جەژنی سەربەخۆیی تورکیادا ویستی داوێك بۆ مامۆستا نوورسیی بنێتەوە، فەرمانی دا ئالآیەکی تورکیی لە هۆڵەکەیدا دابکوترێت، هەرچیی لەوە مامۆستا نوورسیی نارەزایی لە ئالآکە دەر ئەبرێت ، یان ئەیدرێنێت چونکە پیاوێکە کۆنەپەرستە، ئەو کاتە ئەتوانێت تاوانباری بکات ، بەوەی، کە بە سووك سەیری ئالآی تورکیای کردووە و ، ئەمەش سووکایەتییە بە ئوممەتی تورکیی .

بەڵام مامۆستا بە ژیرانەی خۆی نەی هێشت ئەو داوەی، کە بەڕێوەبەر بۆ ئەوی نابوویەوە سەر بگرێت ، ئەوەبوو بۆی نووسیی :

بەڕێوەبەری بەڕێز ! لەسەر داکوتانی ئالآیەك بە بۆنەی جەژنی سەربەخۆییەوە سوپاست ئەکەم، دیارە حکومەتی ئەنقەرە دەرکی بەوە کردووە، کە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەم ( شەش هەنگاو ) لە ئەستەنبوڵدا ( لە کاتی بزووتنەوەی میللییدا ) دژی ئینگلیز و دژی یۆنان هاوتای کاریگەریی یەك فیرقەی تەواوی سەربازیی بووە ، بۆیە موصطەفا کەمال بە جفرە دوو نامەی ناردن، کە داوای ئەکرد لە ئەنقەرە ئامادە بم ، هەتا خەڵاتم پێ بدات ، هەتا ئەوەبوو وتبووی: ( ئێمە پێویستمان بەم زانا پاڵەوانە هەیە ) .

کەواتە مافی خۆمە وێنەی ئەم ئالآیە لە هۆڵەکەمدا دابکوترێت، بەمە بەڕێوەبەری بەندیخانە لووتی شکا [٢٩٧]

بەر لەوەی مامۆستا بزانێ ( مدعي عام ) لە مەحزەری تاوان بارکردنەکەیدا دەربارەی تێك‌دانی ئاسایشی وڵات چیی لەسەر نووسیوە ، وت و وێژێك لەگەڵ ( مدعي عام ) دا ئەکات و پێی ئەڵێت :

---

٢٩٧ رجل القدر : ٢٢٥

دوێنێ غەیبەتم کردیت ، ئەوەبوو بەو پۆلیسەم وت، کە لـە بریـی بەڕێوەبـەری بەندیخانە لێمی پرسییەوە : « خوا لەناوم بەرێت ( سێ جار ) ئەگەر زیاتر لە هەزار بەڕێوەبەری ئاسایش و هەزار ( مدعي عام ) خزمەتی ئاسایشی گشتیی ئەم وڵاتەم نەکردبێت » .. [٢٩٨]

بە بۆنەی ئەوەوە، کە کاربەدەستان لەو زستانە سەختەدا ئازاری ئـەدەن و لـەو تەمەنە زۆرەدا بۆ ئەم شار و بۆ ئەو شار ئەیگوازنەوە و ، لـە شـوێنێکی سـارد و سردا بەندی ئەکەن، کە بە هیچ شێوەیەك مافی ئادەمیانەی بەرچاو نەگیرابێت، کە بە راستیی یەکجار تووڕە ئەبێت ، کەچیی باسی چاودێریی خوایی ئەکات کە چۆن دڵی ئاگادار کراوەتەوە و ، دەرسێکی ئیمانیی جوانی پێشکەش کراوە ، تا ئەوە بۆ خۆی و بۆ هەموو ئیمان‌دارێك بکاتە ئامۆژگاریی ..

لەوە ئاگادار ئەکرێت، کە ئەوانەی ستەمی لێ ئەکەن با پێی نارەحەت نەبێت، چونکە قەدەری خواییش ـ کە عەدالەتێکی رێك و پێکە ـ بەشـی گـەورەی خـۆی هەیە، کە ئەو ستەمکارانە بەسەریدا زاڵ ئەکات و ، کە بریاریش دراوە رزقی لـە بەندیخانەدا بێت ، ئەبێت لەوێ بە نسیبی ببێت .. کەواتە پێویستە بۆ ئەو بەشـە گەورەیە رەزامەندیی تەواو بنوێنێت ..

هەروەها دانایەتیی و سۆز و بەزەیی پەروەردگاریش بەشـێکی زۆری لـەوەدا هەیە تا ئەوان بگەنە بەندیخانە و ، ببنە مایەی هیدایـەتی چـەندین تـاوان‌بـاری بەندیخانە و ، هیوا و دڵدانەوەیان پێشکەش بکەن ، بەمەش قوتابیان پاداشتێکی زۆریان دەستگیر ببێ، لەبەر ئەمە پێویستە هەزارەها جار سوپاس و شـوکرانەی خوا بکەن بەرامبەر بەو بەشە گەورەیە ، ئەویش بە ئارام‌گرتن ..

---

[٢٩٨] سیرة ذاتیة : ٣٨٧

هەروەها بەندەی ئیمان دار بەشی دەروونی خۆیشی لە کارەکەدا هەیە ، چونکە خاوەنی کەم و کورتیی و هەڵەی زۆرە و ، پێویستە ئەم لایەنەش بەرچاو بگیرێت، ئەویش بە تەوبە و پەشیمانیی و گەرانەوە بۆ لای خوا ئەبێت و ، لۆمەی دەروون بکرێت، کە شایانی ئەم زللەیە

هەروەها هەندێ کارمەندی ساویلکە و ترسنۆکی خەڵەتاویش، کە بـە فـێڵ و تەڵەکەی دوژمنە شاراوەکان ستەم لە ئیمان داران ئەکەن ، ئەوانیش بەشی خۆیان هەیە ، بەڵام ئەوەتا پەیامەکانی نوور تۆڵەی خۆیـان لـەو مونافیقانـە کـردەوە، بەوەی، کە زللەی مـەعنەویی کاریگەریان لێ دان .

دوایین بەشیش بەشی ئەو فەرمانبەرانەیە، کە لە کارەکەدان، جا لەبەر ئەوەی، کە لە لایەنی ئیمانەوە ، بیانەوێ و نەیانەوێ ، کەڵك وەرئەگرن ، کاتێك کە بـە نیەتی رەخنەگرتنەوە سەرنجی پەیامەکان ئەدەن ، ئـەوا ئەوانـە چاوپۆشـییان لێ ئەکرێت .

بەم ئاگادارکردنەوە مەعنەوییە مامۆستا بریاری دا بەوپەری ئارام و شوکرانەوە بە بەندیخانە رازیی بێت ، کە بریتییە لە قوتابخانەیەکی یووسفیی نوێ .. [٢٩٩]

هەروەها دەری ئەبرێت، کە ئەو لـە تەمـەنی حـەفتا و پێـنج سـاڵییدایە و، پەیوەندیی بە دنیاوە نەماوە و ، زۆربەی خۆشەویسـتانی کۆچـیان بـۆ قیامـەت کردووە، جا ژمارەیەکی زۆری پەیامەکان و ، زۆرێك لە خوشك و برایانی ئیمـان داری خەریکن حەقیقەتەکانی ئیمان بلاو ئەکەنەوە، هەروەها دەری ئەبرێت، کە مردن صەد جار لەو بەندیخانەیە چاکترە و ، بەندیخانەکەش صەد ئەوەندەی ژیانی دەرەوە چاکتر و بەکەڵکترە ، چونکە لە بەندیخانەدا وا لەگەڵ صەدەها بەندکراودا و

[٢٩٩] سيرة ذاتية : ٣٨٧ ـ ٣٨٨

، بە ناچاریی بەرامبەر بە ستەمی کاربەدەستانی بەندیخانە پێکەوە دان بە خۆیان دا ئەگرن، سەرەرای ئەو سۆز و بەزەییەی، کە بەرامبەر بە پیر و نەخۆشەکان لەلایەن مرۆڤە پاکەکانەوە دەرئەبرڕێت، بۆیە بە بەندکردن رازیی ئەبێت .[٣٠٠]

کاتێکیش، کە برا بۆ دادگای سێهەم ـ واتە دادگای ئافیوون ـ ، لە دەرەوەی دادگا ، لەبەر لاوازیی و پیریی و نەخۆشیی توانای نەبوو بە پێوە بوەستێت ، بۆیە لەسەر کورسییەك دانیشت، لەناکاو حاکم هات و مامۆستای دیی وا دانیشتووە، بۆیە بە توورەیی و ئیهانەکردنەوە وتی : ئەمە بۆچ بە پێوە چاوەروانیی ناکات ؟

بەم بێرەحمییە مامۆستا دڵی دێتەوە یەك ، بەڵام، کە ئاور ئەداتەوە خەڵکێکی زۆر لە موسڵمانان ئەبینێ، کە بەوپەری دڵسۆزییەوە و ، بە چاوێکی پر لە فرمێسك و ، بە دڵێکی پر لە شەفەقەتەوە وەستاون و ، هیچ هێزێك ناتوانێ بڵاوەیان پێ بکات ، دڵی ئەگەشێتەوە و ، بەو بۆنەوە دوو حەقیقەت دێن بە دڵیدا :

**حەقیقەتی یەکەم :** دوژمنە شاراوەکانی مامۆستا و پەیامەکانی نوور قەناعەتیان بە هەندێ کارمەندی بێئاگا کردبوو ، هەتا دژایەتیی مامۆستا بکەن تا کەسایەتیی ئەو لەبەر چاوی خەڵکیی بخەن ، بەو هیوایەی کۆسپ و تەگەرە بخەنە بەر دەم فتووحاتی پەیامەکانی نوور، بەرامبەر بەم سووکایەتیی کردنە خوای گەورە کەسانێکی زۆری کردبووە دۆستی خزمەتی ئیمان ، بۆیە چاودێریی خوایی سەرنجی مامۆستای بۆ لای ئەوانە راکێشا ، تا سەیریان بکات چۆن بوونەتە پشتیوانی دڵسۆز و خەم خۆری خزمەتەکەی .

[٣٠٠] سيرة ذاتية : ٣٨٨

لە کاتێکیش‌دا، کە مامۆستا وەڵامی پرسیارەکانی حاکمی تەحقیقی ئەدایەوە هەزار کەسێك لە پشتی پەنجەرەوە سەیریان ئەکرد و ، دۆستایەتیی خۆیان دەرئەبریی ، هەتا پۆلیس نەیان ئەتوانیی بڵاوەیان پێ بکەن، ئەمەش بووە هۆی دڵخۆش‌کردنی مامۆستا بەم دۆستە راستەقینانە .

**حەقیقەتی دووهەم :** بەرامبەر بە سووکایەتیی کردن بە قوتابیانی نوور، کە گوایا ئاسایشی وڵات تێك ئەدەن و ، دوورخستنەوەی خەڵکیی لە خزمەتی ئیمان، رۆڵەکانی بەرەی داهاتوو پێشوازییەکی گەرم لە خزمەتی ئیمان ئەکەن ، چونکە بۆیان دەرئەکەوێت، کە شوێن‌کەوتوانی پەیامەکان بە دڵ و بە گیان پارێزگارییان لە ئاسایشی وڵات کردووە و ، دوژمنە شاراوەکانیان ، بە تایبەت شیووعییەت، ئاژاوە و پشێویی پەرە پێ ئەدەن، بەمە قوتابیانی پەیامەکان بە هۆی ئیمانی تەحقیقییەوە لە ماوەیەکی زۆردا و لە سەرانسەری وڵاتدا رووداوێکیان لە دەست دەر نەچووە، کە ببێتە مایەی تێك‌دانی ئاسایش، هەتا هەندێ ئەفسەری خاوەن ویژدانی سێ ویلایەت دەریان بریی کە قوتابیانی نوور ئەفسەری مەعنەوین بۆ ئاسایشی وڵات و ، چاکترین یارمەتیدەری دەوڵەتن ، چونکە بە خوێندنەوەی پەیامەکان و دەست خستنی ئیمانی تەحقیقیی پاسەوانێکی مەعنەویی لە بیر و هەستیدا دائەمەزرێنێت .[٣٠١]

لە یەکێ لە دانیشتنەکانی دادگای ئافیوون‌دا ، ئەوەندە درێژەی کێشا هەتا کاتی نوێژی مەغریب هاتە بەرەوە،مامۆستا لە شوێنی خۆی هەستا و وتی : من نوێژ بەجێ ئەهێنم .

---

٣٠١ اللمعات : ٣٩٥ ـ ٤٠٠ ، سیرة ذاتیة : ٣٨٨ ـ ٣٨٩

حاکم ئەی ویست دادگا بەردەوام بێت بۆیە وتی : ئەتوانیی بە قەزا بی گێریتەوە

مامۆستا وەڵامی دایەوە : بە قەزا گێرانەوە جائیز نیە .. من نوێژ بەجێ ئەهێنم .

پاشان رووی کردە دادگا و دای بە گوێیاندا :

ـ ئێمە بۆ ئەمە هاتووینەتە ئێرە هەتا بەرگریی لە مافی نوێژ بکەین ، چونکە لەوە زیاتر تاوانێکی دیکەمان نیە

دوای ئەوە دادگای بەجێ هێشت و ، فەرمانبەری بەندیخانەش لەگەڵیا رۆیشت و ، لە ژووری قەڵەمی دادگا نوێژی بەجێ هێنا

لە دوادانیشتنی دادگادا داوا لە مامۆستا کرا، کە ئەگەر شتێکی هەبێت و بیڵێت ، ئەویش وتی :

ـ ئەگەر تاوانێك لە ئارادا هەبێت ئەوە پەیوەندیی بە منەوە هەیە و ، براکانی ترم تاوانیان نیە، ئێمە خزمەتکاری قورئان و ، پاسەوانیی مەعنەویی ئەمن و ئاسایشین .[٣٠٢]

کاتێکیش، کە دادگا گوێی بۆ شاهێدیی سێ هەواڵ دەرەکە گرت ، کە نێررابوون بۆ ئەمیرداغ تا چاودێریی کاری مامۆستا نوورسیی بکەن ، حاکم سەرسام بوو ، چونکە قسەکانیان ئەوەی ئەگەیاند، کە مامۆستا زانیویەتی بۆ چیی هاتوون و ، هەستی کردووە، کە ئەوانە کاریان سیخورییە ، نەك چاك کردنی کارەبا .. سەریان لەوە سور ئەما، کە مامۆستا چۆنی پێ زانیون ؟ بۆ ئەمە حاکم

---

[٣٠٢] رجل القدر : ٢٢٦

پرسیاری لە مامۆستا کرد کە چۆن بەم کارەی زانیوە ، مامۆستاش وەڵامی دایەوە، کە لە خەودا ئاگادار کراوە .[٣٠٣]

مامۆستا لە دادگادا بەرگرییەکی پیاوانە لە خۆی و لە کارەکەی ئەکات، کاتێك، کە ئەیانەوێ بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی نهێنیی تاوان باری بکەن ، کە گوایا ئەیەوێ دژی رژێمی وڵات کار بکات ..

دەری ئەبرێت، کە بەڵێ ئەوان کۆمەڵەن ، بەڵام کۆمەڵەیەکی بێ زیان .. هەموو مەبەستێکیان بریتییە لە رزگارکردنی خۆیان و جەماوەری هاووڵاتیانیان لە سزای قیامەت و ، رزگارکردنیان لە ئاژاوە و سەرگەردانیی و ، بە حەقیقەتەکانی پەیامەکانی نوور شوورایەکی پۆڵایین بە دەوری خۆیاندا دروست بکەن هەتا بتوانن بەرهەڵستی هێرشە ستەم کارانەکەی مولحید و زیندیقان بکەن .

پاشان ئەیدا بە گوێیاندا، کە هەر سزایەکی بۆ بریار ئەدەن ئەو هیچ باکێکی نیە ، چونکە ئەو وا لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵییدا و ، نزیکی دەرگای قەبر بۆتەوە و ، بەوپەری بەختەوەرییشی لە قەڵەم ئەدا کە ئەگەر ئەم یەك دوو ساڵەی، کە لە تەمەنی ماوە و ، ژیانێکی بێتاوان و مەزلوومانەیە ، خوا بۆی بگۆرێت بە پلەی شەهیدیی، پاشان لە لایشی یەقینە و هیچ گومانێکی لە دڵدا نیە، کە مردن بۆ یەکێکی وەك ئەو بریتییە لە مۆڵەت دان و ئازادکردن ، بەڵکو بریتییە لە بلیتی گەیشتن بە جیهانی دڵئارامیی و بەختەوەریی و ، لە پەیامەکانی نووریشدا هەزارەها سەلماندن بۆ ئەوە هەیە، لە سێدارەدانیش بۆ کەسانێکی وەك ئەو ئەوپەری بەختەوەرییە ، چونکە ئەوە کلیلی رەحمەتە و هەلێکی چاکیشە بۆ گەیشتن بە جیهانی هەمیشە مانەوە و نەمریی .

---

[٣٠٣] رجل القدر : ٢٢٦

پاشان روو ئەكاتە دوژمنــە شـارراوەكانی، كـە بـە نـارەوا سـزايان ئـەدەن و حكومەت لە دژيـان هـەڵ ئـەنێن ، ئەيـدا بـە گوێيـاندا، كـە لـە سـێدارەدانی راستەقينەی ئەبەديی چاوەروانی ئەوانە و ، بە چەند قـاتيش موسـڵمانان تۆڵـەی خۆيان وەرئەگرنەوە [٣٠٤]

مامۆستا لە لايەن ( مدعي عـام ) ەوە تاوانێكی تريش ئەخرێتە ئەستۆی، كە ئەويش بريتييە لەوەی، كە مامۆستا نوورسيی موصطەفا كەمالی شوبهاندووە بە دەججال، مامۆستا پەرچی ئەو تاوان باركردنە ئەداتەوە :

( مدعي عام ) يەك دوو مەسەلەی تيشكی پێنجەم [٣٠٥] بەسـەر سـەرۆكێكدا جێبەجێ ئەكات كە مردووە و كاری بەسەر چووە ، هەتا ئەوە بكاتە بيانووی ئەوە هێرش بكاتە سەرمان و بە تاوانبار لە قەڵەمان بدات .

مامۆستا دەری ئەبرێت، كە ئەو باسانەی، كە ئەو نووسيوينی بە تايبەت باسی كەس ناكەن ، بەڵكو بە گشتيی باسەكە دەر ئەبرن .. كەواتە هيچ مانايەكی نيە هۆی هيچ و پووچ بتاشرێن بۆ تـاوانبـاركردنی قوتابيـانی نـوور و سـزادانيان .. ئەوەندە هەيە مامۆستا چەند فەرموودەيـەكی شـەريفی شـەرح كـردوون و ، لـە دادگاكانی تردا وەڵامی داوەتەوە

دەريشی ئەبرێت، كە ئەو سەرۆكە بۆ نۆكەريی كافران مزگـەوتی ئاياصـۆفيای گۆريوە بۆ مۆزەخانە و ، بنكەی مەشيەخەی گشتيی موسڵمانانيشی گۆريـوە بـۆ دواناوەنديی كچان و ، هيچ كات موسڵمانان بە بڕياری وەها رازيی نابن ..

---

[٣٠٤] رجل القدر : ٢٢٦ ـ ٢٢٧

[٣٠٥] تيشكی پێنجەم هەر هەمووی باسی دەججال و فيتنەی ئاخرزەمان ئەكات و ، سيفەتەكانی دەججاليش بەسەر ( مصطفى كمال ) و دار و دەستەكەيدا ئەچەسپێ .

هەروەها دەری ئەبرێت، کە سزا و ئازاری ئەو ڕۆژانەی دواوە یەکجار سەخت بووە و، بە تەواویی بێزار بووە و ، بۆ ڕزگاربوونیش لەو ژیانە تاڵە دوو ڕێگا هەن : یان بەندیخانە ، یان قەبر ..

پاشان تاوانی سەر بە کۆمەڵەبوونی قوتابیانی نوور ئەداتە دواوە و ، ئەیشی سەلمێنێ، کە ئەوانەی ئەو تاوانە ئەخەنە دوایان ئاژاوەچیین و ، بۆ بەرژەوەندیی دوژمنانی موسڵمانان کار ئەکەن . بەڵکو لە هەموو دادگاکاندا بێتاوان دەرچوون، جگە لە دادگای ئەسکی شەهر، کە بەندیی ساڵێك بۆ مامۆستا و ، بەندیی شەش مانگیش بۆ پانزە قوتابیی لە کۆی ( ١٢٠ ) قوتابیی بڕییەوە .[٣٠٦]

لە شوێنێکی تردا بەرگریی لە پەیامەکان ئەکات و دەری ئەبڕێ، کە هیچ کەس توانای نیە بەرابەرکێ لەگەڵ پەیامەکاندا بکات ، ئیتر با هیچ کەس خۆی ماندوو نەکات ، چونکە زانایان لەوە ئاگادارن، کە پەیامەکان ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان ئەسەلمێنن و ، بەهێزترین سەلماندنیان لە قورئانەوە دەستگیر بووە، و لەبەر ئەوەش، کە ئەم پەیامانە خزمەتکاری قورئانن و ، تەفسیرێکی ناوازەیشن بۆی ، ئەوا گەشاوەترین حەقیقەت و چەسپاوترین سەلماندنیان لە خۆ گرتووە و ، بە موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانیش بۆ ئەم چەرخە لە قەڵەم ئەدرێن و، بەربەستێکی سەختیشن لەبەردەم ئەو مەترسییانەدا، کە ڕوو لەم ئوممەت و نیشتمانە ئەکەن .

کەواتە ئەم پەیامانە خزمەت پێشکەش ئەکەن و قوتابییەکانیش بە دڵ و بە گیان خۆشیان و کەسانی تریش پێیان پەروەردە ئەکەن، کەواتە لەسەر دەوڵەت و دەسەڵات پێویستە کۆمەکیی قوتابیان بکەن بۆ گەیاندنی دەرمانی پەیامەکان بە

[٣٠٦] رجل القدر : ٢٢٧ ـ ٢٢٩

هەموو گۆشەیەکی سەرزەویی ، نەك بیانترسێنن و کۆسپ لەبەردەمیاندا ساز بکەن و ، هەروەك دەست ناخەنە کاری گۆڤار و رۆژنامە و کتێبی مولحیدەکانەوە، کە ولات بەرەو هەڵدێر ئەبەن ، هەق وایە دەستیش نەخەنە کاری پەیامەکانەوە، کە کاری کارمەندی دڵسۆزی ئاسایش ئەنجام ئەدەن و ، رەوشتە سووکەکان لە کۆمەڵگا دوور ئەخەنەوە .[٣٠٧]

هەر لەو بەرگریەیدا ئامۆژگاریی کاربەدەستان ئەکات هەتا واز لە پەیامەکان بهێنن و دژایەتییان نەکەن ، چونکە پەیامەکان قورئان پاڵپشتیانە و ، کۆمەکیی و پشتگیریی لەوەوە وەرئەگرن ، بۆیە بە هیچ کەس چار ناکرێن و ، هەرکەسیش هەوڵ بدا رووناکییان بکوژێنێتەوە ئەوە زیانی بە گەل و ولاتەکەی گەیاندووە، ئەگینا ئەوان ناکوژێنەوە، بەڵکو ئەچن بۆ شوێنێکی تر و ئەوێ رووناك ئەکەنەوە خۆ ئەگەر هەر کۆڵیان نەدا و بەرامبەر بە پەیامەکان وەستان، مامۆستا بەڵێنیان ئەداتێ، کە ئەگەر ئەوەندەی ژمارەی تاڵە مووی سەری گیانی هەبن و ، هەموو رۆژێك یەکێکیان بکێشن ، ئەوا هەرگیز ئەو سەرەی، کە نەذری کردووە خزمەتی حەقیقەتە قورئانییەکانی پێ بکات ، لەبەردەم زەندەقە و کوفری موطلەق دا نای چەمێنێتەوە و ، هەرگیز دەست بەرداری خزمەتی نوور نابێت.

مامۆستا ئەوەش روون ئەکاتەوە، کە مادەم حکومەت بە بۆنەی ئازادیی ویژدانەوە رێ لە مولحیدان ناگرێت ، هەق وایە رێش لەوانە نەگرێت، کە کەناریان گرتووە و خەریکی خواپەرستیین، دیارە لە هەموو سەرزەوییشدا هیچ میللەتێك

---

[٣٠٧] رسائل النور لا تنطفئ ، ترجمة عاصم الحسيني .

بەبێ دین ناژی و ، موسڵمانانیش هەزار ساڵێکە سەرگەرمی خواپەرستیی و خۆ پەروەردە کردنن و ، تەقوا و صەلاحەتیش بە دەرمانی دەردی میللەت ئەزانن .[٣٠٨]

کاربەدەستان تاوانێکی تر ئەدەنە پاڵ مامۆستا کە گوایە شانازیی بە خۆیەوە ئەکات ، ئەویش ئەوە بە جوانیی روون ئەکاتەوە کە هیچ کات حەزی لە ناوبانگ و شوهرەت نەبووە و ، چەندین جاریش بە قوتابیە دڵسۆزەکانیدا هەڵ شاخیوە لەسەر ئەوەی، کە رێزی زیادیان لێ گرتووە و ، خۆی بە شایانی ئەوە نەزانیوە .

جارێکی تر ئەهلی دنیا ئاگادار ئەکاتەوە، کە با خۆیان ماندوو نەکەن و دژایەتیی لەگەڵ پەیامەکان و قوتابییەکانیاندا ، چونکە ئەم قوتابیانە رۆڵەی بەئەمەکیی ئەم میللەتە موسڵمانەن، کە بە درێژایی مێژوو خوێنی پەنجا ملیۆن شەهیدی پێشکەش بە ئیسلام کردووە و ، بەرگریی لێکردووە، کەواتە ناتوانن قوتابیان پەرتەوازە بکەن چونکە، بە دڵ و بە گیان باوەشیان بۆ پەیامەکان کردۆتەوە

هەر لە هۆڵی دادگادا مامۆستا نوورسیی بە سەری بەرزەوە بریارێکی ناوازە دەر ئەکات و ، ئەوپەری خۆنەویستیی دەرئەبرێ و ، بۆ هەموانی ئەسەلمێنێ، کە ئاواتی ئەوەیە دوژمنەکانیشی لە سزای دۆزەخ سەرفراز بن .. بریاری دا، کە بە دڵ و بە گیان ئامادەیە چاوپۆشیی لەو کارمەندانە بکات، کە خەریکی رەخنەگرتن و هەڵ سەنگاندنی پەیامەکانی نوورن ، ئەگەر فەرمانی لەسێدارەدانی ئەویش دەربکەن ، بەو مەرجەی کەڵك لە پەیامەکان وەر بگرن و ئیمانیان پێیان بەهێز

---

[٣٠٨] رجل القدر : ٢٢٩ ـ ٢٣١

بکەن، کەواتە ئەم خزمەتە ئیمانییە بۆ هەموانە و جیاوازیی لە نێـوان دۆسـت و دوژمن‌دا نیە [٣٠٩]

دەربارەی ژیانی لە ئەمیرداغ و ئافیوون‌دا ، مامۆستا بە پێنووسـی خـۆی لـە پەیامی پیران‌دا ئەنووسێت :

« پاشان لەو کاتەدا، کە من زۆر پێویستییم بە حەسانەوە و گوێ نەدان بە خەم و خەفەتی دنیـا هـەبوو و دەبـوا بـە یـەکجاریی لـە سـەرما بـەدوور بوومایـە، دوورخستنەوەم لەلایەن ئەمانەوە و ، گواستنەوەم لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر کە لە توانامـا نەبێت ـ بە تایبەت لەم سـەرما و سـۆڵەیەدا ـ ، پاشـان بەنـدکردنم و تەنگ پێ هەڵچنینم بەدەر لە توانـای خـۆم و بـە شـێوەیەك، کـە هەسـت بـە کینەیەکی شاراوە و کارێکی دەست قەست بکرێت .. ئەمە هەر هـەمووی قـین و بێزارییەکی نائاسایی بەرامبەر بەوانە لە دڵم‌دا دروسـت کـرد، بـەڵام عینایـەتی خوایی بە فریامەوە هات و ، دڵمی لەم مانایە ئاگادار کرد.

« قەدەری خوایی ـ کە یەك پارچە عەدالەتە ـ دەستێکی یەکجار بـاڵای لـەو ستەمە ئاشکرایەدا هەیە، کە ئەو مرۆڤانە لێتی ئەکەن و ، ئەو رزق و رۆزیەشت، کە لەناو بەندیخانەدا بۆت تەرخسان کراوە بانگی کردوویت بۆ ناو بەندیخانە ، دەی کەواتە لەسەرت پێویستە بەرامبەر بەو بەشەی قەدەر رەزامەندیی و تەسلیم بوون بنوێنی ..

هەروەها حیکمەت و رەحمەتی پەروەردگاریش بەشـێکی زۆریـان هەیـە ، وەك گەیاندنی نوور و هیدایەت و بەخشینی هیوا بە دڵی بەندییەکان و دڵ دانەوەیان و،

---

٣٠٩ رجل القدر : ٢٣٢ ـ ٢٣٣

پاشان دەست خستنی پاداشتیش بۆ ئێوە، لەبەر ئەوە پێویستە ، بەرامبەر بەم بەختە چاکە ، ـ لەرێی ئارام گرتنەوە ـ هەزاران سوپاس و شوکرانەی خوا بکەن.

هەروەها نەفسیشت بەشی خۆی هەیە ، چونکە چەندین کەم و کوریی هەیە، جا پێویستە بەرامبەر بەم بەشەش ئیستیغفار و تەوبە و گەرانەوە بۆ لای خوا ئەنجام بدرێ و ، لۆمەی نەفسیش بکرێت، کە خۆی شایستەی ئەم زللەیە بووە

هەروەها هەندێ فەرمانبەری ساویلکە و ترسنۆك و خەڵەتاو ، کە بە فروفێڵی دوژمنە شاراوەکان ئەو ستەمانەیان پێ ئەنجام ئەدرێ ، ئەوانیش بەشی خۆیانیان هەیە و ، پەیامەکانی نووریش بە تەواویی تۆڵەیان لەو مونافیقانە سەند بۆت ، بەوەی، کە زللەی مەعنەویی سەرسامکەری لێ وەشاندن . دە با ئەو زللانە هەر بەشیان بن ..

بەڵام دوابەش بەشی ئەو فەرمانبەرانەیە، کە هۆی راستەقینەی (ئەم کارەساتانە ) بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی، کە ئەوانە لە کاتی سەرنجدان و خوێندنەوەی پەیامەکانی نووردا، بە نیازی رەخنە و توانجەوە ـ بیانەوێ یان نەیانەوێ ـ بە حەتمیی لەلایەنی ئیمانییەوە کەڵکیان وەرگرتووە ، ئەوا بە پێی دەستووری ﴿ والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس ﴾ لێبووردن و چاوپۆشیی لێیان کارێکی دلێرانە و بەنەجابەتە

دوای ئەوەی، کە ئەم وریاکردنەوە و ئاگادارکردنەوەم وەرگرت ، کە هەر هەمووی حەق و حەقیقەتە ، بریارم دا لەم قوتابخانە یووسفییە نوێیەدا بە ئارام و شوکرانە و شادمانییەوە بمێنمەوە، بگرە هەتا بریارم دا یارمەتیی و کۆمەکیی ئەوانە بکەم، کە خراپەم بەرامبەر ئەکەن و دژایەتییم ئەکەن ، تا بە کەم و کورییەکی بێ زیان تەمێی نەفسم بکەم .

پاشان کەسێکی وەك، مــن، کــە لــە تەمــەنی حــەفتا و پێــنج ســاڵییدایە و، پەیوەندییشی بە دنیاوە بریوە و ، خۆشەویستانیشی لە حەفتا کەس‌دا تەنها پێنج کەسیان لە دنیادا ماون و ، حەفتا هەزار نوسخەی پەیامەکانی نووریش بەوپەڕی سەربەستییەوە ئــەرکی نــووریی سەرشــانی ئــەنجام ئــەدەن و ، ئەوەنــدەش بــرا و ئەوەندەش میرات گری هەن، کە فەرمان بەریی ئیمــان بــە هــەزاران زمــان ، لــە جیاتیی تاقە زمانێك ئەنجام بدەن .. کەواتە قەبر بۆ کەسێکی وەك من سەد جار لەم بەندیخانەیە چاکتر و زیاترە ، سەرەرای ئــەوەش، کــە ئــەم بەندیخانەیــە صــەد ئەوەندەی سەربەستیی کۆت و زنجیرکراوی دەرەوەش و ، ژیانی ژێر فەرمان سەپاندن و دەسەڵاتی کەسانی تریش کەڵك و حەسانەوەی زیاترە ، چونکە پیاو بە ناچاریی و لەگەڵ صەدەها بەندییدا بەرگەی فەرمان سەپاندنی هەندێ لێپرسراو بــە حــوکمی فەرمانبەرییەکان ، وەك بەڕێوەبەر و سەرۆکی پاسەوانەکان دەگرێت ، ئیتر دڵدانەوە و ڕێزێکی برایانەی لە دۆستە زۆرەکانی دەور و بەریەوە دەست ئەکەوێت، کەچیی لە دەرەوەی بەندیخانە ئەبێ خۆی بە تەنیا بەرگەی دەسەڵاتی صەدان فەرمانبەر و لێپرسراو بگرێت .

هەروەها میهرەبانیی ئیسلامەتیی و فیطرەتی مرۆڤایەتیی هەوڵ ئەدەن سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە پیران بنوێنن ، بە تایبەت ئەوانەی لــەم حاڵەتــەدان ، بەمــە نارەحەتیی و ئازاری بەندیخانەش ئەگۆڕن بۆ سۆز و بــەزەیی ، لەبــەر ئەمــە هــەر هەمووی بە بەندیخانە رازیی بووم .

کاتێکیش، کە هێنرامە ئەم دادگا سێهەمە ، لەبەر ئــەوەی، کــە هەســتم بــە ماندووبوون و نارەحەتیی ئەکرد کاتێ بە پێوە بوەستامایە ، بەبۆنــەی لاوازیــی و پیریی و نەخۆشیی سەختمەوە ، ئــەوەبوو لــە دەرەوەی دەرگــای دادگــادا لەســەر

کورسييەك دانيشتم .. لە پرێكدا حاكم هات و بە توورەيی و تێكەڵ بە سـووك و كەم نرخ سەير كردنەوە وتی: بۆچ ئەمە بە پێوە چاوەروانی ناكات ؟!

بۆ نەمانی رەحم و سۆز بەرامبەر بە پيران لە ناخی دڵمەوە توورە بووم .. كـە ئاورم دايەوە ئەبينم وا كۆمەڵێكی زۆری موسڵمانان لە دەورمان جەميان خواردووە و بە چاوێكی پر لە ميهرەبانييەوە و ، بـە دڵێكـی پـر لـە سـۆز و برايەتييـەوە سەيرمان ئەكەن ، بە رادەيەك، كە هيچ كەس نەی ئەتوانی دەريان بكات و دووريان بخاتەوە لێرەدا ئەم دوو حەقيقەتە بە دڵمدا هاتن :

**يەكەم :**

دوژمنەكانم و ، دوژمنە شارراوەكانی نوور قەناعەتيان بە هەندێ فەرمان بەری بێئاگا كردووە و ، ئەم هەڵسوكەوتە سووك كەرانەيان پێ ئەنجام ئەدەن ، تا لەبەر چاوی خەڵكيدا من بشكێنن و ، ئەو خەڵكە لەوە لا پێ بدەن، كـە هـەرگيز مـن حەزی پێ ناكەم، كە بريتييە لە رووڵێنان و بە دەمەوە هاتنی خەڵكيی ، ئەمەش بەو نيازەوە، كە گوايا بەوە ئەتوانن ديوارێكی سەخت لەبەردەم شاڵاوی فتووحاتی نووردا دروست بكەن، جا بەرامبەر بەو سووك سەيركردنەی، كـە تاقـە پياوێـك دەری بريی ، عينايەتی خوايی بە رێزلێنانێكەوە بۆ ئەو خزمەتە ئيمانييەی، كـە پەيامەكان و قوتابيانی نوور پێشكەشی ئەكەن روومی بەرەو ئـەو (( صەد )) كەسە وەرگێرا و فەرمووی : (( سەيری ئەوانە بكە ، كە بە دڵێكی پر لە ميهرەبـانيی و خەمباريی و دڵپێخۆش بوون و پەيوەنديی پتەوەوە ، بە بۆنەی ئەو خزمەتانەوە ، هاتوونەتە پێشوازييتان ))

بگرە هەتا لە رۆژی دووهەمدا ، كاتێك، كـە وەڵامـی پرسـيارەكانی حـاكمی تەحقيقم ئەدايەوە ، هەزار كەس لە گۆرەپانەكەی بەرامبەر بە پەنجەرەكانی بارەگادا كۆ بووبوونەوە ، شێوەی روخسارييان حاڵەتی ئەوانی دەرئەبريی و ئەيوت: (( ئەوانە

سەخڵەت مەکەن )) ، لەبەر پەیوەندیی پتەویشیان پێمانەوە ، پۆلیس نەیان توانیی بڵاوەیان پێ بکەن، ئا لەو کاتەدا ئەمەم بە دڵدا هات :

(( ئەو خەڵکە ، لـەم کاتـە ناهـەموارەدا ، بـەدوای دڵدانەوەیـەکی تـەواو و، نوورێکی نەکوژاوە و ، ئیمانێکی دامەزراو و ، مژدەیەکی راستدا بە بەختەوەریی هەمیشەیی ئەگەڕێن .. بگرە بە فیطـرەیان بە دوایاندا ئەگەڕێن .. جا ئەوەشیان بەرگوێ کەوتووە، کە ئەوەی ئەوان بە دوایدا ئەگەڕێن بە راستیی لە پەیامـەکانی نووردا هەیە ، لەبەر ئەوە ئەم ڕێز و تەقدیرەی، کە بۆ شەخصی مـن ـ کـە هـیچ بایەخێکی نیە ـ دایئەنێن ، کە لە توانا و سنووری مـن بـەدەرە ، لـە روانگـەی ئەوەوەیە، کە من خزمەتکارێکی ئیمـانم .. خـوا بکـات خزمـەتێکم بـۆ ئیمـان دابێ )) .

**حەقیقەتی دووهەم :**

ئەمەم بە دڵدا هات : بەرامبەر بە بێ ڕێز و سووك سـەیرکردنمان بـە بیـانووی شێواندنی ئاسایشی گشتیی و ، بەرامبەر بـە دوورخسـتنەوەی خـەڵکیی لێمـان ئەویش بە هەڵس و کەوتی نزم، کە چەند کەسـێکی کـەمی فریـو دراو ئـەنجامی ئەدەن ..لە بەرامبەر ئەمانەوە لەلایـەن ئـەهلی حەقیقـەت و رۆڵـەکانی بـەرەی داهاتووەوە پێشوازییەکی گەرم و ڕێزێکی شایان بـە ئێوەمانانتـان لێ ئـەگیرێت، بەڵێ ، لە کاتێکدا، کە ئاژاوە و تۆقاندن، کە پـەردەی شـیووعییەتیان لـە خـۆ پێچاوە چالاکییان لە زیاد بوونایە بۆ شێواندنی ئاسایشی گشتیی ، قوتابیانی نوور ئەو بەربادکردنە سامناکە ، بە هێزی ئیمانی تەحقیقیی ، لە سەرانسەری وڵاتـدا دەوەستێنن و تێکی ئەشکێنن و ، بەوپەری گورج و گۆڵییەوە هەوڵ ئەدەن ئاسایش و یاسا لە بریی ترس و ئاژاوە جێگیر بکەن و ، لە ماوەی بیست ساڵی رابوردووش دا هیچ رووداوێك دەربارەی شێواندنی ئاسایشـەوە لەسـەریان تۆمـار نـەکراوە ،

هەرچەندە قوتابیانی نوور زۆرن و لە سەرانسەری ولاتدا بلاوەیان کردووە .. هەتا لە پارێزگادا و ، لە چوار پارێزگای پەیوەندییداردا ، هیچ ئەفسەرێکی لێپرسراو رووداوێکی نەدیوە و تۆمار نەکردووە ، بگرە هەندێ ئەفسەری خاوەن ویژدانی سێ پارێزگا وتیان : (( قوتابییانی نوور ئەفسەری مەعنەویی ئاسایشی ولاتن و ، لە پاراستنی ئاسایش و یاسادا یارمەتییمان ئەدەن ، بەوەی، کە ئیمانی تەحقیقیی لە بیری هەر کەسێکدا، کە پەیامەکانی نوور بخوێنێتەوە پاسەوانێك و چاودێرێك لەسەری دائەنێن و ، بەمەش هەوڵی پاراستنی ئاسایشی گشتیی ئەدەن )) .

بەندیخانەی دەنیزلییش نموونەیەکی روون و چاکە بۆ ئەم وتەیە .. هەر ئەوەندە بوو، کە قوتابیانی نوور و پەیامی (( میوە )) ـ کە بۆ بەندییەکان نووسرا بوو ـ چوونە بەندیخانەوە ، ئەوەبوو زیاتر لە (٢٠٠) دووصەد بەندیی تەوبەیان کرد و دەستیان دایە گوێرایەڵیی و چاکەخوازیی ، ئەمەش لە ماوەی سێ مانگ یان زیاتردا، هەتا یەکێك لەوانەی، کە لە سێ کەس زیاتری کوشتبوون دەستی لە کوشتنی ئەسپێش ئەگێرایەوە، هەر بەوەشەوە نەوەستا، کە ئەندامێکی بێ زیان بێت ، بەڵکو بووە ئەندامێکی بەکەڵکی بەسۆز بۆ ولات .

ئەوەبوو فەرمانبەرە لێپرسراوەکان بە سەرسامیی و دڵ پێخۆش بوونەوە سەیری ئەم بارودۆخەیان ئەکرد ، هەتا هەندێ لە گەنجەکان بەر لەوەی بریاری دادگا وەر بگرن دەریان بریی، کە : (( ئەگەر قوتابییانی نوور لە بەندیخانەدا بمێننەوە ، ئەوا کارێك ئەکەین، کە خۆمان تاوانبار بکەین بۆ ئەوەی حوکم بدرێین تا لەگەڵیانا بمێنینەوە و ببینە قوتابیی ئەوان و بە رێنماییەکانیان خۆمان چاك بکەین و وەك ئەوانمان لێ بێت )) جا ئەوانەی، کە قوتابیانی نوور بە شێواندنی ئاسایش تاوان بار ئەکەن و ئەمانیش ئەمە تایبەتمەندیی و سیفەتیانە ، بێگومان ئەوانە بە شێوەیەکی جەرگ بر خۆیان تووشی هەڵە کردووە ، یان خەڵەتاون ، یان لە پێناوی

ئاژاوە و تۆقاندن دا کاربەدەستانی حکومـەت ـ بـە خۆیـان بـزانن یـا نـەزانن ـ ئەخەڵەتێن ، لەبەر ئەوە هەوڵی لەناو بردنمان ئەدەن و سزامان دەرخوارد ئەدەن ..

ئێمەش بەوانە ئەڵێین :

(( مادەم مردن لەناو ناچێت و دەرگای قـەبریش داناخرێـت و ، کاروانـەکانی مرۆڤایەتییش بەوپەری پەلەوە لەم میـوان‌خانـەی دنیایـەدا لـە چـاو ون ئـەبن و ئەکەونە ئەودیوی ئاسۆوە .. کەواتە چار نیە و بەم نزیکانە لێك ئەبرێین و ، ئێوەش لەسەر ستەمەکەتان سزایەکی سەخت ئەچێژن و ، بە لایەنی کەمەوە ئەو مەرگەی کە بە لای ستەم لێکراوانی ئەهلی ئیمانەوە بریتییە لە پشوودان لە مەینەتی دنیا ئەبێتە لەناودانێکی هەمیشەیی بۆتان و ، ئەو چێژە فانییانەش، کە پێیان دەست خەرۆ بوون و وا ئەزانن خۆتان بە هەتا هەتایی لە دنیادا ئەمێننەوە، ئەگۆڕێن بە ئێش و ئازاری بەردەوامی پرژانی هەتا هەتایی ..

حەقیقەتی ئیسلام، کە ئەم ئوممەتە دین‌دارە بە خوێنی صەدان ملیۆن شەهیدی، کە لە پلەی ئەولیادان و ، بە شمشێری پاڵەوانە موجاهیدەکانی دەست خۆی خست و پارێزگاریی لێوە کرد ـ بە داخەوە ـ ئەمرۆ ئەو حەقیقەتە هەنـدێ جـار دوژمنـە مونافیقە شارراوەکانمان ناوی (( تەریقەتی صـۆفێتیی )) لێ ئـەنێن و ، وەهاشـی دەرئەخەن، کە تەریقەتی صۆفێتیی، کە بریتییە لە تاقە تیشـکێکی ئـەو خـۆرە درەوشاوەیە ، خۆرەکە خۆیەتی ، تا هەندێ فەرمان‌بەری ساویلکەی پێ هـەڵبنێن و، ناوی (( تەریقەتی صۆفێتیی )) یان (( کۆمەڵەیەکی سیاسـیی )) بەسـەر ئـەو قوتابیانەی پەیامەکانی نووردا دەربرن، کە بەوپەری لێـبران و چـالاکییەوە ، بـۆ دەرخستنی حەقیقەتی قورئان و حەقیقەتەکانی ئیمان ، کۆشش ئەکەن ، کە جگە لە ناشیرین کردنمان و هەڵنانی کاربەدەستان لە دژمان هـیچ مەبەسـتێکی تریـان

نیە، جا ئێمە ئەو وتەیەمان بەوانیش و بەوانەش، کە گوێیان لێ رائەگرن ئەڵێین، کە لەبەردەم دادگا دادپەروەرەکەی دەنیزلییدا وتمان :

(( ئەو حەقیقەتە پیرۆزەی، کە ملیۆنەها سەر بوونەتە قوربانی ، با سەری ئێمەش بە قوربانی بێت .. خۆ ئەگەر ئاگری هەموو دنیا لەسەر سەرمان بکەنەوە، ئەوا ئەو سەرانەمان، کە خۆیان کردۆتە قوربانی حەقیقەتی قورئانیی، بە کۆمەکیی خوا ، دانانەوێنرێن و جڵەوی کاروباریان نادەنە دەست زەندەقە و ، دەست لە ئەرکی پیرۆزی سەر شانیان هەڵ ناگرن )) .[٣١٠]

مامۆستا بە نارەوا حوکم درا و ، بەبێ‌تاوان تاوانبار کرا ، لەگەڵ ئەوەش‌دا، کە خۆی خەتی ناخۆش بوو و ، نەخۆشیش بوو ، نەیان‌هێشت کەسێك یارمەتیی بدات و وەڵامی بۆ بنووسێت ، ناچار شکاتی بردە بەردەم دادگای تەمییز و بە (١٠) دە خاڵ گرنگترینی ئەو بەڵا و موسیبەتانەی خستە بەردەمیان، کە لە ماوەی(٢٣) بیست و سێ ساڵی رابوردوودا رووبەرووی بوونەوە، کە بە کورتە ئەمانەن :

**یەکەم** : لە بەندیخانە و دادگای ئافیوون‌دا ستەمێکی زۆری لێ کراوە، بۆ نموونە : لە دادگادا سێ جار لائیحەی تاوانبارکردنی مامۆستا خوێندراوەتەوە و هەر جارێکیش دوو سەعاتی پێ چووە .. سەرەرای ئەوەش، کە پر بووە لە درۆ و بوختان ، مامۆستا داوای پێنج یان دە دەقیقەی کردووە مۆڵەتی بدەن تا وەڵام بداتەوە ، کەچیی ماوەیان نەداوە، مامۆستا خۆی هەشتا و یەك هەڵەی لەو لائیحەیە ژماردووە، کە بریتیی بووە لە پانزە لاپەرە .

**دووهەم** : کە مامۆستا تەفسیری کۆمەڵە ئایەتێك دەربارەی حیجاب و، میرات و ، ذیکری خوا و ، فرەژنیی ئەکات ، بەو کارەی تاوانباری ئەکەن.

---

[٣١٠] پەیامی پیران : ٦٦ ـ ٧١

**سێهەم** : یەکێکی تر لە تاوانەکانی، کە لە سەری سزایان دا بریتیی بـوو: لـە تێك دانی ئاسایشی وڵات ، بە مەرجێك مامۆستا و قوتابییەکانی بە هیچ شێوەیەك نەبوونەتە هۆی تێك دانی ئاسایش و ، هیچ کردەوەیەکی نایاساییان لە دەست دەر نەچووە

**چوارەم** : لەسەر نەکردنی شەپقەشیان بە هۆیەکی گرنگ لە قەڵەم دا بۆ تاوان بارکردنی ، بە رادەیەك، کە نەیان هێشت بەرگریی لە خۆی بکات .

**پێنجەم** : پەیامەکانی نوور، کە بوونەتە مایەی هیدایەتی هەزاران کەس و ، ئیمانیان پێ رزگار بووە ، لە هیچ و خۆڕایی دەستیان بە سەردا ئەگیرا

**شەشەم** : هەندێ لە قوتابییەکانی ظەننی چاکیان بە مامۆستا بـووە و ، بـە کەسێکی دین دار و موبارەکیان زانیوە ، بگرە هەندێ پلە و پایەی مەعنەوییان پێ بەخشیوە ، ئەمەش لە روانگەی ئەو خێـر و بەرەکەتـەوە، کـە بـە خوێندنـەوەی پەیامەکانی نوور دەستیان کەوتووە .. جا کاربەدەستان ئەمە ئەکەنە بیـانوو بـۆ تاوانبارکردن و سزادانی .

**حەوتەم** : هەرچەندە دادگای دەنیزلیی و ، دادگای تاوانە گەورەکانی ئەنقەرە و، دادگاکانی تەمییز بە کۆی دەنگ بریاری بێ تاوانیی مامۆستایان دەرکـرد ، کەچیی کاربەدەستان لە سزادان و بەندکردنی دەست کۆتا نەبوون ، بەڵکو بە درۆ و بوختان هەوڵیان ئەدا تاوانباری بکەن .

**هەشتەم** : پەیامی تیشکی پێنجەم دوو ساڵ لەبەردەستی دادگای دەنیزلیی و ئەنقەرەدا بوو، پاشان گێررایەوە بۆ مامۆستا و ، مۆڵەتی بڵاوکردنەوەشـی درا ئیتر مامۆستاش رێی دا قوتابییەکانی بڵاوی بکەنەوە، کەچیی کاربەدەستان هـەر خەریکی تاوانبارکردنی مامۆستا بوون، لەسەر ئەو پەیامە ..

**نۆهەم و دەهەم : دوو خاڵی گرنگن و مامۆستا حەز ناکات بڵاویان بکاتەوە** [٣١١]

**لە بەندیخانەی ئافیوون دا مامۆستا ئەم پەیامانەی نووسیین :**

**١ ـ پەیامی ( الحجة الزهراء )**

**٢ ـ ئومێدی پانزەهەمی لەمعەی بیست و شەشەم ، واتە پەیامی پیران.**

**٣ ـ تیشکی چواردەهەم، کە بریتییە لە نامەی ئامۆژگاریی و رێ نیشان دان بۆ قوتابیە دڵسۆزەکانی، کە ژمارەیان ئەگاتە (١٩١) صەد و نەوەد و یەك نامە لەگەڵ (٢١) بیست و یەك بەرگریی .**

**٤ ـ مەقامی دووهەمی وتەی سیانزەهەم، کە بریتییە: لە کۆمەڵە نامەیەکی بەندیخانەی ئافیوون، کە ئاراستەی گەنجان و بەندکراوان کراون ، دواتر لە رابەری لاواندا کۆ کرانەوە**

**شایانی باسە، کە کۆی نووسینەکانی مامۆستا نوورسیی لە بەندیخانەی ئافیوون دا ئەگاتە (٥٠٠) پێنج صەد لاپەرە و ، کۆی هەموو نووسینەکانیشی تا کۆتایی بەندیخانەی ئافیوون ئەگاتە (٥٠٠٠) پێنج هەزار لاپەرە ( ب٣ / ١٣٠٥ ) .** [٣١٢]

**بەرێز مامۆستا بایرام یۆکسێل، کە یەکێکە لە قوتابیە ناسراوەکانی مامۆستا و جێ متمانەی مامۆستا بووە، باسی چۆنیەتیی نووسینی پەیامەکانی نوورمان بۆ ئەکات، کە کاری سەرەکیی و هەمیشەیی قوتابیانی نوور بریتیی بووە: لە نووسینەوەی پەیامەکان .**

---

[٣١١] سيرة ذاتية : ٤٠٧ ـ ٤١٦

[٣١٢] سيرة ذاتية : ٤٣٢

کاتێك، کە قوتابیە بەندییەکان نزیکی ژوورەکەی مامۆستا ئەکەوتنەوە ، شەو بوایە و رۆژ بوایە دەنگی دوعا و نوێژ و ذیکـر و تەسـبیحاتی مامۆسـتایان وەك دەنگی هەنگ ئەبیست .

قوتابیەکانیش بە نهێنیی چاودێریی کارەکانی مامۆستایان ئەکرد، ئەوەبوو لە شەوێکی درەنگ‌دا سەرنجی ژوورەکەی مامۆستایان ئەدا ئەبینن چراکەی بە کزیی هەڵ کردووە و ، خۆیشی سەرگەرمی ذیکر و دوعاکردنە .. ئا لەو کاتانەی ژیانی بەندیخانەی ئافیوون‌دا مامۆستا تیشکی پانزەهەمینی نووسیی، کە ناوی ( الحجـة الزهراء ) ە لە کاتی دانانی ئەو پەیامەدا بـەینا و بـەین قوتابیـەکان لـە ژێـر پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستادا تێپەریان ئەکرد ، کە چاوی پێیان ئەکەوت پاکەتە شقارتەی بۆ فڕێ ئەدان، کە هەندێك لە تیشکی پانزەهـەمی خسـتبووە نـاوی و، ئـەوانیش دانەیەکیان لە بەری ئەنووسییەوە و ، بەم شـێوەیەش ئـەیان پاراسـت.
( ص / ٣ / ٣٢ ) [٣١٣]

---

[٣١٣] سيرة ذاتية : ٤٣٢

بەشی سیانزەهەم

# ساڵەکانی کۆتایی لە ئیسپارتە

**ساڵی ١٩٥٠ ز :**

مامۆستا و قوتابیەکانی ئەو ماوەیەی، کە بۆیان دیاریی کرابوو لە بەندیخانەی ئافیوون بەسەریان برد و لە ٢٠ / ٩ / ١٩٤٩ دا ئازاد کران ، بەڵام نەیانهێشت مامۆستا نوورسیی ئافیوون بەجێ بهێڵێ هەتا ٢ / ١٢ / ١٩٤٩ ، ئەوەبوو لەو ڕۆژەدا بە یاوەریی پۆلیسێك ڕەوانەی ئەمیرداغ کرا و ، لەوێ بۆ ماوەی دوو ساڵ بە زۆر نیشتەجێ کرا

مامۆستا نوورسیی لەم ماوەیەدا نامەی پیرۆزبایی بۆ قوتابیەکانی ئەنارد و ، بە هۆی قوتابیی دڵسۆز و گوێڕایەڵیەوە ، مامۆستا موصطەفا صونگور ، نوسخەیەکی بژارکراوی لە سەرجەمی پەیامەکانی نووری نارد بۆ سەرۆکی کاروباری دینیی [٣١٤] هەروەها نامەیەکی ڕێك و پێکی دۆستانەش بۆ سەرۆکی کاروباری دینیی ئەنێرێت ، کە تیایا ڕەزامەندیی لە هەڵوێستی ئەو مامۆستایانە دەرئەبرێت، کە بە ڕوخصەی شەرعیی کار ئەکەن و ، لەو ڕێگاوە خزمەت بە دین ئەکەن، مامۆستا داوا لە سەرۆکی کاروباری دینیی ئەکات، کە سێی نوسخە لە سەرجەمی پەیامەکان بە ڕۆنیۆ وێنە بگرێتەوە و ، دابەشیان بکات بەسەر لقەکانی سەرۆکایەتیی کاروباری دینیی‌دا لە سەرانسەری وڵاتدا .. ئەوەش ئەنووسێت، کە

---

[٣١٤] سيرة ذاتية : ٤٣٥

خزمەت کردنی پەیامەکانی نوور و بڵاوکردنەوەیان ئەرکی سەر شانی قوتابخانەی شەرعییە و ، سەرۆکایەتییش بناغە و سەرۆك و قوتابیی قوتابخانەی شەرعییە، کەواتە پەیامەکان موڵکی راستەقینەی ئەوانە، مامۆستا داوای چاپکردنی ئەو نوسخە قورئانەش ئەکات، کە ( توافقات ) روون ئەکاتەوە [٣١٥]

دوای گەیاندنی نامەکە مامۆستا صونگور بە نامەیەك مامۆستا نوورسیی ئاگادار ئەکات، کە بەرێز ئەحمەد حەمدیی سەرۆکی دیوانی کاروباری دینیی بەوپەری شادمانییەوە دیارییەکەی وەرگرت و بەڵێنی چاپکردنیشی دا [٣١٦]

لە ساڵی ١٩٥٠ دا هەڵبژاردن کرا ، بۆ ئەمە پارتی گەلی کۆماریی دەستی دایە دڵراکێشانی خەڵك بەو هیوایەی دەنگی بۆ بدرێت، ئەوەبوو بەڵێنی کردنەوەی قوتابخانەی لەبەرکردنی قورئان و ، تەکبیرەی جەژن بە زمانی عەرەبیی و، کردنەوەی کۆلێژی شەریعەت لە ئانقەرە دا ، بەڵام میللەت بەو شتانە دڵخۆش نەبوو و ، دژایەتیی ئەو پارتەی بۆ دین هەر لە یاد بوو، بۆیە لەو هەڵبژاردنەدا زۆرینەی دەنگەکان بە پارتی دیموکراتیی دران و ، ئەو پارتە ٣٩٦ دەنگی بەرامبەر بە ٦٨ دەنگی پارتی گەلی کۆماریی هێنا و ، لە ١٦ / ٥ / ١٩٥٠ دا حوکمی وڵاتی گرتە دەست و چەند کارێکی جوانی بەرامبەر بە دینی ئیسلام ئەنجام دا وەك :

١ ـ لە ١٦ / ٦ / ١٩٥٠ دا بانگدان کرایەوە بە عەرەبیی .

٢ ـ لە ١٤ / ٧ / ١٩٥٠ دا قانوونی چاوپۆشیی گشتیی دەرچوو .

---

[٣١٥] سيرة ذاتية : ٤٣٥ ـ ٤٣٦

[٣١٦] الملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢ / ٣٢٧

٣ ـ لە ٥ / ٨ / ١٩٥٠ دا ياساغيی لەسەر راديۆی قورئانی پيرۆز و بەرنامە دينييەكان هەڵگيرا

٤ ـ لە ٢١ / ١٠ / ١٩٥٠ دا دەرسی دين لە قوتابخانە سەرەتاييەكاندا بە رەسميی مۆڵەتی پێ درا

٥ ـ لە ١٠ / ٨ / ١٩٥٢ دا پەمانگاكانی دێهاتەكان داخران ، چونكە دەرسی ئيلحادييان تيا ئەخوێنرا

٦ ـ دەرسی دين بە رەسميی لە ١٣ / ٩ / ١٩٥٦ دا بۆ قوتابخانە ناوەندييەكان ماوەی پێ درا

لە دوای دەرچوونی پارتی ديموكراسيی لە هەڵبژاردنەكاندا مامۆستا نوورسيی بروسكەيەكی پيرۆزبايی بۆ جەلال بايارى سەرۆك كۆمار نارد ، بەو هيوايەی، كە خوا پشتيان بگرێت و بۆ خزمەتی ئيسلام سەركەوتوويان بكات .[٣١٧]

جا مامۆستا ئەم بروسكەيە بە زوبەير گوندۆز ئاڵبی قوتابيی ئەنووسێت و، پاشان ئاور ئەداتەوە بۆ لای و لێی ئەپرسێت :

ئايا ئەزانيت ئەم بروسكەی پيرۆزباييە بۆچ ئەنێرم ؟

مامۆستا زوبەير بێدەنگ ئەبێت و ، مامۆستا نوورسييش بۆی روون ئەكاتەوە :

كۆمارييەكان بە ديموكراتييەكان ئەڵێن : راستە سەعيد لەگەڵ ئێمەدا نيە، هەروەها لەگەڵ ئێوەش دا نيە ، بەڵكو مەبەستێكی تری بەرچاو گرتووە، ئيتر بەم وتەيە ئەيانخەڵەتێنن و ، وايان لێ ئەكەن هێزی دەوڵەت دژی دينداران و ، دژی قوتابيانی نوور بە كار بهێنن، بەڵام هەر، كە ديموكراتييەكان ئەم بروسكەی

---

[٣١٧] سيرة ذاتية : ٤٣٧ ، رجل القدر : ٢٥١

پیرۆزباییەیان وەرگرت پێیان ئەڵێن : سەعید دۆستی ئێمەیە، ئیتر ئەو کاتە هێزی دەوڵەت بۆ غەیری ڕێی راستی خۆی بەکار ناهێنرێت . ( ش / ٣٨٢ ) .

کە بروسکەکە گەیشتە دەست سەرۆك کۆمار وەڵامی بروسکەکەی بۆ مامۆستا ناردەوە و ، سوپاسێکی بێ پایانیشی کرد [٣١٨]

هەر لەم ساڵەدا ، ساڵی ١٩٥٠ ، حکومەتی نوێی تورکیا ، بە هەوڵ و کۆششی عەدنان مەندەریسی سەرۆك وەزیران ، بریاری دا، کە بانگی موحەممەدیی بە شێوە شەرعییەکەی ، واتە بە زمانی عەرەبیی ، پەخش بکرێت ، دوای ئەوەی، کە لە ساڵی ١٩٢٨ ەوە قەدەغە کرابوو، هەتا ئەوەبوو لەلایەن صەدان گەنجی رۆشنبیرەوە بروسکەی دەست خۆشیی بۆ سەرۆك وەزیران نێردرا [٣١٩]

**ساڵی ١٩٥١ :**

لەم ساڵەدا مامۆستا نوورسیی نوسخەیەك لە دەست نووسی پەیامی ( ذو الفقار ) ی پێشکەش بە پاپا کرد و ، ڤاتیکانیش بە رێزەوە بروسکەی دەست خۆشیی بۆ مامۆستا ناردەوە [٣٢٠]

هەر لەم ساڵەدا مامۆستا نامەیەکی بۆ ئانقەرە بۆ سەرۆك کۆمار و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران نارد و تیایا روونی کردەوە، کە قوتابیانی نوور لە سیاسەت کەناریان گرتووە و ، نایانەوێ دین بکەنە داردەستی سیاسەت و ، مەبەستیان

---

[٣١٨] سيرة ذاتية : ٤٣٧ ـ ٤٣٨ ، رجل القدر : ٢٥٢

[٣١٩] سيرة ذاتية : ٤٣٨

[٣٢٠] الملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢ / ٣٤٦ ، رجل القدر : ٢٥٢ ـ ٢٥٣

تەنها رەزامەنديی خوايە و ، هەرگيز دين ناكەنە داردەستی سياسەت يان دەسەڵات يان دنيا هەر هەمووی .[٣٢١]

دوای ئەوەی مامۆستا نوورسيی دوو ساڵی لە ئەميرداغ بەسەر برد ، لە مانگی ئەيلوولی ١٩٥١ دا بەرەو ئەسكی شەهر كەوتە رێ و ، لەوێ لە ئوتێلی يەڵـدزدا نزيكـەی مـانگ و نيوێـك جـێگير بـوو، و نامەيـەكی دوور و درێژيشـی بـۆ قوتابيەكانی نووسيی .[٣٢٢]

**ساڵی ١٩٥٢ :**

دوای ئەوە مامۆستا لە كۆتايی ساڵی ١٩٥١دا بەرەو ئيسـپارتە كەوتـە رێ و حەفتا رۆژی تێدا مايەوە، لەوێ بە قوتابيەكانی گەيشت و ، رۆژانی رابوردوويان ئەهێنايەوە ياد

لەو رۆژانەدا هەندێ لە قوتابيانی زانكۆ لە ئەستەنبووڵ پەيامی رابەری لاوانيان بە پيتی لاتينيی بە چاپ گەياند، لەسەر ئەمە دەعوا لەسەر مامۆستا نووسـرا، كە گوايە پێچەوانەی مادەی ( ١٦٣ ) ی دەستووری توركيی جووڵاوەتـەوە ، كـە هەموو چالاكييەك ياساغ ئەكات، كە مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەت بێت لەسەر بنەمای دينی ئيسلام .

مامۆستا بانگ كرا بۆ ئەستەنبووڵ هەتا ببرێتە بەردەم دادگای جەزای گەورە. ئەوەبوو رۆژی ٢٢ / ١ / ١٩٥٢ بۆ لێكۆڵينەوە لەو دەعوايە دياريی كرا.

---

[٣٢١] الملاحق ، ملحق أميرداغ : ٢ / ٣٣٣ ـ ٣٣٤

[٣٢٢] سيرة ذاتية : ٤٤١ ، رجل القدر : ٢٥٣

مامۆستا لە ١٥ / ١ / ١٩٥٢دا بەرەو ئەستەنبووڵ کەوتە رێ، مامۆستا (٢٧) بیست و حەوت ساڵ لەوەو پێش سەردانی ئەستەنبوڵی کردبوو ، بۆیە خەڵکێکی زۆر بۆ سەردانی بەرەو ئوتێلی ئاق شەهر و ، پاشانیش ئوتێلی ( رشادية ) کەوتنە رێ .

لە رۆژی ٢٢ / ١ دا دادگا بەسترا و ، مامۆستاش ـ کە صەدان لە قوتابیانی نوور دەوریان دابوو ـ هات بۆ دادگا، هۆڵی دادگا لە خەڵك پر بوو بوو، هەر هەمووان چاوەڕوانی ئەنجامی دادگا بوون ، بە تاسەوە بوون، بزانن زانای خواناس لەبەردەم دادگادا هەڵوێستی چۆن ئەبێت !! بەڵێ رێ رەوان و شەقامەکان پربوون لە خەڵك ..

مامۆستا لە شوێنی تاوانباراندا دانیشت .. ( مدعي عام ) یش دەستی بە خوێندنەوەی تەقریری ئەو خەبیرانە کرد، کە وردبینیی پەیامی رابەری لاوانیان پێ سپێررا بوو ..

مامۆستا دادگایی کرا .. خەبیرەکانیش ئەوەیان دەربریی بوو، کە دانەری ئەو پەیامە هەوڵ ئەدات فیکرەی دین بڵاوە پێ بکات و ، ئەیەوێ نەخشەیەکی تایبەت بۆ گەنجەکان بکێشێت و ، داوایش لە ئافرەتان ئەکات خۆیان داپۆشن و بە جل و بەرگی سفوورانەوە لە ماڵ دەرنەچن، هەروەها داوای خوێندنی دەرسی دین ئەکات، کەواتە ئەیەوێت دەوڵەتێك لەسەر بنەما دینییەکان دابمەزرێنێت، دوای ئەوەی، کە ( مدعي عام ) تەقریری تاوانبارکردنەکەی خوێندەوە ، مامۆستا ( بديع الزمان ) یش وەڵامی دانەوە [٣٢٣]

---

[٣٢٣] سيرة ذاتية : ٤٤٤ ـ ٤٤٥

مامۆستا بە وردیی ستەم و دەست درێژییەکانی حکومەتەکانی تورکیا ئەخاتە بەرچاو لە ماوەی (٢٨)بیست و هەشت ساڵدا [٣٢٤]

بەم شێوەیە دانیشتنی یەکەمی دادگا کۆتایی پێ هات ، بەو هیوایەی، کە لە ١٩ی شوباطدا دانیشتنی دووهەم ساز بکرێت . [٣٢٥]

لە کاتی دیاریکراودا دانیشتنی دووهەمی دادگا ساز کرا ، بەڵام ئەوندە قەڵەباڵغ بوو بە پۆلیسیش چار نەئەکران .

دادگا سەرنجی دا لەو حاڵەتەدا کاری بدیع الزمان جێبەجێ ناکرێ ، بۆیە سەرۆکی دادگا داوای لە خەڵکەکە کرد ماوە بدەن تا دادگا کاری خۆی ئەنجام بدات .

بەم داوایە خەڵکەکە کشانە دواوە و ، دادگاش دەستی بە کاری خۆی کرد، ئەوەبوو خاوەنی چاپخانەکەیان بانگ کرد و ، گوێش بۆ شاهێدیی پۆلیس گیرا، مامۆستاش رەخنەی لە تەقریری خەبیرەکان پێشکەش بە دادگا کرد، کە کاتی نوێژی عەسر هاتە کایەوە ، مامۆستا داوای کرد مۆڵەتی بدەن نوێژ بکات ، دادگا داواکەی جێبەجێ کرد ، ئەوەبوو سەرۆکی دادگا کۆتایی بە دانیشتنی دووهەمی ئەو دادگایە هێنا

دانیشتنی سێهەمیش لە ٥ / ٣ / ١٩٥٢دا ئەنجام درا .. ئەمجارە حکومەت صەدان پۆلیسی هێنا بۆ پاراستنی دادگا

---

[٣٢٤] سیرة ذاتیة : ٤٤٦ ـ ٤٤٨

[٣٢٥] سیرة ذاتیة : ٤٤٨

سەرەتا دادگا گوێی بۆ شاهێدیی ئەو قوتابییەی زانکۆ گرت، کە پەیامەکـەی چاپ کردبوو، پاشان پارێزەرەکانی مامۆستا بەرگرییان لە مامۆستا کرد و پەرچی ئەو تاوانانەیان دایەوە، کە خرابوونە ئەستۆی مامۆستا .[٣٢٦]

یەکێك لەو پارێزەرانە ناوی مەهری حەلاو بوو و ، یەکێکی تریان سـنی الـدین باشاق و ، یەکێکی تریان عەبدوررەحمان شەرەف لاچ ..

لە کۆتایدا سەرۆکی دادگا رووی کردە مامۆستا و لێی پرسیی :

ـ سەرەرای ئەوەی وتت ، شتی تر هەیە پێت خۆش بێت بیلێیی ؟

ـ تکام وایە ماوەم بدەن وشەیەك زیاد بکەم .

ـ فەرموون .

ـ من شایانی ئەو ستایشە نیم، کە وەکیلە بەرێزەکانم بۆمیان کرد ، چونکە من تەنها خزمەتکارێکی دەستەوسانی قورئـان و ئیمـانم، جگـە لەمـە هیچـم نیـە بیلێم .[٣٢٧]

بەم شێوەیە دادگا کۆتایی بە کارەکانی هێنا و ، دوای راوێژیش دەستەی دادگا بە یەك دەنگیی بریاری بێ تاوانیی مامۆستای ئاشکرا کرد و ، قوتابیەکانی زانکۆ و خەڵکیی ئامادەی هۆڵی دادگاش چەپڵەیەکی توندیان بۆ ئەو بریارە لێ دا ..[٣٢٨]

لە هەمان کاتدا نووسەرە ئیسلامییەکان لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەستیان دایە نووسین لەسەر کارەکانی مامۆستا نوورسیی و چالاکیی قوتابیانی نوور ، وەك مامۆستا ئەشرەف ئەدیب، کە لە گۆڤاری ( سبیل الرشاد ) ی بەرگی پێنجـەمی

---

[٣٢٦] سيرة ذاتية : ٤٤٨ ـ ٤٤٩ ، رجل القدر : ٢٥٨ ـ ٢٦٠

[٣٢٧] سيرة ذاتية : ٤٤٩ ـ ٤٥٤ ، رجل القدر : ٢٦٠

[٣٢٨] سيرة ذاتية : ٤٥٤ ، رجل القدر : ٢٦٠

ژمارە ( ١١٩ ) ی ساڵی ١٩٥٢دا باسێکی لە ژێر ناونیشانی ( دوای دابرانێکی دوور و درێژ ) دا لەسەر مامۆستا نووسیی بوو، و [٣٢٩] وەك ئەدیبی شاعیر عوثمان یۆکسێل، کە رۆژنامەنووس و نووسەرێکی بەجەرگ بوو، و گۆڤاری ( الفدائي ) دژی عەلمانییەکان دەرکرد، هەر ئەوەندە بوو، یەك دوو ژمارەی لەو گۆڤارەی دەرکرد ، لەبەر توندیی بابەتەکانی رەوانەی بەندیخانە کرا و ، لە ماوەی ساڵانی ( ١٩٤٧ ـ ١٩٦٢ ) تەنها (٣٣) سیی و سێ ژمارەی لێ دەرچوو، لە ساڵی ( ١٩٦٥ ـ ١٩٦٩ ) بە ئەندامی پەرلەمان هەڵبژێررا و ، لە ١٠ / ٩ / ١٩٨٣ و لە تەمەنی (٦٦) شەصت و شەش ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، ئەم بەرێزەش لەسەر مامۆستا نوورسیی و قوتابیەکانی باسێکی زۆر جوانیی نووسیی بەو هیوایەی رۆڵەی موسڵمانان لە بانگی مامۆستا تێ بگات . [٣٣٠]

**ساڵی ١٩٥٣ :**

دوای بێ تاوان دەرچوونی مامۆستا نوورسیی لە دادگای ئەستەنبوڵ گەرایەوە بۆ ئەمیرداغ، لە رۆژێکی مانگی رەمەزانی پیرۆزدا مامۆستا ویستی لە ماڵ دەربچێت و بە کێڵگەکانی دەوروبەری شاردا بگەرێت .. خێرا عەریفێکی پۆلیس و سێ پۆلیس دوای کەوتن .. نەیانهێشت مامۆستا گەرانەکەی تەواو بکات ، رێیان پێ گرت و ، داوایان لێ کرد شەپقە لەسەر بکات، کە بە گوێی نەکردن بردیان بۆ بنکەی پۆلیس و ، ئەویش لەوێ شکاتی لەو موعامەلە ناشیرینە کرد و، پێشنیارێکیشی بۆ وەزارەتی داد و وەزارەتی ناوخۆ لە ئانقەرە نارد و ، ئەو کردەوە

---

[٣٢٩] سيرة ذاتية : ٤٥٥ ـ ٤٥٨

[٣٣٠] سيرة ذاتية : ٤٥٨ ـ ٤٥٩

ناشـیرینانەی تاوانبـار کـرد ، هـەروەها نوسخەیەکیشـی نـارد بـۆ یـەکێك لـە قوتابیەکانی لە ئانقەرە هەتا بە دوایدا برۆن .

لە ئانقەرەش هەندێ لـە قوتابیـانی مامۆسـتا بریاریـان دا نوسـخەیەك لـەو پێشنیارە بنێرن بۆ رۆژنامەیەکی ئیسلامیی، کە لە صامسۆن بە نـاوی جیهـادی گەورەوە دەرئەچوو و ، لەوێ بلاو کرایەوە

لەو کاتەدا رووداوی رۆژنامەنووسی ناسراو ئەحمەد ئەمین یالمان [٣٣١] رووی دا، کە ئەوەبوو گەنجێکی موسلمان هەولی دا بیکوژێت و ، چەند گوللەیەکی پێوە نا، بەلام شوێنی کاریگەریی نەگرت و بۆی نەکوژرا

هەموو ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی، کە دژی ئیسلام بوون، ئەم رووداوەیان کـردە بیانوو بۆ دووان لە ئیسلام و دژایەتیی کردنی، بە جارێك کەوتنە هێرش کردنـە سەر لایەنە ئیسلامییەکان ، بە رادەیەك، کە حزبی حاکمیش دەستە پاچە وەسـتا بوو، و چاری بارودۆخەکەی پێ نەئەکرا، تا ئەوەبوو فەرمانی داخسـتنی هـەموو گۆڤار و رۆژنامەیەکی ئیسلامیی دەرچوو و ، هەموو ئەو نووسەر و رۆشنبیرانەی، کە کاریان تیا ئەکردن بەند کران .

[٣٣١] رۆژنامەنووسێکی جوولەکەی دۆنەمە بوو، ئەو جوولەکانە بە رواڵەت موسلمان بووبوون و ، بـە نهێنیـی لەسەر دینی جوولەکە مابوونەوە و ، خاوەنی لێهاتن و توانای ئابووریی و سیاسیی بەهێز بوون ، بۆیە دەوری وێران کاریی زۆریان لە تورکیادا ئەبینیی، ئەو رۆژنامەنووسـە لـە جوولەکـەکانی تـر زیـاتر دوژمنایـەتیی ئیسـلامی دەرئەخست ، هەندێ داواکاریی هەبوون، کە دژی موسلمانان بـوون ، وەك داواکردنـی دامەزرانـدنی دەولـەتێکی ئەرمەنیی لە تورکیا و ، وەك داواکردنی ئەوەی، کە ئەمریکا بە هێزی سەربازیی دەست بەسەر تورکیادا بگرێت لەبەر ئەوەی تورکیا خۆی توانای نیە کاروباری خۆی هەڵبسوورێنێت، هەروەها سەرنووسەری رۆژنامەی ( طان ) بوو .

لەم هەڵمەتەدا بەڕێوەبەری لێپرسراوی ڕۆژنامەی ( گەورەترین جیهاد ) و مامۆستا موصطفا صونگور گیران و بران بۆ دادگای شاری صامسۆن و ، لەوێ دادگا حوکمی دان ، بەڵام لە دادگای تەمییز بڕیاری بێتاوانییان بۆ دەرچوو .

نەیارانی ئیسلام هەستیان کردبوو، کە قوتابیانی نوور لە زیادکردندان ، بۆیە لە بیانوو بوون، نزیکەی (٦٠٠) شەش صەد قوتابیی نوور حوکم بدەن ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان دەست نەئەکەوت .

دواجار لە شاری صامسۆن دەعوایەك لە دژی مامۆستا بدیع الزمان تۆمار کرا، ئەویش لەسەر بڵاوکردنەوەی مەقالەیەك لە ڕۆژنامەی گەورەترین جیهاد دا لەژێر ناونیشانی گەورەترین سەلماندن، داوا کرا مامۆستا ئامادەی دادگای صامسۆن بێت ، بەڵام مامۆستا سەرەرای پیریی نەخۆشیش بوو، بۆیە لە خەستەخانەی ئەمیرداغ و ئەسکی شەهر پشتگیریی لێ کرا کە توانای سەفەری نیە ، کەچیی دادگای صامسۆن پێی لێ داگرت، کە هەر ئەبێت ئامادە بێت ..

مامۆستا ناچار بوو، بەرەو ئەستەنبووڵ بکەوێتە ڕێ و لەوێشەوە بۆ صامسۆن . مامۆستا نزیکەی سێ مانگ لە ئەستەنبووڵ مایەوە، کە زیاتر لە ماڵی قوتابیی بەڕێزی موحەممەد فرنجیی ئەمایەوە

شایانی باسە کە لەو ساڵەدا ، ساڵی ١٩٥٣ ، ئەستەنبووڵ خۆی بۆ ئاهەنگی تێپەڕبوونی (٥٠٠) پێنج صەد ساڵ بەسەر فەتح کردنیدا ئامادە ئەکرد، ئەوەبوو ئاهەنگێکی پڕ شکۆیان بۆ ئەنجام دا و ، مامۆستاش بۆ ئەو ئاهەنگە بانگ کرا و، لەوێ لەو ئاهەنگەدا چاوی بە پەتریرکی ڕۆم (( ئاشنۆ کراس )) کەوت و ئەم وت و وێژەیان کرد :

مامۆستا : ئەگونجێ لە رۆژی قیامەتدا ئەهلی نەجات بن ئەگەر ئیمان بە دینی نەصرانیی حەق بهێنن بەو مەرجەی دان بە پێغەمبەرایەتیی سەردارمان موحەممەد ﷺ و قورئانی پیرۆزدا بنێن، کە کتێبێکە لای خواوە هاتووە .

ئاشنۆ : من دان بەوەدا ئەنێم .

مامۆستا : چاکە ، جا ئایا ئەمە لەبەردەم سەرۆکە رۆحانییەکانی تردا ئاشکرا ئەکەن ؟

ئاشنۆ : بەڵێ ، من ئەوە ئەڵێم ، بەڵام ئەوان وەری ناگرن . ( ش / ٤٠٥ ).

لەو کاتانەدا خۆرهەڵات ناسێکی ئینگلیزیی سەردانی ئەستەنبوڵی کرد و، دەربارەی حەوت ئاسمانەکە وتارێکی دا کە گوایە ئەوە راست نیە، بۆ سبەینێ قوتابیانی نوور ئەو تەفسیرەی مامۆستایان لە شێوەی بڵاوکراوەیەکدا پەخش کرد، کە دەربارەی حەوت ئاسمانەکە لە ( إشارات الإعجاز ) دا بڵاوی کربوویەوە، کاتێك، کە خۆرهەڵات ناسەکە لەو باسە ئاگادار بوو وتارەکەی ئەو رۆژەی کورت کردەوە و ، دەستی لێ هەڵگرت، کە بە تەما بوو پێنج رۆژ بخایەنێت و ، بێدەنگ ئەستەنبوڵی بەجێ هێشت . ( محمد فرنجي ، سۆن شاهێدلەر : ٤ / ٣٥٦ ) .

کە مامۆستا گەیشتە ئەستەنبوڵ نەخۆشییەکەی زیادی کرد و ، توانای سەفەری نەما، ئەوەبوو لە دەستەی تەندروستیی ئەستەنبوڵ تەقریرێکی وەر گرت و ناردی بۆ دادگا

ئەم تەقریرە پشتگیریی لە مامۆستا ئەکرد، کە نە لە وشکایی و نە لە دەریا و نە لە ئاسمانەوە توانای سەفەری نیە ، کەچیی ( مدعي عام ) هەر پێی لێ

دائەگرت بۆ ئامادە بوون، سەرەنجام دادگا بریاری دا، کە دادگای ئەستەنبووڵ دادگایی مامۆستا بکات .[٣٣٢]

ئەوەبوو دادگای ئەستەنبووڵ دادگایی کرد و بریاری بێ تاوانیشی بۆ دەرکرد

**سەردانی بارلا :**

مامۆستا نزیکەی سێ مانگ لە ئەستەنبووڵ مایەوە ، پاشان سۆزی بۆ ئەو شارانە جوولا، کە هەر یەکەیان ماوەیەك تەمەنی تیا بەسەر بردبوو .

لە پێشەوە سەردانی ئەمیرداغی کرد ، پاشان بەرەو ئەسکی شەهر کەوتە رێ و، لەوێشەوە چوو بۆ ئیسپارتە و هەشتا رۆژی تێدا مایەوە .. لەوێشەوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە قوتابیەکانی بەرەو بارلای خۆشەویست کەوتنە رێ .. ئەو شارەی، کە یەکەم قوتابخانەی پەیام و قوتابیانی نوور، تا لەوێوە بڵاوە بکەن و ، شار و شارۆچکە و گوندەکان بە نووری ئیمان رۆشن بکەنەوە .. بەڵێ ، بارلا یەکەم بنکەی پەیامەکان بوو ..

مامۆستا (٢٧) بیست و حەوت ساڵ لەوەو پێش بە نەفیکراویی هێنرایە بارلای کەنار تا لەوێ لەبیر بچوێتەوە .. تا ناوی بکوژێتەوە کەچیی سۆزی پەروەردگار بەرامبەر بە بەندەی موخلیص جوولا و ، بەرەکەتی خستە کاریەوە و ، لەوێ بەشێکی گرنگی پەیامەکانی نووسیی ، بە تایبەت وتەکان و مەکتووبات و بریسکەکان .. خوا ویستی وەها بوو دوای هەشت نۆ ساڵ بەندەی ملکەچی بارلا بەجێ بهێڵێ و ئەم شار و ئەو شار و ، ئەم بەندیخانە و ئەو بەندیخانەی پێ بکرێ

---

[٣٣٢] سیرة ذاتیة : ٤٥٩ ـ ٤٦١ ، رجل القدر : ٢٦١ ـ ٢٦٤

هەتا ئـەمڕۆ .. ئـەمڕۆش وا دڵـی گـڕی گرتـووە بـۆ سـەردانی ئـەو شارۆچـکە خنجیلانەیە و ، پێی خۆشە سەردانێکی دۆستە خۆشەویستەکانی بکات .

ئەو ڕۆژە بە تاقی تەنیا ڕەوانەی بارلا کرا ، کەچیی وا ئەمڕۆ لەگەڵ دەستەیەك لە قوتابیەکانی، کە نوور لە چاویان‌دا ئەدرەوشـێتەوە ، گەراوەتـەوە بـۆ بـارلای خۆشەویست .. نەك هەر ئەم دەستەیە ، بەڵکو صـەدان هـەزار گـەنجی وڵات بـە نووری ئیمان بەختەوەر بوون و شار و گوندەکانیان بە ڕەوشتی جوان ڕازاندۆتەوە

خەڵکی بارلا هەواڵی هاتنی مامۆستایان بیست .. بە ژن و پیاو و ، منداڵ و گەنجەوە هاتنە پێشوازیی مامۆستای ئازیزیان و ، منداڵـەکانیش بازیـان ئـەدا و ئەیان وت :

ـ مامۆستا هات .. مامۆستا هات ..

خۆ دیارە ئەو منداڵانە مامۆستای بەرێزیان نەدیی بوو ، بەڵکو لە دایك و باوك و کەسوکاریان بیستبوویان، کە چۆن مامۆستایەکە !!

لە کاتێك‌دا، کە مامۆستا بەرەو ئەو خانووە ئەڕۆیشت، کە هەشت ساڵ تیایـا مابۆوە و ، یەکەم قوتابخانەی نوور بـوو ، لەبـەردەم مـاڵی قوتـابیی دێرینیـدا ، موصطەفا چاویش تێپەری کرد .. ئەو قوتابیە دڵسۆزەی، کە لە نێو لق و گـەڵای سوورە چنارەکەی بەر ماڵەکەیدا ژوورە سەرنەگیراوەکەی بۆ دروست کرد ، تـا لـە هاوین‌دا شەوانە لەوێ خەریکی خواپەرستیی و تێ ڕامان بێت ..

کە لەبەردەم ماڵی ئەو بەرێزەدا تێپەری کرد ، سەرنجی دا قوفڵێکی گەورە لـە دەرگای ماڵەکەی دراوە .. ئەوەبوو قوتابیە بەوەفاکەی لە ساڵی ١٩٣٧ دا کۆچی دوایی کردبوو و ، کە مامۆستا لە بارلا دەرچوو بوو ئیتر یەکتریان نەبینی بـۆوە . مامۆسـتا خۆی پێ نەگیرا ، فرمێسکەکانی بە خور هاتنە خوارەوە و ، کوڵمی تەر بوون .

لەوێ تێپەریی و گەیشتە بـەردەم ماڵـە پێشـوەکەی .. گەیشـتە لای یەکـەم قوتابخانەکەی و ، درەختە خۆشەویستەکەی بەردەم ماڵەکـەش قـنج لەبـەردەمیا

وەستا بوو ، هەروەك ئەویش بەخێر هاتنەوەی ئازیزی تامەزرۆی بکات و، بێتاقەتیی خۆی بۆ ئازیز و خواپەرستیی و ذیکر و ویردەکانی دەر بخات .. دڵی ئەکولا .. ئەم درەختە خۆشەویستە هاودەمی هەشت نۆ ساڵی بووە و ، بە زستان و بە هاوین‌دا هاوبەشی ویرد و ئەورادەکانی بووە .. دڵی هاتە جۆش .. داوای لە قوتابییەکانی و لە خەڵکی بارلاش کرد ماوەیەك بە تەنیا بەجێی بهێڵن .

کە ئەوان کشانە دواوە ، مامۆستا لە درەختەکە چووە پێشەوە .. لە دۆستی تەنیایی و بێکەسیی هەشت نۆ ساڵی چووە پێشەوە .. بە تاسەوە باوەشی پێدا کرد .. دڵی پڕ بوو و ، فرمێسکەکانی بە خور لە چاوی ئەهاتنە خوارەوە .. تێر تێر گریا .. لە راستییدا ئەم درەختە وەك ئەندامێکی لاشەی مامۆستای لێ هاتبوو .. پارچەیەکی ژیانی بوو .. شەوانێکی زۆر و زەبەندە لەناو ژوورە لە تەختە دروست کراوەکەدا و لە نێوان لق و گەڵاکانیدا خەریکی شەونوێژ و ذیکری خوا بوو .. یان خەریکی دانانی پەیامەکانی نوور بوو، و گوێیشی لە دەنگی باڵندەکان و گەڵاکان بوو .. ئەمە بە هاوین‌دا .. بە زستانیش‌دا شەوانێکی دوور و درێژ لە ژوورەکەیدا بە تاقی تەنیا خەو لە چاوی ئەتۆرا و ، جگە لە دەنگی لق و پۆپی درەختەکە، کە رەشەبا لێی ئەدا هاودەمێکی نەبوو جاروباریش دەنگی دڵۆپەی باران ئەهاتە گوێی .. بە راستیی درەختەکە تاقەتی زستان و هاوینی ئەو بوو لە تەنیایی و بێ هاودەمییدا .. هاورێی بێکەسیی و بێنازیی بوو ..

وا ئێستاش ، دوای بیست ساڵ لە دووریی و دابران ، مامۆستا گەڕاوەتەوە لای دۆستی دێرینی و باوەشی خۆشەویستیی بۆ ئەکاتەوە و ، بە کوڵ فرمێسکی خۆشەویستیی بۆ هەڵ ئەرێژێ ..

دوای تاسە شکانی لە درەختەکە سەرکەوتە سەرەوە بۆ ژوورەکەی و نزیکەی دوو سەعات تیایدا بە تەنیا مایەوە، لە ژوورەکەیدا بیرەوەرییەکانی ئەهاتنە یاد و ئەگریا .. شەوان و رۆژانێکی زۆریشی لەم ژوورەدا بەسەر بردبوو .. قوتابییەکانی و

خەڵکەکەش لە دەرەوە گوێیان لە گریانی مامۆستا بوو، لە ژوورەکەبدا ، ئەوانیش دڵیان پڕ ئەبوو ..

پاشان کەوتە هەواڵ پرسینی خەڵکەکە و ، ئەوانیش بە گەرمیی بەخێرهاتنیان لێ کرد .. هەندێك لە دۆستانی کۆچیان بۆ قیامەت کردبوو .. هەندێکیش بەردەوام خەریکی خزمەت بوون ..

کاربەدەستان مامۆستایان هەڵدایە ئەم شوێنە دوورە هەتا ئاسەواری خۆی و دینەکەی نەمێنێ ، کەچیی لە بارلادا بە گەرمیی سەری کردە خواپەرستیی و، دەستیشی دایە نووسینی پەیامەکان ، تا ببنە هۆی رزگارکردنی ئیمانی ئەوانەی، کە بە ئیخلاصەوە ئەیان خوێندەوە [٣٣٣]

**ساڵی ١٩٥٦ :**

**دادگای ئافیوون پەیامەکان بێ تاوان دەرئەکات :**

ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٤٨ دا دادگای ئافیوون لیژنەیەکی لە شارەزایان پێك هێنا بۆ وردبینیی کردنی پەیامەکانی نوور، و دەربرینی رای خۆیان لەسەریان، کە ئایا دژایەتیی یاسای تورکیی ئەکەن ؟

ئەم دادگاییە هەشت ساڵی پێچوو ، ئەوسا لە ١١ / ٩ / ١٩٥٦ دا ، بە پشت بەستن بەو تەقریرەی، کە لەلایەن لیژنەی شارەزایانەوە لە ٢٥ / ٥ / ١٩٥٦ دەرچووبوو ، دادگا بریاری دا، کە ئەم پەیامانە پێچەوانەی یاسای تورکیی نین و، هیچ شتێکی یاساغیان تێدا نیە .[٣٣٤]

---

[٣٣٣] سيرة ذاتية : ٤٦٤ ـ ٤٦٦ ، رجل القدر : ٢٦٤ ـ ٢٦٥

[٣٣٤] سيرة ذاتية : ٤٦٦ ، رجل القدر : ٢٦٥ ـ ٢٦٦

**چاپکردنی پەیامەکان :**

کە دادگای ئافیوون بڕیاری بێتاوانیی پەیامەکانی دا ، مانای وا بوو پەیامەکان هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە و ، مامۆستا و قوتابیانی ئەتوانن بە سەربەستیی چاپیان بکەن و بڵاویان بکەنەوە، قوتابیان بە پەلە دەستیان دایە چاپ کردنی پەیامەکان، لە ئەستەنبوڵ و ئانقەرە و صامسۆن و ئەنطالیا چاپخانەکان کەوتنە چاپکردنی پەیامەکان، بەر لەوەش، کە مەلزەمەکان چاپ بکرێن، مامۆستا خۆی پیایانا ئەچووەوە .. بەم چاپکردنە مامۆستا زۆر شادمان بوو بۆیە ئەی وت :

« ئەمە جەژنی پەیامەکانی نوورە، من چاوەڕوانیی وەها رۆژێکم ئەکرد ، بە راستیی ئەرکی سەرشانی من کۆتایی پێ هات و ، بەم زوانە کۆچ ئەکەم » .

مامۆستا بۆ هەر کارێك لە ماڵ دەرچوایە خێرا ئەگەڕایەوە ماڵەوە و ، بە قوتابیەکانی ئەوت : « ئێستە مەلزەمەکان گەیشتوون .. نابێت دەست بەرداریان بین چاوەڕوانمان بن ، ئەبێت هەر ئێستە بگەڕێینەوە » . ( ش/ ٤١٣ ) .[٣٣٥]

**ساڵی ١٩٥٧ و هەڵبژاردنەکان :**

لەم ساڵەدا هەڵبژاردنی گشتیی لە تورکیادا ئەنجام درا، کە دوو حیزبی سەرەکیی دیموکراتیی و گەلی کۆماریی بەرامبەر یەك وەستا بوون، جا حیزبی دیموکراتیی هەرچەندە حیزبێکی ئیسلامیی نەبو، بەڵام چونکە دژایەتیی لەگەڵ ئیسلام دۆستەکاندا نەئەکرد ، بگرە ئازادیی لە وڵاتدا دامەزراندبوو ، لایەنە ئیسلامیەکان دەنگیان بۆ ئەو ئەدا بەڵێ مامۆستا نوورسییش حیزبێکی

---

٣٣٥ سيرة ذاتية : ٤٦٦ ، رجل القدر : ٢٦٦

سياسيی دانەمەزراندبوو و ، هيچ چالاكييەكی سياسيی ئـەنجام نەئـەدا ، لەگـەڵ ئەوەش‌دا بڕياری دا دەنگ بۆ حيزبی ديموكراتيی بدات ، تا حيزبی گەلی كۆماريی دەسەڵات وەرنەگرێتەوە، هەرواش بوو، چوو بۆ دەنگ‌دان و ، دەنگيشی بۆ حيزبی ديموكرات دا . ( ش/ ٤١٦ ) .[٣٣٦]

**دوارۆژەكانی تەمەنی :**

لە دوا ساڵەكانی تەمەنيدا مامۆستا لەگەڵ قوتابيەكانی لـە شـاری ئسـپارتە مايەوە و ، جار بە جارێكيش سـەردانی بـارلا و ئـەميرداغی ئـەكرد و ، لەبـەر ئەوەش، كە تەمەنی زۆر بوو، زۆربەی كات لە جێگادا بوو .

بە كەميی ئەی توانيی چاوی بە دۆستانی بكەوێت ، بۆيە نەی‌ئەتوانيی چاوی بە دۆستانی بكەوێت ، بۆيە نەی ئەتوانيی پێشوازيی لە صەدان ميوانی بكـات ، بەڵكو ئەی وت :

(( خوێندنەوەی پەيامەكانی نوورصەد ئەوەندەی قسەكردن لەگەڵ مـن چاكترە )) .

قوتابيەكان لە تەندروستيی مامۆستا ئاگادار بوون ، بۆيە هەتا داوای نەكردنايە نەئەچوونە ژوورەوە لای، لەگەڵ ئەوەش‌دا مامۆسـتا لـە جيهـان و هەواڵـەكانی دانەبرابوو، ئەوەبوو قوتابيەكانی دياريی كردبوو تا لە هەواڵی گرنگی رۆژنامەكان ئاگاداری بكات .. هەروەها بايەخی بە چاپ كردنی پەيامەكان و ، دادگايی زۆر و زەبەندەی قوتابيان ئەدا [٣٣٧]

---

[٣٣٦] سيرة ذاتية : ٤٦٧ ، رجل القدر : ٢٦٦ ـ ٢٦٧

٣٣٧ سيرة ذاتية : ٤٦٧ ، رجل القدر : ٢٦٧

**مەسەلەی ئانقەرە :**

**لە ١٦ی نیسانی ١٩٥٨ دا هەموو ئەو قوتابیانــە گـیران، کـە لــە خزمــەتی مامۆستادا بوون و ، ئەوانەش، کە لە ئانقەرە و ئەستانبووڵ و ئیسپارتە خەریکی بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی نوور بوون ، ئەوەبوو بەکر بەرقی[٣٣٨] پارێزەری موسڵمان بۆ بەرگریکردن لە پەیامـەکان و قوتابیان هاتە پێش، ئەم پارێزەرە پێش هــەموو شتێك سەردانی بەندیخانەی ئانقەرەی کرد و لەگەڵ قوتابیانی نووری ئەو بەندیخانەیە کۆبۆوە و پێی وتن :**

**ـ پێم‌خۆشە دەربارەی مەسەلەیەك، کە تایبەتە بە ئێوەوە راتــان وەر بگـرم .. ئایا پێتان خۆشە بە زووترین کات هەوڵی بەردانتان بدەم ، یان حەز ئەکەن بەرگریی لە بانگەوازەکەتان بکەم و روونی بکەمەوە ، بەبێ گوێدان بە مەسەلەی بــەردانی ئێوە ؟**

**قوتابیان هەر هەموو پێکەوە وەڵامیان دایەوە:**

**ـ تکات لێ ئەکەین هەموو هەوڵێکت بۆ روون‌کردنــەوە و دەرخســتنی بانگـە پیرۆزەکەمان بخە گەر ، چونکە ئێمە رازیین چەندساڵێك لە بەندیخانەدا بمێنینەوە ( ش/٢٦١ ) .**

**ئەم پارێزەرە هەستی کرد ئەم بەندکراوانە مرۆڤێکــی ئاســایی نــین ، ئەمانــە سەروماڵیان بۆ خزمەتی بانگەکەیان نەزر کردووە، بۆیە بە ناسینی ئەم قوتابیانە لە بەرزیی و پیرۆزیی بانگەکەشیان شارەزا بوو، ئیتر بریــاری دا لــە دادگـا زۆر و**

---

٣٣٨ بەکر بەرق لە ساڵی ١٩٢٦ لە دایك بووە و ، لە ١٤ / ٦ / ١٩٩٢ کۆچی دوایی کردووە، خۆی نەزر کردووە بۆ خزمەت و بەرگریی لە قوتابیانی نوور، کە زیاتر لە هەزار دەعوادا بە سەرکەوتوانە بەرگریی لە قوتابیانی سەرانسەری تورکیا کردووە .. لە رۆژنامەکان دا نووسینی زۆری هەیە و ، بە دەیان دانراویشی هەیە .

زەبەندەكانی ولاتدا بەرگريی لە قوتابيانی نوور بكات .. خوای گەورە ليّی رازيی بيّت .[٣٣٩]

سەردانی خواحافيزيی :

مامۆستا نوورسيی لە دوارۆژانی تەمەنيدا دەستی دايە زنجيرە سەردانيّك، وەك بيەویّ خواحافيزيی لە قوتابيەكانی بكات .

ئەوەبوو لە ١٩ / ١٢ / ١٩٥٩دا بەرەو ئانقەرە كەوتە ریّ و ، لەويّشەوە بۆ ئەميرداغ و پاشان بۆ قۆنيا و ، لەويّشەوە ديسان بۆ ئانقەرە و ، پاشان بۆ ئاستانبووڵ كە لە ١ / ١ / ١٩٦٠دا گەيشت و ، دوو رۆژ لەویّ مايەوە ، پاشان جاريّكی تر لە ٣ / ١ / ١٩٦٠ دا گەرايەوە ئانقەرە و ، دوا وانەی ئيمانيی بە قوتابيەكانی ئەويّی وتەوە، لەویّ نويّنەری رۆژنامەی ( تايمز ) ی لەندەنيی چاوپیّكەوتنيّكی رۆژنامەوانيی لەگەڵدا كرد و ، لە رۆژنامەی ( ينی صباح ) لە ٦ / ١دا و ، لە رۆژنامەی ( دنيا ) لە ٨ / ١ / ١٩٦٠ دا بڵاو كرايەوە[٣٤٠] پاشان مامۆستا گەرايەوە بۆ قۆنيا و لەويّشەوە ، لە هەمان رۆژدا ، بەرەو ئيسپارتە كەوتە ریّ .

دوژمنانی ئيسلام بەم سەردانە يەك لەسەر يەكانە ترسيان لیّ نيشت ، بۆيە رۆژنامەكانيان دەستيان دايە هيّرشيّكی توند بۆ سەر مامۆستا نوورسيی ، بەو هيوايەی رای گشتيی لە دژی هەڵ بنيّن ، ئەمەش بە هەڵ بەستنی كۆمەڵيّك درۆ و دەلەسە ، هەروەك مامۆستای پير و نەخۆش ئاژاوەيەكی ترسناكيی لە ژيّر سەردا

---

[٣٣٩] سيرة ذاتية : ٤٦٧ ـ ٤٦٨ ، رجل القدر : ٢٦٨

[٣٤٠] ( ب ٣ / ١٦٢١ ) .

بێت، بۆیە کە لە ١١ / ١ / ١٩٦٠دا گەرایەوە ئانقەرە حکومەت تەبلیغی کرد، کە وا چاکە لە ئەمیرداغ نیشتەجێ ببێت، هەروایش بوو، مامۆستا گەرایەوە ئەمیرداغ ، بەڵام داوای لە حکومەت کرد، کە مۆڵەتی بدات مانگێك لە ئەمیرداغ و یەکێکیش لە ئیسپارتە بمێنێتەوە

لە ٢٠ / ١ / ١٩٦٠دا مامۆستا لە ئەمیرداغەوە بەرەو ئیسپارتە رۆیشت و ، کە ماوەیەکی لەوێ بەسەر برد بەرەو ئافیوون کەوتە رێ و ، لەوێش تەنها رۆژێك مایەوە ، ئیتر بەرەو ئەمیرداغ گەرایەوە .[٣٤١]

[٣٤١] سيرة ذاتية : ٤٦٨ ، رجل القدر : ٢٧٩ ـ ٢٨٠

# دوا نەخۆشیی و کۆچی دوایی

رۆژ و مانگ و ساڵەکان تێپەرین و مانگی مارتی ١٩٦٠ هاتە بەرەوە .. رۆژی ١٨ / ٣ / ١٩٦٠ جومعە بوو .. مامۆستا نەخۆشییەکەی توندتر بوو .. لە رۆژی شەممەی ١٩ / ٣ / ١٩٦٠دا مامۆستا بەرەو ئیسپارتە ئەکەوێتە رێ و دوای نوێژی عەسر ئەگاتە بەرەوە .. بەر لە گەیشتنی پۆلیس سەر لە قوتابییەکان ئـەدات و ، ئەڵێت :

ـ مامۆستا لە ئەمیرداغ دەرچووە .

ئەوانیش ئەڵێن :

ـ نەهاتووە بۆ لای ئێمە

دوای ئەم پرسـیارە بـە سـەعاتێك مامۆسـتا بـە ئوتومبێـل گەیشـت، کـە قوتابییەکان هۆرێنی ئوتومبێلەکە ئەبیستن دێنە خوارەوە و ، دەرگـای گەراجەکـە ئەکەنەوە و ، ئوتومبێلەکە ئەچێتە ژوورەوە و ، دەرگاکان دائەخەن، مامۆستا لە کوشنەکەی دواوە بەسەر پشتدا راکشا بوو، و نەخۆشییەکەی یـەکجار سـەخت بووبوو .. قوتابییەکان مامۆستا بە باوەش هەڵ ئەگرن هەتا لەناو ئوتومبێلەکـەدا دەری بهێنن، کە بە پلیکانەکاندا سـەر ئەکـەون ئەیانـەوێ لـە کـۆڵی بکـەن ، مامۆستا رازیی نابێت ، ناچار مامۆستا بایرام یۆکسێل و مامۆسـتا طـاهیریـی

ئەچنە ژێر باڵی هەتا ئەیگەیەننە ژوورەکە و ، لە شوێنی خۆی دای ئەنیشـێنن ، پاشان لەسەر نوێنەکەی رائەکشێت .

پلەی گەرمای یەکجار بەرز بوو ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نەیان ئەتوانیی دەست بەرداری بن ، هەتا ئەبوا بە نۆبە نوێژ بکەن تا چاویان لێی بێت .

چوار قوتابیی لای مامۆستا بوون، کە بایرام و زوبەیر و حوسنیی و طاهیریـی بوون، شەوێکیان لە نیوە شەودا، کە بایرام و زوبەیر پێکەوە ئێشکیان ئەگرت ، یەکێکیان دەستی مامۆستای تەر ئەکرد و ، ئەوی تریشیان هـەردوو قاچـی تـەر ئەکرد، مامۆستا سەیرێکی بایرامی کرد و ، وتی :

- ئەرۆین .

بایرام وەڵامی دایەوە :

- بەڵێ ، مامۆستا گیان ! ئەرۆین ، بەڵام بۆ کوێ ؟

- بۆ ( ئۆرفە ) .. بۆ ( دیاربەکر ) ..

وتەکەی دووبارە کردەوە : ئەرۆین .

کە بایرام پرسیی : مامۆستا گیان ! بۆ کوێ ؟

- بۆ ( ئۆرفە ) .

مامۆستا زوبەیر بە براکانی وت : لەوانەیە لەژێر کاریگەریی ئەو تایەدا وەها بڵێت، کە تووشی ئەبێت .

لە دەوروبەری سەعات دووی دوای نیوەشەودا مامۆستا ئەو وتەیـەی دووبـارە ئەکردەوە :

- بەیانیی زوو ئەچین بۆ ( ئۆرفە ) .

ئەوەبوو جەختی لەسەر ( ئۆرفە ) ئەکردەوە .

پاشان مامۆستا طـاهيريی و حوسنيی دێن تا ئێشكی سەرەی خۆيان بگرن و ، مامۆستا زوبەير و بايراميش بچن پارشێو بكەن ، چـونكە لـە دە رۆژی كۆتـايی رەمەزانی پیرۆزدا بوون .. مامۆسـتاش مامۆسـتا حوسـنيی ئاگـادار ئـەكات و ئەڵێت :

ـ خۆتان ئامادەی رۆيشتن بۆ ئۆرفە بكەن .

ئەويش مامۆستا ئاگادار ئەكات، كە تايەی ئوتومبێلەكە بە كـەڵكی سـەفەر نايەن .

مامۆستا دووبارەی ئەكاتەوە :

ـ هەرچەندی تێ بچێت هەر ئەچين بۆ ئۆرفـە .. ئەگـەر بـە (٢٠٠) دووصـەد ليرەش بووە، ئوتومبێلێك بە كـرێ بگـرن، ئەگـەر پێويسـت بكـات جبەكەشـم ئەفرۆشم .

قوتابيان ئوتومبێلەكە ئامادە ئەكەن .. بايرام سەير ئەكات تايەی ئوتومبێلەكە بە كەڵك نايەن و ، لەو كاتەشدا تايەی تازەيان دەست ناكەون .

قوتابيان خەريكی ئامادەكردنی ئوتومبێلەكە بوون لەولاوە مامۆستا طاهيريی دێتە يارمەتييان، چونكە مامۆستا ناردبووی تا دەست بجووڵێنن .

ئوتومبێل ئامادە كرا و ، مامۆستا نوورسييش خۆی ئامادەی سەفەر كردبوو . مامۆستا بايراميش چاوەروانی فەرمانی مامۆستا بوو، تا ئەويش لەگەڵيان سەفەر بكات، چونكە مامۆستا زوبەير هەر ئێوارە ئاواتی خواستبوو :

ـ خۆزگە كاك بايراميش لەگەڵمانا ئەبوو و ، لە رێگادا يارمەتييمانی بدايە .. لەوانەيە بەبێ ئەو تووشی نارەحەتيی ببين .

بۆ ئەمە كاتێك، كە مامۆستا لە دەرگا دێتـە دەرەوە زوبـەير لـە طـاهيريی ئەپرسێت :

ـ ئايا بايراميش دێت ؟

مامۆستا وەڵام ئەداتەوە :

ـ بەڵێ ، ئەويش لەگەڵمان ئەبێت .

مامۆستا لە كوشنی دواوەی ئوتومبێلەكە لەسەر فەرشێك پاڵ ئەخەن و ، زوبەير و بايراميش لە پێشەوە سەر ئەكەون .

ئەمە لە ٢٠ / ٣ / ١٩٦٠دا و لە سەعات (٩) نۆی سەر لە بەيانييدا بوو، لەو كاتەدا دوو پۆليس لە شەقامەكەدا چاودێريی قوتابيانيان ئەكرد .. راديۆش فەرمانی بڵاو كردەوە، كە بديع الزمان پێويستە لە ئسپارتە يان لە ئەميرداغ بمێنێتەوە

بەر لەوەی بكەونە رێ ، خاتوو فەطينەی خاوەن خانوو هات بۆ لای ئوتومبێلەكە و ، مامۆستاش خواحافيزيی لەگەڵدا كرد، وتی :

ـ خوشكەكەم ! بە خواتان ئەسپێرم، هيوادارم دوعامان بۆ بكەن ، من زۆر نەخۆشم .

مامۆستا بە خەم و خەفەتێكی زۆرەوە خواحافيزيی ئەكرد، چونكە كاتی دابران و لێك جوێ بوونەوە بوو .. چاوی خاتوو فەطينەش لە فرمێسك پر بوو بوون و ، بە مامۆستا طاهيريی ئەڵێت :

ـ بەخوا بۆ سەفەری ئەم جارەی مامۆستا دڵم لە مشتمدايە . بەدوای ئارامگاكەيدا ـ واتە قەبرەكەيدا ـ ئەگەرێت .

بەر لەوەی دەرچن ئامۆژگاريی مامۆستا طاهيريی ئەكەن، كە بچێت بخەوێت و ، دەرگاش بۆ هيچ كەس نەكاتەوە، دوای ماوەيەك پۆليس دێن و لە خاوەنی خانووەكە ئەپرسن، ئەوە نازانيت مامۆستا كەی دەرچووە و ، بۆ كوێش چووە ؟

ئەويش وەڵاميان ئەداتەوە :

ـ بۆچ من پاسەوانم ؟ ئێوە نەزانن ، من چۆن بزانم ؟

کە ئسپارتەیان بە جێ هێشت باران بە خورەم دەباریی .. قوتابییەکانیش لە فروفێڵی والیی قۆنیا زۆر ئەترسان ، چونکە بێ پێچ و پەنا بۆ رۆژنامەکانی دەربریی بوو :

ـ رەگ و ریشەی قوتابیانی نوور دەر ئەهێنم، ئەوانیش ناچار بوون بە درێژایی رێگا هەر ( آية الكرسي ) بخوێنن ، بە نیازی ئەوەی، کە خوا لە شەری والیی رزگاریان بکات .

کە ئەگەنە ئەگریدیر باران توند ئەبارێت ، بە جۆرێك، کە تاقە پۆلیسێك بە دەرەوە نابێت و ، هەر هەموو لەبەر بارانی بەخورەم ئەچنە ژوورەوە ، بە رادەیەك، کە مامۆستا و قوتابیەکانی لەبەر دەم بنکەی پۆلیسەوە تێپەر ئەکەن و کەسیش نایان بینێت، بەم شێوەیە لە شار دەرچوون، تابلۆی ژمارەی ئوتومبێلەکەش بە قور دائەپۆشن تا پێیان نەزانن .

کە لە "قەرە ئاجاغ" دەرچوون تەندروستیی مامۆستا باش بوو ، بۆیە لە ئوتومبێلەکە دابەزیی و دەست نوێژی تازە کردەوە، دوای چەند کیلۆمەترێك رێگا بریین لەسەر کانیاوێك دائەبەزن و ، لەوێ لەسەر بەردێك مامۆستا نوێژ بەجێ ئەهێنێ .

دوای ئەوە ئەکەونە رێ و ، لەبەر ئەوەی بگەنە شاری قۆنیا مامۆستا کۆتایی بە ذیکر و ئەورادەکانی دێنێت و ، لەسەر کوشنەکەی دواوە رێك دائەنیشێت ... بەڵام هەرکە ئەگەنە باخچەکانی ( مرام ) لە قەراغی قۆنیا جارێکی تر نەخۆشییەکەی توند ئەبێتەوە و ، لە قسەکردن ئەکەوێت، ئەچنە ناو شارەوە و ، زەیتوون و پەنیر ئەکرن بۆ بەریانگ و مامۆستا پارەکەی ئەدات و ئەڵێت :

ـ کورەکانم ! من زۆر نەخۆشم ، ئێوە لە بریی من بخۆن .

بە یارمەتیی و فەزڵی خوای گەورە ـ سوپاس بۆ خوا ـ هیچ کەس لە شاردا بگرە لە شارەکانی دوای قۆنیاش‌دا ، چاوی پێیان نەکەوت .

بەر لەوەی بگەنە ئارگولیی مامۆستا لە جێی خۆیدا دانیشت و ، هەردوو دەستیشی درێژ ئەکات و گوێی بایرام و زوبەیر ئەگرێت و پێیان ئەڵێت :

**ــ کورەکانم ! هەرگیز نەترسن، پەیامەکانی نوور پشتی مولحیدان و شیووعییانی شکاندووە، و بە ئیزنی خوا هەمیشە پەیامەکانی نوور سەرکەوتوو ئەبن .**

چەند جارێك ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە، بەڵام دەنگی ئەوەندە نزم بوو، خەریك بوو نەی بیستن ، پاشان وتی :

**(( ئەوانە لێم تێ نەگەیشتن ، ئەوانە لێم تێ نەگەیشتن ، ئەوانە لێم تێ نەگەیشتن .. ئەوانە ویستیان بە تێکەڵیی سیاسەت چەپەڵم بکەن )) .**

لە ئوتومبێلەکە دابەزین بۆ بەجێهێنانی نوێژی عەسر ، بەڵام مامۆستا لە ناو ئوتومبێلەکەدا مایەوە و لەوێ نوێژی بەجێ هێنا

کە کاتی نوێژی مەغریب هاتە بەرەوە گەیشتنە ئولو قشلە مامۆستا نورسیی وتی :

ـ شتێك خواردن بکرین ؟

بایرام و زوبەیر دابەزین و، لە چێشت‌خانەکە کەمێك برنجیان کری و ، ویستیان خواردن ئامادە بکەن ، بەڵام ئەو تەباخەی کە پێیان بوو، بە کەڵکی ئەو کارە نەئەهات ، بۆیە بایرام لە پاسەوانەکە پارایەوە تا تەباخەکەی خۆی بە کرێ پێیان بدات ، چونکە پیاوێکی بەساڵاچووی نەخۆشیان پێیە

دەست ئەکەن بە خواردن ئامادەکردن و ، مامۆستا زوبەیر لەگەڵ مامۆستا نوورسییدا لە ناو ئوتومبێلەکەدا مانەوە ، کەمێك کەرە و هێلکەیان لەگەڵ

هەندێك ماستدا بۆ مامۆستا دانا .. مامۆستا کەوچکێکی لێ گرت تا بیخاتە دەمی ، کەچیی نەی توانیی بیخوات ، بە هۆی گیرانی قورگیەوە .

شەو بە لای ( أطنه) دا پاشان بەلای ( جیحان ) دا تێپەرین و لە قەراغی جیحان‌دا نوێژی عیشایان بەجێ هێنا .. پاشان مامۆستا حوسنیی راکشا بۆ ئەوەی سەعاتێك بخەوێت ، چونکە بەردەوام لە ئوتومبێلەکە ئەخوریی، لە کاتی پارشێودا ئەگەنە شاری عوثمانیە و لەوێ لا ئەدەن تا بەنزین وەربگرن و پارشێویش بکەن، بەلاّم مامۆستا نەی توانی هیچ بخوات، پاشان بەرێ ئەکەون و لە نزیك ( ألمان پناری ) نوێژی فەجر بەجێ ئەهێنن ، بەلاّم مامۆستا لە ناو ئوتومبێلەکەدا ئەمێنێتەوە، ئەو ناوچەیە جاران ناوی گاورداغی یانێ چیای کافر بووە، بەلاّم ئێستە ناو نراوە نووداغی واتە چیای نوور ..

کە دنیا رۆشن بوو، ئەگەنە غازی عینتاب و لەوێ لە چێشتخانەدا کەمێك شۆربا ئەکرن و، هەواڵی رێی ( نزیب ) ئەپرسن ، چونکە بەفر و باران بە خورەم ئەباریی و ، رێگاش مەترسییدار بوو، و ئوتومبێلی زۆریش لە رێگا لایان دابوو و پەکیان کەوتبوو، بەلاّم ئوتومبێلەکەی ئەوان ـ لە خوا بە زیاد بێت ـ بە تیژیی ئەرۆیشت ، سوپاس بۆ خوا نە تایە و نە مەکینەی لە کار نەکەوتن .

نزیکەی سەعات یانزە گەیشتنە ئورفە و ، مامۆستا حوسنیی چاك شارەزای شەقامەکانی ئورفە بوو .. ئەگەنە مزگەوتی ( قاضي أوغلو ) کە مامۆستا عەبدوڵلاّ یەگەن لەوێ ئەبێت، لە نزیك مزگەوتەکەدا ئوتومبێلەکە ئەوەستێنن و، مامۆستا زوبەیر ئەچێتە ژوورەوە تا مامۆستا عەبدوڵلاّ لە هاتنی مامۆستا نوورسیی ئاگادار بکات، لەو کاتەدا مامۆستا وتی :

ـ با خێرا برۆین کاتمان نیە چاوەروانیی بکەین .

کاك زوبەیر لەگەڵ کاك عەبدوڵڵا بە پەلە گەڕانەوە لای ئوتومبێلەکە و، داوایان لە کاك عەبدوڵڵا کرد تا ئوتێلێکی پاکیان پیشان بدات ، ئەویش ئـوتێلی ئیپـك پالاسی پیشان دان .

پێکەوە مامۆستا هەڵ ئەگرن و سەری ئەخەن بۆ نهۆمی سێهەم ژووری ژمارە ( ٢٧ ) و لەسـەر نوێنەکـەی پـاڵی ئەخـەن تـا کـەمێك بحەسـێتەوە ، چـونکە سەفەرەکەیان زۆر درێژ بوو .

دانیشتوانی ئۆرفەش سەرگەرمی قورئان خوێندن و خەتم کردن بوون ، چونکە موسڵمانان لە دە شەوی کۆتایی رەمەزان‌دا بوون، هەر، کـە هـەواڵیان زانیـی وا مامۆستا نوورسیی هاتۆتە شارەکەیانەوە ، بە پەلە خۆیان گەیاندە ئوتێلەکـە و ، زۆرێکیش گلەییان لە قوتابیان کرد وا پێشتر هەواڵی هاتنی مامۆستایان نەداوە، هەتا بەر لە گەیشتنی خۆیان ئامادە بکردایە و بچوونایەتە پێشوازیی .

موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە هەواڵیان زانیی و هاتنـە خزمـەتی مامۆسـتا نوورسیی مامۆستا زوبەیر لە دەرگـای ژوورەکـەی مامۆسـتادا دانیشـتبوو و خەڵکەکەی یەك لە دوای یەك ئەکردنە ژوورەوە، بایرامیش دەسـتی مامۆسـتای گرتبوو و خەڵکەکەش ماچیان ئەکرد و ، مامۆستاش سەری ئەوانی ماچ ئەکرد هەر کۆمەڵێك ئەهاتنە ژوورەوە مامۆستا حەزی نەئەکرد برۆن ، کەچیی بایرام لە موسڵمانان ئەپارایەوە تا لە ژوورەکە بچـنە دەرەوە هـەتا کەسـانی تـریش بێنـە خزمەتی ، ئەوانیش ئەیان وت:

ـ نابینی مامۆستا ئەوەی پێ خۆش نیە ؟

قوتابیەکان سەریان لە مامۆستا سور ما بوو، چونکە لەوەو پێش بەو شێوەیان نەدیی بوو، مامۆستا چ لە ئیسپارتەش و چ لە ئەمیرداغیش نەی ئەهێشت هیچ کەس لەلای بمێنێتەوە، هەتا کاتێك لە ئیسـپارتە ئـەبن و، مامۆسـتا نـەخۆش

ئەکەوێت ، بایرام لە مامۆستا ئەپرسێت، کە ئایا براکان لەم نەخۆشییەی ئاگادار بکەن ؟

مامۆستاش ئەڵێت : نەء لە غەیری ئێوە کەس نەیەت بۆ لام .

کەچیی لە ئۆرفە کەسی جواب نەئەکرد ، بەڵکو یەکە یەکە ئەیگوشین بە سنگیا، ئەوەبوو خەڵکی شار ، هەموو چین و توێژێك ، هەر هەموو هاتن بۆ سەردانی و ، مامۆستاش هیچ کەسیانی نەئەگێرایەوە و ، دانی بە خۆیدا ئەگرت و، بە هیچ شێوەیەك نەئەحەسایەوە ، بگرە تامی خەوی نەئەکرد، هەروەها قوتابیانیش هیچ کامیان ماوەی خەوتنی نەبوو .

کە زوبەیر نۆبەتی تەواو بوو، بایرام لەبەر دەرگا دانیشت و ، لەو کاتەدا دوو پۆلیس هاتن و یەکێکیان وتی :

ـ ئامادە بن بۆ ڕۆیشتن ! شۆفێرەکە کوانێ ؟

ـ مامۆستا یەکجار نەخۆشە .

پاشان یانزە پۆلیسی تر هاتن و وتیان :

ـ هەر ئێستە ئامادە بن ! هەر ئێستە ئەڕۆن بۆ ئیسپارتە

بایرام پێیان ئەڵێت :

ـ فەرمانەکە بە مامۆستا ئەگەیەنم .

بایرام ئەچێتە ژوورەوە لای مامۆستا و هەواڵی ئەداتێ و مامۆستاش ماوەیان ئەدات بێنە ژورەوە، ئەڵێن :

ـ گەرانەوەتان بۆ ئیسپارتە فەرمانێکە لە وەزارەتی ناوخۆوە دەرچووە

مامۆستاش پێی وتن :

ـ سەیرە من هاتووم بۆ ئێرە تا تیایا بمرم ، لەوانەشە بمرم ، ئەوەتا ئێوەش حاڵم ئەبینن ، دەی بەرگرییم لێ بکەن .

یەکێکیان وتی :

ـ ئێمە لە ژێر فەرمانی حکومەتداین ، چی بکەین ؟

پاشان حوسنیی و ئوتومبێلەکەیان هێنانە بەردەم ئوتێلەکە ، تا مامۆستا هەڵ بگرێ، کە خەڵکی شار ئەمەیان بیست لەبەردەم دەرگای ئوتێلەکە کۆبوونەوە لەولاوە خاوەنی ئوتێلەکەش بەسەر پلیکانەکانەوە بەسەر پۆلیسەکەدا نەراندی و وتی :

ـ ئەوە میوانی منە .. چۆن ئەبێت لێمی بستێنن ؟

خەڵکی ئۆرفە دڵیان گری گرتبوو .. زۆر داخیان لێ ئەهات میوانی بێ تاوان و بەساڵا چوو و نەخۆش دەرفەتی پێ نەدرێت چەند رۆژێك بحەسێتەوە .. خەڵکەکە بە دەنگی بەرز نارەزایی لەو کارە بێ مانایە دەرئەبریی .. کەی راستە پیرێکی بەساڵا چوو و، خاوەنی خزمەت ، دەوڵەت مۆڵەتی نەدا ، بمێنێتەوە ، بە مەرجێك لە سەرەمەرگدا بێت ؟

خەڵکەکە وەها نارەحەت بوون نەیانئەهێشت هێزی پۆلیس سەرکەوێتە سەر ئوتێلەکە و ، لە شۆفێرەکەش پارانەوە تا ئوتومبێلەکەی مامۆستا لە دەرگای ئوتێلەکە دوور بخاتەوە، ئەویش دووری خستەوە و ، خەڵکەکەش کەمێك هێور بوونەوە و ، دەستیان بە سەردانی مامۆستا کردەوە

دوای ئەوە کارمەند و پۆلیس و سەرباز و ئەفسەران و ئەندامانی حیزب هەر هەموو هاتن بۆ سەردانی مامۆستا

پۆلیس لەسەر بریاری خۆیان سوور بوون، کە ئەبێ مامۆستا ئۆرفە بە جێ بهێڵێت و ، داوایان کرد خۆیان چاویان بە مامۆستا بکەوێت تا ئاگاداری بکەن، کە ئەوە فەرمانی کاربەدەستانی سەرەوەیە و ، چار نیە پێویستە ئۆرفە بەجێ بهێڵن . ئەوەبوو وتیان :

ـ ئەگەر بە ئوتومبێلەکەی خۆتان ئۆرفە بەجێ نەهێڵن ، ئەوا خۆمان بە ئوتومبێلی فریاکەوتن رەوانەتان ئەکەین .

قوتابیانیش وەڵامیان دانەوە، کە مامۆستا یەکجار نەخۆشە و ، بەرگە ناگرێت جارێکی تر ئەو هەموو رێگایە ببرێت و بگەرێتەوە دوا ، سەرەرای ئەوەش، کە ئەوان ناتوانن دەست لە کاری وەر بدەن ، بە تایبەت ئەم حاڵەتەی، کە لە مردنەوە یەکجار نزیکە .

پۆلیسێکیان وتی :

ـ کارەکە بڕاوەتەوە و ، دەستکاریی ناکرێت .. فەرمانی وەزارەتە، جا مامۆستاکەتان چۆن هاتۆتە ئەم شارە ، وەهاش ئەتوانێ بگەرێتەوە، هەر ئێستا لە ئۆرفە دەرچن .

قوتابیەکان وتیان :

ئێمە دەست لە کاری مامۆستا وەر نادەین ، وەرن ئێوە خۆتان با چاوتان پێی بکەوێت و ، چیتان ئەوێ پێی رابگەیەنن ، جا ئەگەر پێمانی وت : بڕۆین ، ئێمە ئەرۆین، چونکە ئێمە هەرگیز قسەی نادەینە دواوە و ، ناشگونجێ ئەوەی ئێوە ئەیلێن بەوی رابگەیەنین .

پۆلیس چاویان پەرییە تەوقی سەریان و وتیان :

ـ ئەمە چییە ؟ ناتوانن شتێکی ئاسایی پێ بلێن ؟

ـ بەڵێ ! ئێمە هیچ بەو ناڵێین و ، هەرچیش ئەو بیلێت بە وردیی جێ بەجێی ئەکەین .

وتیان : ئێمەش بە هەمان شێوە پابەندی فەرمانە رەسمییەکانین، پێویستە لە ماوەی دوو سەعاتدا ئۆرفە بەجێ بهێڵن و بگەرێتەوە بۆ ئیسپارتە .

کە دانیشتوانی ئۆرفە دەنگ و باسی دەرکردنی مامۆستایان بیست ، نزیکەی (٦٠٠٠) شەش هەزار کەس لە بەردەم ئوتێلەکەدا جەم بوون، لەو کاتەدا قوتابیەکانیش چوون بۆ خەستەخانە تا سەرۆکی تەندروستیی لە حاڵی مامۆستا ئاگادار بکەن ، کەوا بەو نەخۆشییە توانای سەفەری نیە و ، داوایان کرد خۆی بچێت فەحصی مامۆستا بکات .

دکتۆر هات و فەحصی مامۆستای کرد ، پاشان ئاوری بۆ لای قوتابییەکان دایەوە و وتی :

ـ چۆن وێراوتانە مامۆستا بهێنن بۆ ئێرە ؟ پلەی گەرمای یەکجار بەرزە و ، لە حاڵێکدایە ناگونجێت بە هیچ شێوەیەك بجووڵێنرێت، وەرن لەگەڵمدا هەتا تەقریری لیژنەی پزیشکانتان پێ بدەم، کە نابێت لە جێی خۆی بجوڵێنرێت .

دوای نوێژی مەغریب بایرام بە یەکجاریی هێزی لێ بررا بوو، چونکە بە پێوە زۆر وەستا بوو، و ماوەیەکیش بوو، نەخەوتبوو، و یەکجار ماندوش بوو ، بۆیە بە زوبەیر ئەڵێت :

ـ من زۆر ماندووم ، بە پێوە وەستانم هێزی لێ بریوم، ئەویش وتی :

ـ برۆ لە ژوورەکەدا بخەوە .

بایرام چوو بۆ ماوەی دوو سەعاتێك خەوت ، پاشان زوبەیر دێت بۆ لای و ئەڵێت :

ـ براکەم منیش ئارامم لا نەما ، ئەمە هەفتەیەکە بە هیچ شێوەیەك چاوم نەناوە بە یەك دا

بایرامیش ئەڵێت : وەرە با بیکەین بە نۆبە .

نوێژی عیشا ئەکەن و ، کاك زوبەیر ئەخەوێت، ئیتر بایرام و حوسنیی لای مامۆستا ئەمێنن، پاشان کاك حوسنی ئەڵێت :

ـ ئەوەندە وەستاوم و نەخەوتووم هەردوو پێم ئازارم ئەدەن .. ئەمەوێت کەمێك بحەسێمەوە .

بایرام ئەڵێت :

من ئێستا ماندوو نیم ، برۆ تۆیش بخەوە

بەمە بە تەنیا بایرام لای مامۆستا ئەمێنێتەوە

هەر بەیانیی زوو مامۆستا داوای پارچەیەك بەفری کردبوو ، چونکە تاکەی یەکجار بەرز بوو، کەچیی دەستیان نەکەوتبوو، بەڵام، کە ئێوارە بەسەردا دێت چەند دۆستێك دێن بۆ لایان، کە بەفریان دەست کەوتبوو . بایرام ئەڵێت :

ـ مامۆستا گیان ! بەفریان دەست کەتووە

ئاماژەی کرد کە نامەوێت، دیسان پرسیی :

مامۆستا گیان ! چا ئامادە بکەم ؟

ئاماژەی کرد، کە ئەویشم ناوێت .

کە سەعات گەیشتە (٢:٣٠)دوو و نیوی شەو لێوی مامۆستا وشك ئەبوونەوە و ، بایرامیش بە دەستەسرێك تەری ئەکردن، رازیی نەبوو بایرام دای بپۆشێت . بایرام شتێکی دا بە رووی چراکەدا هەتا مامۆستا بێزار نەکات ..

بایرام هەردوو قۆڵی رێك ئەکرد ، بایرامی گوشیی بە خۆیدا ، پاشان دەستی خستە سەر سنگیی و لێی خەوت .

بایرام زۆپاکە دائەگیرسێنێت و ، وا ئەزانێت مامۆستا خەوتووە و ، بە تەماش ئەبێت براکانی تر هەستن و پێکەوە پارشێو بکەن و ، مامۆستاش بۆ پارشێو بەخەبەر بێت .. ئیتر نەی ئەزانی مامۆستا کۆچی دوایی کردووە و بەرەو بارەگای حەق گەراوەتەوە

کاتی پارشێو لای دا و تێپەریی .. کاك حوسنیی و کاك عەبدوڵڵا هاتن و وتیان :

ـ ئێمە زۆر خەوتووین، بایرامیش ئەڵێت :

ـ من ئەچم بۆ ژوورەکەی ئەو دیو، و لەویٚ نوێژی فەجر بەجیٚ ئەهێنم ، دەنگە دەنگ نەکەن ، مامۆستا خەوتووە .

بایرام چوو بەلای نوێژەکەیەوە و ، ذیکر و ویردی رۆژانـە ئـەخوێنێت لەگـەڵ جوزئێك قورئاندا ، پاشان، کە ئەیەویٚ چاو بـە یـەکدا بنێـت ، براکـان دێـن و ئەڵێن :

ـ برا گیان ! مامۆستا ناجووڵێت .

ـ مامۆستا خەوتووە ، هەڵی مەستێنن .

جارێکی تر دێنەوە لای و ئەڵێن :

ـ مامۆستا بە هیچ شێوەیەك ناجووڵێت .

پێکەوە ئەچن بۆ ژوورەکەی مامۆستا و ، زوبەیر لەلای سەریەوە دائەنیشێت و، ئەو چوارەکەش سەیری ئەکەن و ، مامۆستاش هیچ نیشانەیەکی زیندوێتیی پێوە دیار نیە ، بەڵام پلەی گەرمای ئاسایی بوو .. براکان شڵەژان .. زوبەیر وتی :

ـ زۆر جار مامۆستا ئەم حاڵەتانەی لیٚ دووبارە ئەبنەوە

خەم و خەفەت دایگرتنەوە .. تەنها خۆیان بوون .. لەو کاتەدا مامۆستا زوبەیر وتی :

ـ پیاوێك هەیە لەم جۆرە کارانە شارەزایە و ناوی ( عمر أفندي واعظ )ە پیاوەیان پەیدا کرد و هات، کە حاڵەتی مامۆستا نوورسیی بینیی وتی :

ـ ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾ ، براکانم مامۆستا وەفاتی کردووە

بایرام ئەڵێت :

ـ بە هیچ شێوەیەك بروام بە وەفات‌کردنی مامۆستا نەبوو ، چونکە کە لەساڵی ١٩٤٩ دا لە بەندیخانەی ئافیووندا بـووین ژەهریـان دەرخـواردی مامۆسـتا دا، ئەوەبوو زمانی سوور بوویەوە و ، ئێمـەش بـەبێ وەسـتان بـۆ حـاڵی مامۆسـتا ئەگریان، لەو کاتەدا کاك ئەحمەد فەیضیی ، رەحمەتی خوای لێبێت ، وتی :

ـ منداڵینە ! بۆچ ئەگرین ؟ مامۆستا تەمەنی درێژە !

بایرام ئەو قسەی کاك ئەحمەد فەیضیی هاتەوە یاد و ، دڵخۆشیی خۆی ئەدایەوە و ئەی وت : تۆ بڵێی تەمەنی مامۆستا درێژ بێت ؟

قوتابیان بە پەلە هەواڵیان دا بە پارێزگاکان .

مامۆستایان بە قوماشێکی لۆکەی تەنك داپۆشیی .. دوای کـەمێك خـاوەنی ئوتێلەکە هات .. کە سەیری مامۆستای کرد و ، بۆی دەرکەوت وەفاتی کـردووە دەستی ئەکێشا بە ئەژنۆیدا و هاواری ئەکرد

دوای ئەوە بەرێوەبەری ئاسایشیش هات و لە هۆی شڵەژاویی خاوەن ئوتێلەکـە پرسیاری کرد .. ئەویش وەڵامی دایەوە :

ـ بدیع الزمان وەفاتی کردووە .

ـ بە راستیی وەفاتی کردووە ؟

ـ بەڵێ !

پۆلیسەکان لە بەردەمی ئوتێلەکە کشانەوە دوا .. پزیشکی تایبەتیش هات تا تەئکیدی وەفات کردنی بکات ، وتی :

ـ ألله ، ألله .. پلەی گەرمای یەکجار بەرزە ، ئایا ئاوێنەتان لە لایە ؟

ئاوێنەکەی بەسەر دەمی مامۆستاوە گرت و ، بۆی دەرکەوت بە هیچ شێوەیەك هەناسە نادات .. پاشان وتی :

ـ بەڵێ ، وەفاتی کردووە ! بەڵام لە مردووش ناچێت، من گومانم لە مردنی هەیە و ، رام نیە خێرا بینێژن .

پاشان تەقریری بۆ کاربەدەستان نووسیی .

دوای ئەوە قاضیی میراتیش هات و ، مەزەندەی میراتی مامۆستای کرد، کە بریتیی بوو لە : سەعاتێك و ، بەرماڵێك و ، مێزەرێك و ، جبەیەك .. هەمووی دایە دەست عەبدولمەجیدی برای .

هەزارەها کەس لە دانیشتوانی ئۆرفە رژانە بەردەم دەرگای ئوتێلەکە و ، ئەم هەواڵە جەرگ برەشیان بە پارێزگاکانی تر گەیاند

دوای نوێژی نیوەرۆ جەنازەکەی مامۆستا لە ئوتێلەوە بۆ شۆردن بەرەو ( دەرگا ) برا ئەوەبوو لەبەر قەڵەباڵغیی بە دوو سەعات زیاتر ئەوسا گەیشتن .. دانیشتوانی ئۆرفە دووکانەکانیان داخست .. کە تەرمەکەی مامۆستایان برد بایرام و حوسنیی بوورانەوە

عەبدوڵلا یەگەنیش رووی تێکردن :

ـ ئایا ئێوە منداڵن ؟ هۆشتان بە خۆتاندا بێتەوە !

کە گەیشتنە دەرگا ، تا لەوێ مامۆستا بشۆررێت ، ئەوەندە قەڵەباڵغ بوو بە نارەحەت کەسێك ئەچووە ژوورەوە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا قوتابیان چوونە ژوورەوە و ، لەوێ مامۆستایان شۆرد .. شایانی باسە، کە مامۆستایەکی ناسراوی ئۆرفە بە ناوی مەلا حەمید ئەفەندیی مامۆستای شۆرد .[٣٤٢]

---

[٣٤٢] مەلا حەمید ئەفەندیی ئەگێڕێتەوە و ئەڵێت :

لە مزگەوتی ( قاضي ئۆغلۆ ) ئیعتیکافم کردبوو ، لە خەوم دا مامۆستام بینیی کە پێمی وت :

ـ ئامادەی جەنازەکەم ببە و ، بیشم شۆ ، چونکە من ئەمرم .

برایــان : بــایرام و ، زوبــەیر و ، حوســنیی و ، عەبــدوڵلا و ، خوللوصــیی مامۆستایان شورد

دوای شۆردن تەرمی پیرۆز برا بۆ ئولوجامیع تا لەوێ قورئانی پیرۆز لەسـەری خەتم بکرێت، جەنازەکە ئەو شەوە لە مزگەوت مایەوە

کە ڕۆژ بوویەوە ئۆرفە زۆر قەڵەباڵغ بوو، چـونکە لــە سەرانسـەری تورکیـاوە خەڵك رووی لە ئورفە نابوو .. ئەو شەوەش هـەتا بـەیانیی قورئـان خـەتم کـرا و پاداشتەکەی پێشکەشی ڕۆحی مامۆستا کرا

ئەوەندە خەڵك جەم بوو بوو، بە بیریان‌دا نەئەهات، کە بتوانن ئەو ڕۆژە بینێژن، بۆ ئەمەش والیی بانگی کردە قوتابییانی مامۆستا و تکای لێکردن، کە لە بریـی ڕۆژی جومعە ، هەر ئەو ڕۆژە دوای عەسر مامۆستا بنێژن ، چونکە قەڵەباڵغەکە لە سنوور دەرچووە

هەر لەو کاتەدا جار درا، کە دوای نوێژی عەسری پێنج شەممە نوێـژی جـەنازە بەجێ ئەهێنرێت، والیی و سەرۆکی شارەوانیی ئامادە بوون و نوێژی جەنازە ئەنجام درا

لە کاتی شۆردنی مامۆستادا دیاردەیەکی سەیر روویدا، کە ئەوەبوو بـارانێکی ورد ئەبارێی و ، خەڵکەکەش بە چاوی خۆیان ژمارەیەکی زۆر باڵندەی سەیری جۆرا و جۆر و نەخشینیان بە ئاسمانەوە دیی .

---

پێم وت : مامۆستا گیان ! جائیز نیە کەسێك ئیعتیکافی کردبێت لێی دەرچێت ! من چیی بکەم ؟
وتی : سەیری لاپەڕە ئەوەندە بکە لە کتێبی ( ملتقى الأبـحر ) لەوێ جائیزیی ئەو کارە ئەبینیی .
کە لە خەو هەستام ، هێشتا خەو بەری نەدابووم ، بە پەلە دەستم دایە کتێبی ناوبراو و ، ئەو لاپەڕەیەم کردەوە ، ئەبینم هەر ئەوەیە، کە مامۆستا وتوویەتی .. بەمە شەرەفمەندیی شۆردنیم دەست کەوت . ( ش / ٤٥١ ) .

زۆر کەس فریای ناشتنی جەنازەکە نەکەوت ، کە یەکێك لەوانە قوتابیی دڵسۆز کاك جایلان بوو ، کە خەفەتێکی زۆری خوارد بۆ دواکەوتنی لە ناشتنی مامۆستای ئازیز و ، وتی :

ـ ساڵانێکی دوور و درێژ خزمەتی مامۆستام کرد ، کەچیی وا بە داخەوە ئەمرۆ ئامادەی وەفات کردنی نەبووم !! [٣٤٣]

**هەتا دوای مردنیشی :**

لە ٢٧ / ٥ / ١٩٦٠ دا کوودەتایەکی سەربازیی لە تورکیا رووی دا و ، حیزبی دیموکراتیی لەسەر کار لابرا و ، ئەندامانی حکومەتیش دران بە دادگای دەستوور و، سەرەنجام حوکمی لە سێدارەدان بۆ سەرۆك وەزیر عەدنان مەندەریس و دوان لە وەزیرەکانی دەرچوو و ، مادەی جۆرا و جۆریش بۆ حوکمدانی وەزیر و کاربەدەستانی تریشی دەرچوو، دەسەڵاتی تازە دژایەتیی هەموو لایەنە ئیسلامییەکانیشی ئەکرد، بە تایبەت قوتابیانی نوور .

ئەوەبوو پێنج مانگ دوای وەفاتی مامۆستا نوورسیی مامۆستا عەبدولمەجیدی برای بانگ کرا بۆ دیوانی والیی لە شاری قۆنیا، سەیری کرد وا سێ ژەنەراڵ لەلای والیی دانیشتوون، یەکێکیان رووی وتاری ئەکاتە مامۆستا عەبدولمەجید :

ـ لەلاتان شاراوە نیە، کە ئێمە لە بارودۆخێکی سەختدا ئەژین و ، زیارەتکەرانی قەبری براکەشتان لە پارێزگاکانەوە رۆژ بە رۆژ زیاد ئەکەن، جا ئێمە ئەمانەوێ ـ بە کۆمەکیی ئێوە ـ لاشەکەی بگوێزینەوە بۆ ناوەراستی ئەنادۆڵ . تکا ئەکەین ئەم داواکارییە ئیمزا بکەن .

---

[٣٤٣] سیرة ذاتیة : ٤٧٦ ـ ٤٨٦ ، رجل القدر : ٢٨٠ ـ ٢٩٠

پارچە کاغەزێکیان لێ نزیك خستەوە، کە بە ناوی ئەوەوە ئەوە داوا کرا بوو .. دوای خوێندنەوەی ئەڵێت : بەڵام من ئەمەم داوا نەکردووە

تکاتان لێ ئەکەم لێی بگەڕێن بەلایەنی کەمەوە با لە قەبرەکەیدا بحەوێتەوە .. کەچیی کاربەدەستەکان لەسەر هەڵوێستی خۆیان سوور بوون و دەریان بڕیی، کە پێویستە کارەکە ئەنجام بدرێت .

دوای ئیمزاکردن لەگەڵ مامۆستا عەبدولمەجیددا بەرەو فرۆکەخانە ئەکەونە رێ و لەوێ فرۆکەیەکی سەربازیی هەڵیان ئەگرێت بۆ ئۆرفە و ، لەوێ لە سەعات(٣) سێی شەودا ئەچن بۆ سەر قەبری مامۆستا نوورسیی .. دوو تابووت و چەند سەربازێك لە حەوشەکەی مزگەوتدا بوون .. پزیشکە سەربازییەکە لە مامۆستا عەبدولمەجید نزیك کەوتەوە و پێی وت :

ـ خەمت نەبێت ، ئەیگوازینەوە بۆ ئەنادۆڵ، مامۆستا دەست بە گریان ئەکات و ، پزیشکەکەش فەرمان بەسەر سەربازەکاندا ئەدات تا قەبرەکە بڕووخێنن، ئەوانیش لە ترسی خوا نەیانئەوێرا لێی بچنە پێش .

پزیشکەکە وتی : ئێمە فەرمانمان بەسەردا دراوە و جگە لە جێبەجێ کردنیش چارەیەکمان نیە، سەربازەکان دەستیان بە ڕووخاندنی قەبرەکە کرد و تابووتەکەیان دەرهێنا کە تابووتەکە ئەکەنەوە ، مامۆستا عەبدولمەجید لە دڵی خۆیدا ئەڵێت : ئێستا ئێسقانی برا خۆشەویستەکەم بوون بە خۆڵ، کەچیی، کە دەست لە کفنەکە ئەدات وەهای بەبیردا دێت، کە مامۆستا دوێنێ مردووە، کفنەکە وەك خۆی مابوویەوە، بەڵام لەلای سەریەوە کەمێك زەرد بوو بوو و ، پەڵەیەکی تەریش لەسەر شێوەی دڵۆپە ئاوێکی پێوە بوو .

کە پزیشکەکە دەم و چاوی مامۆستای لادا ، عەبدولمەجیدی برای سەیری کرد ئەبینیٚ وەك زەردەخەنە بکات وەهایە .. بە باوەش مامۆستا هەڵئەگرن و ئەیخەنە ناو تابووتەکەی ترەوە و ، ئەیبەن بۆ فڕۆکەخانە

شەقامەکان لە خەڵکیی چۆڵ بوون ، کەچیی پر بوون لە سەربازی چەکدار و ، هات و چۆی ناو شاریش قەدەغە کرابوو ..

مامۆستا عەبدولمەجید لەناو فڕۆکەکەدا لە تەنیشت جەنازەکەی مامۆستای برایدا دانیشت و ، خەم و خەفەتیش خەریك بوو جەرگی ببڕێت .. فرمێسکیش لە چاوەکانی بە خور ئەهاتنە خوارەوە

فڕۆکەکە بەرەو ئافیوون ڕۆیشت و ، لەوێوە جەنازەکەیان بە ئوتـومبێلێکی فریاکەوتن گواستەوە بۆ ئیسپارتە و ، لە شوێنێك، کە تا ئێستاش نەزانراوە ، مامۆستایان ناشت .. ( ش / ٤٣٧ ) .

خوای گەورە بە سۆزی بەڵێنشاوی ئاواتی مامۆستا نوورسیی هێنایە دیی تا قەبرەکەی نەبێتە هۆی سەرلێشێوانی هەندێك، ئەوەبوو، کە ئامۆژگاریی قوتابیەکانی کردبوو تا شوێنی قەبرەکەی تەنها یەك دوو قوتابیی بی زانن، جا پرسیاری لیٚ ئەکەن، کە حیکمەتی چیە سەردانی قەبرەکەی یاساغ ئەکات ، لەگەڵ ئەوەدا، کە سەردانی قەبر پاداشتی زۆری هەیە

مامۆستاش وەڵامیان ئەداتەوە، کە لەم چەرخەدا بە هۆی ئەنانیەت و خۆخۆش ویستنەوە غەفڵەت بەسەر دڵەکاندا زاڵ بووە و ، ئەمەش پاڵ بە خەڵکییەوە ئەنێت تا بایەخ بە پایە و پلەی مردووەکە و ناوبانگی بدەن ، هەروەك فیرعەونەکان تەقدیس ئەکران، ئیتر ڕەزامەندیی خوا لەم سەردانەدا لەبیر ئەچوێتەوە، جا مامۆستا ئامۆژگاریی قوتابیەکانی ئەکات، کە شوێنی قەبرەکەی پیشانی کەس

نەدەن ، ، چونکە هەر کەسێك لە هەر شوێنێکی ئەم زەوییەدا بێت و فاتیحەیەك بخوێنێت پاداشتەکەی ئەگات بەو کەسەی، کە بۆی رەوانە ئەکات ..[٣٤٤]

رەحمەتی بە لێشاوی پەروەردگار لەسەر
گیانی مامۆستا نوورسیی و
هەموو ئەوانەی، کە بە ئیخلاصەوە خزمەتی
پەیامەکانی نووریان کردووە

[٣٤٤] ملحق أميرداغ / ٢ ( توركيى ) .

# ناوەرۆك



زانای گەورەی موسڵمانان ، تەفسیرکەری قورئان ، دانەری
پەیامەکانی نوور بدیع الزمان مامۆستا سەعیدی نوورسیی



مامۆستا سەعیدی نوورسیی لە ساڵی 1918 دا لە دیلیی رووسیا خۆی رزگار ئەکات و لەوکاتەدا کە بە ئەڵمانیادا تێ ئەپەڕێ ، لە لایەن ئەڵمانەکانەوە ئەم وێنەیەی گیراوە



مامۆستا نوورسیی لە ساڵی 1952 لە
ئەستەنبووڵ لەسەر مەزاری سوڵتان
موحەممەدی فاتیح خەریکی دوعا کردنە



مامۆستا نوورسیی لە ساڵی 1959 دا ئەچێت بۆ ئانقەرە و ئەم وێنەیەی لە دەرگای ئەو ئوتێلەدا گیراوە کە تیایا ماوەتەوە

# وێنەکان



کەڵە زانا و موجاهیدی ئیمان و قورئان ، بدیع الزمان سەعیدی نوورسیی ،
کە بە تیشکی قورئان صەدەی بیستەمی رووناك کردەوە و ، بوە هۆی بەختەوەر
بوونی ملیۆنەها کەسیش لە دنیاو لە قیامەت دا



مامۆستا نوورسیی و عەبدوڕڕەحمانی برازای لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە ئەستەنبوڵ

# وێنەکان



وێنەی مزگەوتەکەی کۆستڕما لە رووسیا ، کە تا ئێستاش هەر ماوە و ، مامۆستا نوورسییش دوو ساڵ بە دیلیی لەوێ ماوەتەوە



رەحمەتیی ( بایرام یوکسەل ) پەیامەکان ئەخوێنێتەوە



وێنەی ئەو گومەزییەی کە بەسەر گردۆڵکەیەکەوەیە لە شارۆچکەی تیللۆی سەر بە شاری سیعرد ، کە مامۆستا نوورسیی **3** مانگ تیایا ماوەتەوە و . فەرهەنگی ( المحیط ) ی تا پیتی ( سین ) لەبەر کردوە . لێرەدا بووە مامۆستا بۆی دەرکەوتوە کە مێروولە خاوەنی یاسای کۆمارین لە ژیانیان دا ، بۆیە دەنکە ساوەرەکانی ناو شۆرباکەی داوە بە مێروولەکان خۆی نانی گوشیوەتە ناو ئاوی شۆرباکەوە .



شاهێنامەی ( دار الحكمة الاسلامية ) ی دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەخشینی بەرزترین نمرەی زانستیی بە ماموستا نورسیی



ئەم درەختی قەترانەش لەسەر چیای چامە و، پێنج سەعات لە بارلاوە دوورە و ، مامۆستا بۆ بیرکردنەوە چۆتە سەری

# وێنەکان



مامۆستا نوورسیی هەشت ساڵ لە بارلا لەم خانووەدا ماوەتەوە و ئەمەش بە یەکەم قوتابخانەی نووریی لە قەڵەم ئەدرێت و هەندێك لە پەیامەکانیش لەسەر ئەو درەختی سپی چنارە نووسراون و ، شوێنی خواپەرستیی و نزاو پاڕانەوەی بووە



مامۆستا نوورسیی لەسەر چیای چام لەسەر ئەم درەختە ماوەتەوە بۆ ئەنجام دانی خوا پەرستیی و ، مەکتووبەکانی سەرەتایشیی لێرە نووسیوە

# وێنەکان



وێنەی بەندیخانەی ئەسکی شەهر کە مامۆستا تیایا ماوەتەوە ، لەگەڵ
وێنەی قوتابخانە ئامادەییەکەی بەرامبەر بەندیخانە



وێنەی ئەوماڵەی بارلا کە مامۆستا تیایا ماوەتەوە و ، بۆتە
مایەی دەست خستنی ئەنواری قورئانیی و فیوضاتی خوایی



بەڕێز ( مەلا حەمید ئەکینجی ) نموونەی ئیخلاص و شەفەقەت و تەوازوع بوو کە
خزمەتی مامۆستا بدیع الزمان ی بە دڵسۆزانەوە کردووە لە ئەشکەوتی کێوی ئەرەك و
هەم لە مزگەوتی نورشینی وان دا . بیرەوەرییە پڕ لە پەندەکانیشی لە کتێبی
( چەند چەمکێ بیرەوەریی سەبارەت بە مامۆستا سەعیدی نوورسیی / چەمکی یەکەم )
دا تۆمار کراون



هەندێ قوتابی مامۆستا لە بارلادا و لە بەردەم ماڵەکەی
مامۆستا نوورسیی و لە پەنای سپی چنارە مبارەکەکەدا .

# وێنەکان



حاجی حافیز محمد ئاقشار خەڵکی گوندی ( ساو ) ی قەزای ( ئسپارتە )یە و، لە ساڵی **1947** ەوە تا وەفات کردنی خزمەتی پەیامەکانی نووری کردووە و ئەو زاتەیە کە توانی پەیامەکان بە ڕێنووسی عەرەبی ( بە پەنهانیی ) بە هەزار کەسی ئەو گوندە بنوسێتەوە



بەڕێز ( محمد طاهيري موتڵو ) کە بۆ ماوەی 42 ساڵ و تا دوا هەناسەی برایەکی ڕاستگۆ و خالیص و فیداکاری خزمەتی پەیامەکانی نوور و مامۆستا نوورسیی کردووە

# وێنەکان



برای بەڕێزمان ( خلوصی یەحیاگیل ) کە قارەمانی ئیخلاص و هەمیشە لە چینی پێشەوەی قوتابی یە دڵسۆزەکانی مامۆستا نوورسیی بوود و ، مامۆستاش هەردەم بە واریسی ڕاستەقینەم گفتوگۆی لەگەڵ کردووە و ، بە پرسیارە ئیمانیەکانی کە لە پاش خوێندنەوەی کتێبی ( وتەکان ) بوونە گەڵاڵەی دروست بوونی مەکتوبات .



ڕەئفەت بارووتچی قوتابییەکی ڕاستگۆ و جیددیی و صەمیمیی مامۆستا بدیع الزمان بووە و بە هۆی پرسیارە زانستییەکانەوە هەندێ پەیام نوسراون و ، لە بەندیخانەکانی ئەسکی شەهر و دەنیزلیی و ئافیۆن دا لەگەڵ مامۆستا دا پێکەوە بەند بوون و نووسەرەوەی پێشینی پەیامەکان و قوتابییە کەمینەکانە.



سێ قوتابی مامۆستا کە لە بەندیخانەدا ئەم وێنەیان بۆ یادگاریی گرتووە و

ئەوانیش لە راستەوە مصطفى قولی ئونلو ، محمد طاهیری موتلو ،

(حافیظ عەلیی خەڵکی ئیسماعیل کۆی ) کە لە ساڵی 1944 دا

لە بەندیخانەی دەنیزلی لە بری مامۆستا دەرمان خوارد کراو شەهید بوو



سالی 1958 ز لە ( ئیزمیر ) مەحکەمەی سزای گەورە و قورس دەربارەی پەیامەکانی نوور هەندێ قوتابیی نوور لە قەفەزدان و هەندێکیش لە دەرەوە



محمد فەیزی پەموکچی هەشت ساڵ خزمەتی مامۆستای کردووە و دەرسی لێ وەرگرتوە و بەو فەیزانەی کە لە مامۆستای وەرگرتبوون لە زانستی مەعاریف دا گەشەی کردووە و بە هۆی تەقوا و خواپەرستیی و چاکسازیی و فیداکاریی و فەراسەتیەوە کەسێتیەکی نایاب و دەگمەنی لێ پەیدا بووە . لە بەندیخانەکانی دەنیزلیی و ئافیۆن دا لەگەڵ مامۆستادا پێکەوە بوون و ئەشکەنجەیان چەشتوە و ، تا ساڵی 1990 یش ماڵەکەی خۆی هەڵبژاردووە بۆ پەخش کردنی نوور و فیوزاتەکان

# وێنەکان



ئەم وێنەیە لە ساڵی **1958** ز گیراوە کە هەندێ قوتابیی نوور و پارێزەرەکانیان پێکەوە لە کاتی دەرچوونیان لە بەندیخانەی ئەنقەرەدا



هەندێ قوتابیی نوور کە بە هۆی پەیامەکانی نوورەوە لە دادگای قۆنیا لەگەڵ پارێزەرەکانیان دا پێکەوە دەرئەچن .



مامۆستا ( سەعید ئۆزدەمیر ) بەهۆی بڵاوکردنەوەی
پەیامەکانی نوورەوە لە مەدرەسەی یوسفیەی ئەنقەرەدا -



بەهۆی پەیامەکانی نوورەوە ، هەردوو مامۆستا ( مصطفی
صونگور و سەعید ئۆزدەمیر ) کە پێکەوە کەلەپچە کراون
لە بەندیخانەی ( میرسین ) ەوە بەرەو دادگا ئەبرێن .



مامۆستا نوورسیی لە دوا کاتەکانی ژیانی دا تا وەفات کردنی ئەم قارەمانانەی نوور بە راستگۆیی و فیداکاریی و ئیخلاصەوە خزمەتیان کردووە ، ئەمانیش لە راستەوە :

( مصطفی صونگور ، عبدالله یەگن ، بایرام یوکسەل ،حسنی بایرام )

## وێنەکان



ئەم ئۆتۆمبیلی شۆفرلێتە لە ساڵی **1953** ز یەوە لە لایەن قوتابیەکانەوە بۆ مامۆستا نوورسیی دابین کراوە و ، لەو کاتەوە شارەکانی ئسپارتە و ئەمیرداغ و ئەسکی شەهر و ئەستەنبوڵ و دوا مەترلیشی کە ئورفەیە پێی گەڕاوە و ، بۆ هەر شوێنێکیش کە پێی ڕۆشتووە کرێی داوە ز دوای وەفاتیشی تەسلیمی مامۆستا سعید ئۆزدەمیر کراوە و ، ئەم ئۆتۆمبیلە لە ئەنقەرە تا **34** ساڵ لە خزمەتی بڵاوکردنەوەی نووردا بووە



مامۆستا ( عبدالله یەگن ) سەرقاڵی خزمەتە .

# وێنەکان



کاك ( زوبێر گیونوزوزالپ ) کە لە دوا کاتەکانی ژیانی مامۆستادا
تا دوا هەناسەی لە خزمەتی دا بوون و ، زاتێکی گەورە و چەسپاو و
بە غیرەت و نموونەی وەفا و ئیخلاص و فیداکاریی بووە . تا ساڵی
1967 کە وەفاتی کردووە سەرپەرشتیاری قوتابیانی نووری کردووە



لە ڕاستەوە ( مصطفی صونگور ، طاهیري موتلو ، عبداللە یەگن ) کە تا کۆتایی ژیانی مامۆستا نوورسیی بە ڕاستیی لە خزمەتی دا بوون و ، خەریکی خوێندنەوەی پەیامەکانی نوور بوون



لە 23 ی مارتی 1960 دا مامۆستا نووری لە ئۆرفە وەفاتی کردو ئەم قەبرەیان لە مەڕمەڕ بۆ دروست کرد .. ( 111 ) ڕۆژ تیای دابوو ، پاشان حکوومەت کوردەکانی بەسەردا کراو ، ئەم قەبرە تێك دراو ، تەرمی مامۆستاش بە یارمەتی ( مامۆستا عبدالمجید )ی برای بەرەو شوێنێکی نەزانراو برا .. ئیدی لەوێ ئەسپەردە کرا لە لایەن چەند قوتابییەکی تایبەتیی مامۆستاوە کە ئەمەش تەوافوقی ئەو وەسیەتەی خۆی بوو ( هەزاران ڕەحمەتی خوای لێ بێ )



کورتە ژیانی پاڵەوانێکی نوێخوازیی ئەم سەردەمەی ئیسلامە، کە سەراپای تەمەنی لە خواپەرستیی و خزمەتی ئیسلام دا بەسەر بردووە، تا دڵەکەی زاخاو بدات و ، لە ئەنجامدا بگاتە بیر و نەخشەیەکی ناوازە بۆ خزمەت کردن و تێگەیاندنی موسڵمانانی چەرخی نوێ ، بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی رەببانیی لە دینی خوا بگەن و ، بشتوانن بە راستیی خزمەتی بکەن و ، بە بانگەوازی دڵسۆزیی و خۆشەویستیی ، بە کۆمەکیی خوا ، مرۆڤایەتیی سەرفرازی هەردوو جیهان ببێت .


کتێبخانەی سۆز
کتێبخانەی سۆز
نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
Designer